پەیامەکانی گەنجان
47

زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان 11

# فیکری عەلمانی

## لە نێوان واقیعی بوون و خەیاڵدا





ئامادەکردنی : ناوەندی ڕێنوێن



پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان 

# فیکری عەلمانیەت

## لە نێوان واقعی بوون و خەیاڵدا

ئامادەکردنی : ناوەندی ڕێنوێن

١٤٣٧ کۆچی ـــــــــــ ٢٠١٦ زاینی

ناسنامەی کتێب

📖 ناوی کتێب: فیکری عەلمانیەت لە نێوان واقعی بوون و خەیاڵدا

✍ نوسینی : کۆمەڵێك نووسەر

✏ ئامادەکردنی : ناوەندی ڕێنوێن

* ناوی زنجیرە: زنجیرەی فیکری ( ژمارە: ١١ )

* تیراژ : ١٠٠٠دانە

* نۆبەی چاپ: یەکەم

* ساڵی چاپ: ٢٠١٦

* ژمارەی لاپەڕە : ٤١٩ لاپەڕە

* دیزاین : گۆڤاری ڕێنوێن

* نرخ تەنها : ( ٦٠٠٠ ) هەزار دینار

* سەرپەرشتیکار : سەرکۆ کریم احمد

* ئیمەیل: renwen٢٠٠٩@yahoo.com

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٣٩)ی
ساڵی ٢٠١٦ ی پێدراوە

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

## خوێنەرانی بەڕێز !

ئەم كتێبەی بەردەستتان كۆكراوەی چەند وتارێكە لە ژمارەی (٦)ی گۆڤاری ڕێنوێندا، بڵاوكراوەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵكێكی زۆر پەیوەندییان پێوەكردین كە ئەو وتارانە لە دووتوێی كتێبێكدا بڵاو بكەینەوە بۆ سود گەیاندنی زیاتری گەنجان و ڕۆشنبیران، ئێمەش داواكەمان پەسەند كردن و بەباشیشمان زانی كە بۆ زیاتر دەوڵەمەند كردنی بابەتەكە چەند نوسەر و ڕۆشنبیری زیاتر بەشدار بكەین، بۆیە پەیوەندیمان بە چەند كەسانی تری بەڕێزەوە كرد ئەوانیش ماڵیان ئاوەدان بێت هاتن بە دەممانەوە نوسینەكە بوو بەم وتارانە:

* عەلمانیەتی ڕۆژهەڵات و حیزبی كوردی نوسینی / پ.ی. سەلام ناوخۆش

* ئەزمونی عەلمانیەت لە كوردستان چاوپێكەوتن / م. فاتیح سەنگاوی

* عەلمانیەت ئەوەی من لێی تێگەیشتووم نوسینی / كامەران بابا ن زادە

* ئەوەی یەکەمی عەلمانی کورد  نوسینی / مسعود عبدالخالق

* چۆنیەتی خوێندنەوەی خوێنەرێکی سیکۆلار بۆ دەقی ئایینی ئامادەکردنی / عبدالله نصرالله

بۆشاییەکانی نێوان عەلمانیەت و کۆمەڵگای کوردەواریی  نوسینی / د. عومەر عەلی

* جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت جیاکردنەوەی بەهایە لە مرۆڤ. نوسینی / زانا طاهیر

* عەلمانیەت چەمك و سەرهەڵدان و گەشەسەندنی و هاتنی بۆ ڕۆژهەڵات. نوسینی / مونا موحەممەد بەهیەدینی شافعی، وەرگێڕانی / نیهاد جلال حبیب الله

* عەلمانیەت بۆ چون و هەڵوێستی بەرامبەر بە ئیسلام و موسوڵمانان نوسینی / م. محمد ملا محمود

* نوسەرانی عەلمانی چی دەخوێننەوە ؟  نوسینی / إسماعیل طه ها

بۆ زانیاری خوێنەرانی بەڕێزیش ئێمە وەك ڕێبازی کارکدنمان لە ڕێنوێن هەر دەم بە پێویستمان زانیەوە لە هەموو ڕەوتە ئیسلامییەکان بەشداربن لەم نوسینەدا، بەڵام پاش ئەوەی زیاتر لە

(٤) مانگ چاوەڕێی نوسینی بەڕێز (د. عبد الطيف احمد ) بووین، پێیان وتین مەجالی نابێت بنوسێت بۆیە بە شێوازی گفتوگۆ پرسیاری ئاراستە بکەن، دوایی ئەوەی پرسیارەکانمان بۆ بەڕێزیان نارد، دوای چاوەڕوانی (٢ )مانگی تر هەر وەڵامیان نەبوو، بۆیە وەڵامی ئەو لە ڕیزی وەڵامی ئەم نوسەرە بەڕێزانەدا نابینین !

چەمکی عەلمانییەت و دەرهاویشتەکانی شتی زۆری دەربارەی وتراوە، بەڵام تا ئێستاش پێویستی بەوە ماوە کە بەرچاو ڕۆشنی زۆرتر بدرێت لەسەری و واقعی ڕەوتە عەلمانییەکانی کوردستان زیاتر ڕوون بکرێتەوە، لەبەر ئەوە هێشتا کەسانێك هەن نەیانتوانیوە خۆیان و قسە و نوسین و هەڵسوکەتەکانیان ڕزگار بکەن لە توندڕەوی، تا ئێستاش هەیە لە ناو ڕۆشنبیرە عەلمانییەکان ڕۆشنبیرە ئیسلامییەکانیشدا بە هەناسەی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکان ڕاگەیاندن ئەدات، بێ ئاگا لەوەی بەڕاستی بۆ مێژووش بیڵێین کە، چ ڕەوتی ئیسلامی و چ ڕەوتی عەلمانی لە کوردستاندا گۆڕانکاری زۆریان بەسەردا هاتووە و لە هاوبەشە ئینسانییەکان زۆر نزیك بوونەتەوە، ڕاستە هەشتاکان ڕەوتی عەلمانی لە بازنەی

بیرکردنەوەیدا هیچ پانتاییەك نەبوو بۆ ئیسلام وەك فیکر و وەك ڕەوت وەك تەشکیلاتیش، ڕەوتە ئیسلامییەکانیش هەمان دید و ڕوانینیان بۆ ڕەوتە عەلمانییەکان هەبوو، بەڵام هەم ئەمان و هەم ئەوانیش لەو توندڕەویـــە ڕزگارییـــان بـــووە بەڕێـــژەیکی بەرچـــاو، ئەمـــەش گۆڕانکارییـەکی ئیجابی و سوودە بۆ کۆمەڵی کوردەواری بۆ ڕەوتـی بونیاد نانەوەی ئینسانی کورد و پەرژین کردنی ئاشتی کۆمەڵایەتی.. ئیتر بوونی هەندێ توندڕەو لەملا یان لەولا زۆر مەترسی نیە ئەگەر ئەم گۆڕانکاری و گەشە سەندنە بەردەوام بێت..

ئومێد ئەکەین ئەم نوسینەی ئێمەش بەشداری کردنێك بێت بۆ ئەو مەبەستە و بەشێك لە شەرەفی پاراستنی ئاشتی کۆمەڵایەتی و گەشەی فیکری شارستانی لە ناو میلەتەکەماندا بە ئێمەش ببڕێت..

دەستەی چاپ و پەخشی کتێبەکانی ڕێنوێن

٢٠١٦/٢/٢١



# عەلمانیەتی ڕۆژهەڵاتی و حزبی کوردی

نووسینی: پ.ی.سەلام ناوخۆش



## دەروازەیەك

ناونیشـانی وشـەی (عەلمانیـەت)م بـەکارهێنا بـۆ ئـەوەی خوێنـەر بزانـێ لـە چـی دەدوێـم، ئەگـەر نـا ئـەو وشـەیە بەقـەد بزافێکـی شـێوێنەر پـڕ دیمـاگۆژی، دۆگماکـانی عەلمانیـەت دەشـارێتەوە! بـە واتـای وشـەکە، چەمکەکە بـە ڕونـی دەرنـابڕێ دەبێتە ناوەندێك و هەتا هزرو ئایدۆلۆژیاو فەلسەفەیەك چەندەها تەئویلی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ هەڵبگرێ.

هەرچـی ( secularism )ی ئینگلیزیـە و( luicism )ی فەرەنسی یە ئەو شێواندنەی تێدا نیە، بۆ من لەم نوسینەدا زیاتر ئەو دووە بەکار دەهێنم نەك عەلمانیەت!

لـە لایـەکی تـرەوە، هـەروەك ناونیشـانەکە پێشـنیاز دەکـات پـێم خۆشـە لـە بنـەمای عەلمانیـەتی ڕۆژهـەڵاتی بـدوێم و بـە حکـومی ئـەوەی حزبـی کـوردیش هـەر لەسـەر بنـەماکانی ئـەو جـۆرە عەلمانیەتـە دامـەزراوە و ڕوئیـاو پەیامیشـی هـەر زیـاتر کـۆپی ودرێژەپێدەری ئەوانە، لەم بوارەش، کە قسەی لەسەر کراوە بۆیە نوسینەکە لەم چوارچێوەیە دەرناچێ و ڕووبەرەکەی هەرئەوەندە دەبێ نەك شامیل و هەمەلایەن بێ.

## عەلمانیەت و ئاریشەی زاراوە لە ڕۆژهەلاتدا

ڕۆشـەنبیرو حزبـی ڕۆژهـەلاتی کێشـەی ناسـنامە یـەکێ لـە ئـەدگارە بنەڕەتییـەکانی (ئـەو) ناتوانـێ لـە (نیفـاقی سیاسـی) (نیفاقی کۆمەلایەتی) و (نیفاقی ئاینی) نەژی، چونکە (مانەوەی) و (هەبونی) وابەستەی ئەو حاڵەتەن! ڕونتر ڕاشکاوانە تر بیێژین، ئـەو خوێنـدەوار و قەڵەمبەدەسـت و شـەهادەدارانەی ڕۆژهـەلات ئەوانەی دەیانەوێ لە دەرەوەی هەژمونی دین و دونیا وڕوئیای دین بە تایبەتی ئیسلام بژین هەر (دەنگ) یان دێ و (جورئەت) ناکـەن تـەواو ئەوفەلسـەفە سیاسـیە، یـان تـا بـۆ ئایدۆلـژیا نادینیەکەی باوەڕیان پێ یە بە دروستی گوزارشتی لێبکەن.

ڕۆژئاواییەك دەڵێ: ئەوانە وەك بۆق وان هەر (قیڕەیـان) دێـت، هەرکە لێیان نزیك دەبیەوە بۆ ئەوەی بزانـی چـی یـان دەوێ (بـێ دەنگ) دەبن.

هـەر لەسـەر ئـەو شەنکسـت و بنەمایانـە هـەموو هـزرو ئایـدۆلۆژیاو فەلسـەفەیەکی سیاسـی ڕۆژئـاوای بـە (لـێڵ)ی لـە ڕۆژهەلات قسەی لە سەر کراوە.

دیتن و تێڕوانینـی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا وەك یـەك نـەکارێکی ئەکادیمیە نە ڕوئیایەکی دروستە، چونکە ئەو (دووە) لەلایـەن تیۆرداڕێژەرانی ڕۆژئاواوە وا (وێنا) کراون دەبێ هەر لە ململانێ دابن!

بۆ ئـەوەی لـە چوارچێوەی ناونیشانەکەوە دەرنەچین با لـە سیکۆلاریزم بدوێین. لـە ڕۆژئـاوادا بەڕاشـکاوەی لـە ڕوی زاراوەو چەمك و زمانەوانیەوە دان بەوە دەنێن، کـە سـیکۆلاریزم بزافێکـی نـا دینیـە . فەرهـەنگی ئۆکسـفۆرد وشـەی ( secuiav ) ئـاوا ڕاڤـە دەکـات: دنیـایی، مـادی، نائـاینی، حکومـەتی دژ بەکەنیسـە.. نابێ ئاینیش بنەمای ڕەوشت و پەروەدە بێ، هەروەها لە (Brifsh Brifunica_ Encyclopedia ) دەربـارەی سـیکۆلاریزم ئـەوها هـاتوە: بزافێکـی جڤاکیـە ئامـانجی گـۆڕینی ڕەوتـی بایەخـدانی خەڵکە لە بایەخدان بە (ئاخیرەت وقیامەت) بۆ بایەخدان بـە دنیـا لـەوێ (دیـن) و (پیـاوی دیـن) و (هـەژمونی دیـن) و (پەیوەنـدی پیاوانی دین) و (دەسەڵاتی سیاسـی) وڵات گـەورە تـرین هەڕەشـە

بـون لـە زات و ڕوئیـاو هـزری مرۆڤـەوە ـ لـەوێ کۆمـەڵێك وەك هۆکاری هزری و سیاسی و شارستانی و کۆمەڵایەتی و ئابوری هـەبون بـۆ ئـەوەی زانـاو ڕۆنـاکبیرو سیاسـەتمەدارانی ڕۆژئـاوا پشــت لــە کەنیســە بکــەن و حکومــەت لــە بونیــاتی نــادینی دامەزرێنن!

بێگومان ئەو هۆکارانە لە ڕۆژهـەڵات دەرنەکەوتون بـۆ ئـەوەی لـە ڕۆژهـەڵات شۆڕشێکی سیکۆلاریزم بەرپابکرێ. ئەمـە وەنـەبێ ڕای کەسانی دەرەوەی بازنەی سیکۆلاریزم بێ، بەڵکو هەتا لە ناو توێژەرانی ئەو بوارەش ڕایەکی ئەوها هەیە، پڕە لە ئامـاژە بـەڕای علی حەرب و محمدئەرکۆن و حەسەن حەنەفی دەکەین ئەو سێ یە باوەڕیـان وایـە بنـەماکانی سیکۆلاریزم لـە ئیسـلام دا هـەن، علـی حەرب لە (نقدالحقیقە) بانگەشەی ئەوە دەکات، کە لـە سـەردەمی دەوڵـەتی مەدینـەوە بنـەماکانی (عـەلمانی) لـە گوتـاری ئیسـلامی دەرکەوتون ئیسلام هەڵگری کۆمەڵێك واتاو دەلەلاتی جیاوازە لـە هەناوی خۆشیدا شتێك لە عەلمانیەتی هەڵگرتووە.

محمد ئەرکۆن هەوڵی دەدا لە دەقە پیرۆزەکاندا هەندێ ئەفکارو سیما بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی ڕاڤەو تەئویلێکی (عەلمانیبونی) ئیسلامی پێ بکات ئەرەگۆن لە (الفكر الإسلامی قراءة علمية) دەڵێت: عەلمانیەت لە هەناوی قورئان و ئەزمونی مەدینەدا بونی هەیە، هەروەها دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی دەوڵەتی عەلمانی بوون نەك ئاینی، لە لایەکی تر بە حکومی ئەوەی هزری ئیسلامی و شەریعەت و فقه زادەی بیرکردنەوەو خوێندەنەوەی و تێڕوانینی مرۆڤن بۆ هەردوو دەقی قورئان و فەرموودە، بۆیە مرۆڤ بەشدارە لە شرۆڤەکردنی و بڕیاردان. هەروەها هەر چوار مەزهەبی سونی بەڵگەن لە یاساغ نەکردنی عەقڵی مرۆڤ لە خوێندنەوە و تێگەیشتنی دەق و تیۆری قیاس( Anulogg ) بۆ دەرەوەی دەق..

ئەوانە توێژەرێکی وەك حەسەن حەنەفیانی والێکردوە لە کتێبی (الإسلام لا يحتاج علمانية غربية) بنوسێ شەریعەتی ئیسلامی شەریعەتێکی وەزعیەو لە سەربنەمای بەدیهێنانی

بەرژەوەندیە گشتیەكان، كە تایبەتمەندی شەریعەتن: (زەرورات، حاجیات، تەحسینات) دامەزراوە عەلمانیەكانیش بۆ بەرجەستە كردنی ئەمانە كاردەكەن، بەڵام لە شارستانیەتی خۆرئاوای وەردەگرن نەك شەریعەتی ئیسلامی.

ئەم جۆرە تێڕوانینە بۆ هەبونی بنەماكانی سیكۆلاریزم لە قورئان و ئەزمونی ئیسلامدا خۆی لەخویدا نیفاقێكی سیاسیە، چونكە ئیسلام دین و دونیایە، حوكمی ئیسلامی حوكمێكی دینی كەهنوتی نیەو هیچ حوكمڕانێك (پیرۆز) نیە دنیاو بەشەكانی دونیا لە دین جودا ناكرێنەوە و ئەو (دونیا) ی لە قورئاندا وێناكراوە ئەو (دنیا)یەی سیكۆلاریزم نیە، لەم ڕوانگەوە هەر لێڵی و نیفاقەكەی ڕۆشەنبیری نادینی ڕۆژهەڵاتی دەردەكەوێ، كە دەیەوێ لە هەردوو (بەر) بخوات.

هەروەك چۆن هەمو (عەلمانیەكانی) ڕۆژئاوا وەك یەك نین، ئەوانەی ڕۆژهەڵاتیش هەروان، بەڵام ئەوەندە هەیە، ئەو عەلمانیەتە ( pavtial secularism ) و عەلمانیەكان

هەموویان: ( Total secularism ) لەگەڵ حکومەتەکانی ڕۆژئاوا لەسەر بنەمایەکی فەلسەفی و پێکهاتەی تەکنیکی و کەلتوری و ئاینیەوە دارێژراوە، هەرچی ئەوەی ڕۆژهەلاتە لەسەر بنەمای نیفاقی سیاسی (politicalHyqecracg ) و هەلپەرستی ( opparfunifg ) دامەزراوە.

## حزبی کوردی و ئەزمونی سیکۆلارزمی

بیرۆکەی حیزب دروستکردن، بیرۆکەیەکی ڕۆژئاواییە، ئامانجی سەرەکی ئەو دیاردەیە هەوڵدانێك بوە بۆ ئەوەی ڕۆژئاوا لە ڕێگایەکی ترەوە هەژمونی بەسەر ڕۆژهەلاتەوە هەبێ، کورد زیاتر لە ئەزمونی حیزب دروست کردندا زیاتر هەر لاسایی ئەزمونی نەتەوە بالاکانی کردۆتەوە.

یەکەم بەشداری چالاکی کوردی لە حیزبی نەتەوەیی دا بووە، گروپی ئیتحادو تەرەقی و گەنجە تورکەکان چەند کوردێکی وەك: عبدالله جەودەت، ئیسحاق سکوتلی ناویان دێت.

دکتۆر عبدالله جەودەت یەکێ لەو کوردە بەرایانەی ناو کاری حیزبی عەلمانیە، کە تەواو لە ژێر کاریگەری ئەژمونی ڕۆژئاواو مارکسیەتدا بووە لە باکوری کوردستان ئەو دەرفەتە لە

بەردەم کەسانی وەك دکتۆر عبداللە جەردەت دروست نەبو، کە بتوانێ پەرە بە هزرو ئایدۆلۆژیایی عەلمانیەت بدات.

ئەو حزبە کوردیانەی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لە باکور دروست بوون، وەك جەمعیەتی تەعالی کوردستان، پارتی دیموکراتی کورد، کۆمەڵەی ئازادی، کۆمەڵەی خۆیبون خاوەن فەلسەفەیەکی سیاسی ڕوون نەبون، ڕاستە ئەوانە (ئاینی) نەبون، بەڵام (عەلمانی)یش نەبوون هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵ و هەژمونی سەرکردە کلاسیکەکان و بنەماڵە دیارەکانی نێو بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی!

## دامەزراندنی حزبی شیوعی عێراقی

سەرەتای دروستبونی بیرۆکەی عەلمانیەت بوو لە کوردستان پێش دروستبونی پارتی دیموکراتی کورد لە ساڵی ١٩٤٦، زۆربەی سیاسەتمەدارانی کورد (شیوعی) بوون جا چ شیوعی ناو شۆڕش، حزبی ڕزگاری بووبن.

شیوعیەت لە دوای دروستبونی پارتی بە ئاڕاستەیەکی تردا چوو، چونکە بە شێکی زۆر لە شیوعیە کوردەکانی ناو حزبی شیوعی و (شۆڕش) و(ڕزگاری) بوونە پارتی!!

ئەمەو وەنەبێ ئەو شیوعیانە دەست بەرداری مارکسیەت بوبن، بەڵکو ئەوانە لە بەر ڕۆشنای مارکسیەت، خەریکی کوردایەتی بوون.

بزاڤی (شیوعیەت) و (مارکسیەت) هەتا دروست بوونی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی) لە ساڵی ١٩٧٠ نەیتوانی بەسەر مۆڵکی دینداری کۆمەڵی کوردەواری زاڵ بن، هەر لەم ڕوانگەوە شیوعیەت لە کوردستان زیاتر مۆرکێکی سیاسی وەرگرتوە نەك ئایدۆلۆژی، هەروەها کادیری شیوعی خاوەن ڕوئیایەکی دیار نەبون، هەموو شیوعیەکان زیاتر بە ململانێی چینایەتی نێوان (ئاغا)و (کرمانج) کورت کردۆتەوە. شوعیەت خۆی لە خۆیدا عەلمانیەتێکی ئیلحادیەو پرسی ئیلحادیەکەش لەسەر چەند بنەمایەکی مەتریالی بینا کردووە وەك دەڵێت:" لاإلە والحیاة مادة" هیچ خودایەك نییەو ژیان مادەیە، بەڵام زۆرێك لە شیوعی

کلاسیکی کوردی نەك هەر ئیلحادی نییە، بەڵکو پەیوەستە بە زۆرێك لە پایەکانی ئیسلام! ئەو ئیزدیواجیەتە هۆکارێك بوو بۆ مردنـــی شـــیوعیەت وەك فەلســـەفەیەکی سیاســـی یـــان ئایدۆلۆژیایـەکی سیاسـی. هەرچـەند پیـاوانی ئینگلیـز نـاو و ناتۆرەی "مەلای سور" یان لە مەلامستەفا دەنا، ئەو دەسەڵاتەی بارزانی لە بڕیاری سیاسی پارتی دا، مەکتەبی سیاسی پارتی– کە زۆربەی مارکسی بوون– ناچارکرد گەورەترین هەڵەی سیاسی و خیانەتی نەتەوەیی لەمێژووی سیاسی کوردی تۆمار بکەن.

لـە نـاو دەسـەڵاتی ڕژێمـی عێـراقیش لـە ڕێگـای گۆڤـاری (ڕزگـاری) و ڕۆژنامـەی (النـور) هـەر خـەریکی بڵاوکردنـەوەی مارکسـیەت و بزاڤـی (ماوی) بـوون. بەشـێك لـەو گروپـە بەوەنـدە چالاکیە هزریە ڕازی نەبوون، بۆیە کۆمەڵەی مارکسی لینینی یان دامەزرانـد. ئەوانـە وەك شـیوعیەکانی نـاو حیزبـی شـیوعی، شۆڕش، ڕزگاری و پارتی نەبوون خاوەن فەلسەفەیەکی ئیلحادی بـوون باوەڕیـان بـە عەلمانیەتیـەکی تـەواو هـەبوو، ئەوانـە هـەتا

هەرەسی ۱۹۷۵، بوونێكی ئەو تۆیان نەبوو هەروەها لەلایەن خەڵك و شۆڕشی كوردییەوە بە بەشێك لەمەكتەبی سیاسی پارتی: جەلالی دادەنران بۆیە هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و پارچە پارچە بوونی پارتی دەرفەتی زێڕینی بۆ خۆشكردن بۆ ئەوەی ئاراستەی سیاسی شۆڕشی كوردی بەئاقارێكی تردا ببەن.

كۆمەڵەی ماركسی لینینی، لەساڵی ۱۹۷۳- ەوە لەڕێگای بلاّوكراوەی (ئالأی سوور)ەوە ئایدۆلۆژیای سیاسی خۆیان بلاّو دەكردەوە. ئەوان لە ڕێگای جەلال تاڵەبانی یەوە تەبەننی ئایدۆلۆژیای سیاسی ماوتسی تۆنگ یان كرد. ئەندامە چالاكەكانی یان سەركردەكانی، جگە لە تاڵەبانی باوەڕیان بە ئایدۆلۆژیای سیاسی هەردوو باڵی پارتی و هەردوو باڵی حیزبی شیوعی عێراقی نەبوو.

كۆمەڵە، هەر لە ناوەكەی دەردەكەوێ كە پەیڕەوی ئایدۆلۆژیایەكی توندی دەكرد تەواو لە سەر باوەڕی ئیلحادی دەمەزرابوو. لەپاش هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و مانەوەی حیزبی

شیوعی عێراقی لەناو بەرەی بەعس، دەرفەتێکی تر درووست بوو ئەو کۆمەڵەیە لەسەر هەرسێ بنەماکەی حیزبەکەی ماوتسی تۆنگ: حیزبی پێشڕەو، حیزبی گەل، بەرەی نیشتیمانی، جاڕی شۆڕشی خۆیان بدەن: لەبارەی بلاوکردنەوەی بیرۆکەی چەپ و عەلمانیەتی ئیلحادی هیچ ڕێکخراوێکی عەلمانی کوردی بەقەد کۆمەڵەی نەکردووە. لەبەرایی، ئەوانەی لەمارکس، مارکسی تر بوون، لەتووندی لە (ستالین) و (لینین) توندتر بوون بەرامبەر دژەکانیان.

هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و ماڵوێرانی و نەهامەتی و پاشاگەردانی و داڕووخانی کەسایەتی کوردی بوونە فاکتەرێکی ستراتیژی بۆئەوەی کۆمەڵە زەبری خۆی لە کەسایەتی بارزانی و هەژموونی ئاینی لەناو شۆڕشی کوردی بدات!

بەحوکمی ئەوەی لە حەفتاکان بە بارزانی دەوترا مەلا مستەفاو هەروەها بەرپاسپاردەی ئەو یەکێتی زانایانی ئیسلامی کوردستانی درووست ببوو و لە نەزەر کۆمەڵەش، مارکس وتەنی: "دین ئەفیونی- تریاکی گەلانە" بۆیە هەر هۆکاری

شکستی شۆڕشی ئەیلولیان نە دەدایە پاڵ، کە هیچ بنەمایەکی نەبوو. جارێ خۆی مەلا مستەفا مەلایەتی نەکردووە، بەڵام لە بنەماڵەیەکی ئاینی یاخود مەزهەبی پێگەیشتبوو. ئەویان بە هۆکارێك دادەنا بۆئەوەی ڕەخنە هەتا لە ترادسیۆنی دین بگرن. لەهەشتاکان، مارکسیەکی برادەرم، کە تەواو بەبێ ئاگا لەژێر کاریگەری__ گوتویەتی ئەو ڕەوتە عەلمانییە بۆی گێڕامەوە، کە پاش ئەوەی بارزانی (دە)ساڵ لە سۆڤیەت، لینین بە دزی دەچێتە سەردانی، دەبینێ بارزانی خەریکی قورئان خوێندنەوەیە، لینین پێی دەڵێ: ئەوە دە ساڵە لە سەنتەری شیوعیەت دەژی هێشتا قورئان دەخوێنیتەوە؟!

ئەوەی شارەزای مێژووی چوونی بارزانی بۆ سۆڤیەت و ژیاننامەی سەرانی سۆڤیەت نەبێ مەسەلەکە ئەوەندە گرنگ نابینێ، وادەزانێ لینین قەبوڵی ئەو ڕەوشەی نەکردووە!

بارزانی خۆی لە ١٩٤٧/٦/١٨ لە ئاوی ئاراس پەڕییەوە و (لینین) لە ساڵی ١٩٢٤مردووە!! لە ساڵی ١٩٥٧ نەك لینین بەڵکو

(جۆزێف ستالین)یش لە ژیاندا نەمابوو، ستالین لە ساڵی ١٩٥٣مرد!!

عەلمانیەتی کۆمەڵە سەرەتایەکی لە ڕەوتی عەلمانیەتی مارکسی – ئیلحادی لە کوردستان درووست کرد کە بە هیچ جۆرێ بەراورد ناکرێ بەو عەلمانیەتەی شیوعیەکانی کوردستان کاریان لەسەر دەکرد. سیکۆلاریزم لەناو بزاڤی مارکسیەتدا هۆکارێك بووە بۆ چەندەها ئینشیقاقی سیاسی. هەرخودی کۆمەڵە لەژێر کاریگەری مارکسیەتی ماویی دا دوو جار تووشی جیابوونەوەی سیاسی بووە. جاری یەکەم، فازلی مەلا محمود یەکێ لە سێ دامەزرێنەرەکەی کۆمەڵە– دووەکەی تر شەهابی شێخ نووری و فەرەیدون عبدالقادر بوون– و فوئاد قەرەداغی لەسەر پەسەند کردنی "عێراقچێتی" لەسەرکردایەتی دەرکران و لە هەشتاکانیش جارێکی تر مەسەلەی "عێراقچێتی" و کوردستانچێتی کۆمەڵەی بۆ دووباڵی نەوشێروان و مەلابەختیار دابەشکرد!!

عەلمانیەتی مارکسی وەك پەتایەك بەر بووە گیانی حیزبی کوردییەوە بەجۆرێ زۆربەی جیابوونەوەکان لەسەر ئەو بنەمایە: جیابوونـــەوەی پـــارتی گـــەل لـــە پـــارتی، جیابوونـــەوەی زەحمەتکێشـــان لـــە شۆسیالســـت و جیابوونـــەوەی شـــیوعیە کوردستانییەکان – پارتی کار– لەحیزبی شیوعی عێراق!! ئەو کەلتورە حیزبەکانی ڕۆژهەڵات و باکوری کوردستانیشی گرتەوە. لـــە هەمووشـــی گـــرنگتر، زۆرجـــاران ئـــەو جیابوونەوانـــە "عەلمانیانە!!!"نەبووە بەڵکو "ستالینانە" بووە!!

## لە عەلمانیەتی حیزبەوە بۆ عەلمانیەتی ڕۆشنبیری

ئەزموونی عەلمانیەتی حیزبی کوردی لەشاخ، مێژوویێك نییە کەس شانازی پێوە بکات، چونکە ئەو ئەزموونە دوور بووە لە هەموو بنەماکانی عەلمانیەت و_عەقلآنیەت، یەکتر قەبووڵکردن، یەکترخوێندنەوە، حیزبایەتی مۆدێرن. کاتێ نەوەی نوێ ڕەوشی سیاسی لە کتێبەکانی نەوشێروان مستەفا، مەلا بەختیار، ئەبو

شوان، فاتیح ڕەسول، حەمەی حاجی مەحمود، سامی عبدالرحمان..هتد دەخوێنێتەوە هەست بە هۆڤانیەتێکی چاخەکانی ناوەڕاستی ئەورویا دەکات!! ئەو کەلتورە دوور لەهەموو بەها ئینسانیەکان لە دوای ڕاپەڕینەوە بۆ ناو شاری کوردیش گواسترایەوەو ئەزموونی هەڵبژاردن و پەرلەمان و حکومەتی کوردی خرانە ناو بازنەی گومانەوە! بە (ڕا)ی من ئەگەر بڕیاری (٩٨٦)ی نەتەوە یەککرتووەکان، کە ناسراوە بە "نەوت بەرامبەر بە خۆراك" نەبوایە حیزبی کوردی نەك هەر هەڕەشەیان لە ئەزموونی حکومڕانی مەدەنی کوردی دەکرد، بەڵکو جارێکی تر ئەو بەشەی کوردستانیان بۆچەند ئیمارەتێکی عەشیرەتی دابەش دەکرد!!

ئەو بڕیارەی ( un )، خەڵکی لە بەشێك لە نەهامەتییەکان ڕزگار کرد لە هەمووش گرنگتر بەشێکی ئەو بودجەیەیە لەڕێگای هەندێ گەندەڵی ناو ( un )ەوە کەوتە دەستی هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار، ئەمەش بووە هۆکارێ هەندێ لەسەرانی دەسەڵاتی

کوردی بەرژەوەندی هاوبەش کۆیان بکاتەوەو چی تر سەر لوتکەکان لەیەکتری نەگرن هەروەها ئیدارەی جۆرج بۆش هۆکارێکی تر بوو، شەڕی ناو خۆ دووبارە نەبێتەوە!! لەپاش بێ دەنگکردنی تفەنگەکان، ئاڕاستەی ئەو قەڵەمانەی کە لە شەڕی ئایدۆلۆژیا دۆڕاندبوویان بەناوی مۆدێرنێتەوە شەڕێکی تریان لەناو کۆمەڵگای کوردییەوە بەرپاکرد. ئەو شەڕە، شەڕی مەعلوماتی و زانیاری مۆدێرنێتە نییە، بەڵکو شەڕێکە لەگەڵ کەلتوری کوردی و ئاینی کوردەوە دەکرێ.

زۆرجار وا ڕێك دەکەوێ کە تفەنگەکان بێدەنگ دەبن و خەڵك بژێوی باش دەبێ و جۆرێك لە خۆشگوزەرانی بەرپا دەبێ، هۆکارێك دەدۆزرێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر هەندێ ڕەوش و هێماو کەلتوری میللەتەوە. بەشێك لە نوسەرانی عەلمانی کوردی، کە زۆربەیان ئاستی ڕۆشنبیریان لەمەڕ ئاین – ەوە زۆر لاوازە بەجۆرێ نەك لە هەندێ دەقی قورئانی ناگەن، بەڵکو ناشزانن بیخوێننەوە. ئەو کارەی ئەوان کە بەناوی عەلمانیەتەوە دەیکەن خوێندنەوەی خۆیان نییە بۆ چەمکە ئاییەنیەکان، بەڵکو

ئەوەی هەندێ عەلمانی عەرەب و فارس لە ڕۆژهەڵاتناس و نوسەرانی ڕۆژئاوایان وەرگرتووە، بۆ کوردی وەردەگێڕێ و بەناوی خۆیانەوە وەك خوێندنەوەی عەقڵی کوردی بڵاودەکەنەوە. ئەو ڕەوتە عەلمانیەی کورد دەیەوێ لە دیدگای ناصر ئەبوزێد، علی حەرب،محمد ئەرەگۆن و محمد جابری و هەتا هاشم صالحەوە لە کەلتوری کوردی و قورئان بدوێ!! بەواتای ئەوەی هەتا ئێستا عەلمانیەتێك لە کوردستان درووست نەبووە کە دەرهاویشتە و زادەی بیرکردنەوەو تێڕوانینی کوردی بێ، هەروەك لە (حیزبکاری) و (مارکسیەت) کورد چاوی لە عەرەب و تورك کردەوە لەمەسەلەی عەلمانیەتی مەدەنیش، ڕۆشنبیری دەرەوەی بازنەی دین خەریکە چاو لەو بزاڤە دەستکردەی عەرەب و فارسەکان دەکاتەوە هەرئەمەش وایکردووە لە سەردەمی ئێستادا بیرمەندێکی کورد لە بواری سیاسەت و مەسەلە چاکییەکان درووست نەبێ؟!



# ئەزموونی عەلمانیەت

# لە

# کوردستان

چاوپێکەوتن لە گەڵ بەڕێز م. فاتیح سەنگاوی

سازدانی: حەکیم ابوبکر



**ڕێنوێن: عەلمانیەت چۆن هاتە کوردستان ؟**

قســەکردن لــە چــۆنێتی ســەرهەڵدانی عەلمانیــەت لــە کوردستاندا یاخود هاتنی بۆ کوردستان بابەتێکی دابڕاو نەبووە لەو بارودۆخەی ولآتانی ئیسلامی و دەوروبەر پێیدا تێپەڕیوە، لەگەڵ ئەوەی هۆکارەکانی سەرهەڵدانی عەلمانیەت لە ژینگەی تایبەتی خۆی کە ئەوروپایە زۆر و زەوەندەن و دیارترینیان ستەم وزۆرداریەکانی کەنیسەو دژایەتی زانست وزانیاریی بوە بەناوی ئایینەوە بە تایبەت لە ڕێگەی دادگاکانی تەفتیش و بڕیارە ستەمکاریی ونامرۆڤایەتیەکانییەوە، لە و لاشەوە بەهۆی لاوازیی جیهانی ئیسلامی بەتایبەت لە دوادواییەکانی دەسەلآتی عوسمانیدا توانرا چەند ناوچەیەکی ولآتانی ئیسلامی داگیر بکرێت لە لایەن ئەوروپیەکانەوە لەوانە داگیر کردنی میسرلە لایەن ناپلیۆن(١٧٩٨-١٧٩٩م) کە١٢٢زانای لە بوارەجیاجیاکان لە گەڵ خۆی هێنابوو، ئەم هەڵمەتەش دەنگدانەوەی شۆڕشی فەرەنسی بوو کە یەك لە ئامانجەکانی ئیسلاحی کەنیسەو

دژایـەتی كردنـی بـوو، ئـەم داگـیر كردنـە عەسـكەری-فیكریـەی عەلمانیـەت كاریگـەریی خـۆی لەسـەرنوخبەی میسـری بـەجێ هـێلا، لـە توركیـاش بلاوبونـەوەی بیرۆكـەی باشـترێتی ڕەگـەزیی توركی كە لە لایەن نوسەرە ئەوروپییەكانـەوە برەوی پێ دەدراو لە لایەن هەندێ لە توركەكانەوە تەرجومە و پێشوازیی لێ دەكرا، سـەرباریی دروسـت بـونی چـەندین كۆمەڵـەو ڕیكخـراوی وەك توركیـای لاو(تركيـا الفتـاه) و ئیتیحـادو تـەرەقی و دواتـر سـەركەوتنی موسـتەفا كـەمال وهەڵوەشـاندنەوەی خەلافـەتی عوسمـانیی لـە٣ی ئـازاری ١٩٢٤كـە سـەرەتا ی بـەڕەسمی ڕاگەیاندنی عەلمانییەت بوو، هەروەها بارودۆخی ولاتـی شام و سـەرهەڵدانی فیكریـی نەتەوەپەرسـتی بـە تایبـەت لـە لایـەن مەسـیحییەكانەوە و ڕەنگدانـەوەی لـە سـەر دەوروبـەر، دروسـت بونی ئەم بارودۆخانە لە هەریەكە لە میسرو توركیا و ولاتـی شام كـە پێگـەی بـەهێزی جیهـانی ئیسـلامی بـون و ڕۆشـنبیرو سیاسـەتمەدارەكانی زۆرێـك لـە ولاتـانی ئیسـلامی ئـەو كـات لـە

ژێرکاریگەری بەتایبەت ئەو دوو وڵاتەدا (تورکیا ومیسر) دا بون,و لە وێوە بیروبۆچونەکان پەخش دەبون، ئەمە سەرەڕای چەندین هۆکاریتر کە ئاسانکارو ڕێخۆشکەر بوون بۆ گواستنەوەی عەلمانیەت لە ناوچەکەدا لەوانە بڵاو بونەوەی ستەم لە لایەن هەندێ لە کاربەدەستانی عوسمانیی وپاشەکشەی موسوڵمانان وپێشکەوتنی ئەوروپاو وەرگرتنی یاساو ڕیسا لێیان وناردنی نێردەی زانستی بۆ ئەوروپا بەمەبەستی وەرگرتنی زانست وپێشکەوتن وبوونی نێردە موژدە دەرییە تەبشیریەکان و بونی چەندین قوتابخانەو دانشکاو زانکۆی بیانیی لە وڵاتانی ئیسلامی بە مەنهەج وپرۆگرامی ئەوان، هەموو ئەمانە بەشداریيان کرد لە ڕەخساندن وهاتن و سەرهەڵدانی فیکریی عەلمانی لە وڵاتانی ئیسلامیی لەوانە کوردستان، بیرمان نەچێ پشتگیریی کردنی نوخبەی عەلمانیی وغەرب زادەکان لە لایەن ئیستعمارو داگیرکەرە ڕۆژئاواییەکانەوە ئێستەشی لەگەڵدا بێت دەرفەتێکی لەباریان ڕەخساند بۆ سەقامگیریی و ئاسایی

بونی فیکریی عەلمانی وعەلمانییەت لەم ولأتانەدا و گەورەترین هۆکاربوون بۆ ئەوەی عەلمانیەت درێژە بەبونیی خۆی بداتو تەمەنی درێژ بکاتەوە، پاش جێپێ بوونەوەی عەلمانییەت لە جیهانی ئیسلامی لەوانە ولأتانی دەوروبەرو دروستبوونی ڕێکخراو وحیزب وکەسایەتیی عەلمانیی مەشرەب لە بەرەنجامی ئەو هۆکارانەی ئامارژەی پێ درا، وە بەو پێیەی کوردستانیش بەشێك بووە لە و واقعە لێرەوە هەندێ لە نوخبەی کورد لە ڕێگەی بونە ئەندام لە تورکیای لاو و ئیتیحاد و تەرەقی کە زۆرێك لە کەسایەتی کوردی خاوەن فیکرو سیاسەت بەشداربوون تێیدا لەوانە عبدالله جەودەت و ئیسحاق سکوت و چەندانی تر وهاوکاریی کردنی کەمالییەکان کە سەرەتا خۆیان بە دۆستی کورد پیشان دادە، ئەندامێتی کورد لە نێو ئەم ڕێکخراوانەدا بە جۆرێك لە جۆرەکان سەرەتایەك بوو بۆ هێنانە ناوەوە و ڕێ خۆشکردن بۆ بیری عەلمانییەتی ڕۆژئاوایی، خۆ ئەگەر تەواوی ئەوانە عەلمانیش نەبوبن(سەلماندنی ئەوە توێژینەوەی تایبەتیی

دەوێت)، بەلاّم بەپێی ئەو ڕێکخراوانەی کاریان لە گەڵیان کردوون دەردەکـەوێت سەرسـام بـوون بەشۆڕشـی فەرەنسـی کـە ڕووی سیاسی عەلمانیەت بووە لە ڕۆژئاوادا، لە گەڵ ئەوەش دا نکوڵی لەوەش ناکرێ گواستنەوەی فیکریی عەلمانی بۆ کایەی کوردی بـە شـێکی لـە ڕێگـەی کاریگـەری ڕۆشـنبیرو ئـەدیب وسیاسـییە تورکەکانـەوە بـووە لـەم نێوەنـدەش ئـەوانیش لـە ژێرکاریگـەریی ڕۆژئاواییەکاندا بوون، خەباتی نەتەوەیی گەلانیی ئەوکاتە لەوانە کوردیش بەشێکی لە ژێر کاریگەریی فیکریی نەتەوەییدا بووە و بـە جۆرێـك لـە جۆرەکـان شـەپۆلی ناسیۆنالیسـتیش بـە قـوڕی عەلمانییـەت شـێلرابوو، ئـەو پارتـە سـەرەتاییانەی کـە دروسـت دەبـوون خـاڵی نـەبون لـە چـەندین کەسـایەتی کـە عـەلمانیی مەشـرەب بـوون یـاخود هەنـدێکیان بەتـەواوی ئـەو فیکرەیـان وەرگرتبـوو، بـەلاّم بـە سـەرنج دانێکـی خێـرا وادەردەکـەوێ تـا کۆتایی سیەکانیش ڕەوتێکی عەلمانیی تـەواو لــە نێو کورددا نەخـەملیبوو، ئـەوەی هـەبوو چـەند کەسـایەتی و ڕێکخراوێکـی

کوردی بون ولە پێناوی سەربەخۆیی یا ماف نەتەوەیی گەلی کورددا خەباتیان دەکرد لەم ڕووەشەوە لە ژێر کاریگەریی نەیاران ودژە عوسمانییەکاندا بون کە زیاتر پشتگیرییەکی ئەوروپییانەیان هەبوو لەوانە بەشێك لە ئەندامانی کۆمەڵەی ژ-ك(١٩٤٢)و حدکا(١٩٤٦)، پێشتریش کۆمەڵەی هیوا.

**ڕێنوێن: قۆناغە مێژووییەکانی عەلمانیەت لە کوردستان کامانەن ؟**

بە داخەوە ئێمە توێژینەوەی زۆر وردی وامان لەبەردەستدا نییە کە ئەو قۆناغ بەندییانەمان بۆ دەست نیشان بکا، خۆ ئەگەر لێردەدا بە کورتی بمەوێ شتێك لەو بارەیەوە بڵێم ئەوا دەکرێ بەم شێوەیە ڕیز بەندی بکەم.

قۆناغی یەکەم: کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم وهەردوو دەیەیی سەدەی بیستەم: ئەو کوردانەی لەژێرکاریگەریی تورکیای لاوو کۆمەڵەی ئیتیحادوتەرەقی دا بون (کە هەندێکیان لە ئاستی دەستەی دامەزرێنەردا بون) یان ئەوانەی بە کەمالیستەکان خەڵەتا بون، بەشێك لەمانە یەکەم چین ونوخبەی کوردین کە

ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ لە ژێر بانگەشەی عەلمانییەتی ڕۆژئاوایی وباڵیی سیاسی عەلمانیەت دا بون كە خۆی لە بنەماكانی شۆڕشی فەرەنسی دا نمایش كردبوو، دەشیان ویست بۆ بارو دۆخی نوێی دەوڵەتی ئەوسای عوسمانی سودی لێ ببینن، بەلآم كاتێك زانیان هەڵخەڵەتێنرابوون، دواتر خۆیان پێكهاتەی نوێیان دروستكرد كە لە چەندین ڕێكخراو و كۆمەڵەو حیزبیی كوردیدا خۆی دەبینییەوە، لەو كاتەش دا نوخبەی سیاسی وسەرەك هۆزەكانی كورد لە ژێر كاریگەری هەریەك لە باڵی كەمالیست و سوڵتانی عوسمانیدا بون بە واتایەكیتر دابەش ببون بەسەر ئەنقەرە(ئەتاتورك) وئەستەمبوڵ(سوڵتانی عوسمانی)دا، بیرمان نەچێت لە بیستەكانی سەدەی بیستیشدا(١٩٢٤) شیوعیەتی رووسی كاری زۆری كردووە بۆ بڵاو كردنەوەی شیوعیەت لە نێو كوردەكانیی ئەرمینیا و سنوریی سۆڤیەت.

قۆنـاغی دووەم: قۆنـاغی کۆتـایی سـیەکان وسـەرەتای پەنجاکانـە: قۆنـاغی دەرکـەوتنی چـەندین ڕێکخـراو و کۆمەڵـەو حیزبـی کـوردی کـە زیـاتر فیکریـی عەلمانییـەت زاڵ بـووە بەسـەر یانـدا، کـە دواتـر دواتـر لـە ڕێگـەی کەسـایەتیيە کۆمەڵایەتییـە دینییەکانـەوە بونـە حیزبیـی جـەماوەریی و کـارکردن لـە پێنـاو دیموکراسـی ومافـە نەتەوەییەکانـدا بـووە دروشـم وئامـانج نـەك عەلمانیـەت وەکـو فیکـرو ئایـدیۆلۆژیا، لەوانـە کۆمەڵـەی هیـوا و کۆمەڵەی ژ–ك و کە دواتر بون بە حیزبی دیموکراتی کوردستان ئێـــران وحیزبـــی دیمـــوکراتی کوردســـتانی عێـــراقیش لە١٩٤٦دروست بوو کە سەرجەمیی ئەمانە نوخبەیەکی دیاری عەلمانییان لە خۆ گرتبوو، دواتریش لەحیزبیی شیوعی عێراقیدا (کە لقی کوردستانیشی هەبوو)بە تـەواوی عـەلمانیی بون ڕەنگـی دایـەوە، چـونکە ئـەم نوخبـەیـەی کەلەگـەڵ سـەرکردەکانی ئـەم حیزبا بون نەك هـەر عـەلمانیی بـوو بـەڵکو عەلمانییـەکی تونـدڕەو بوون.

قۆناغی سێیەم: لەپەنجاو شەستەکانەوە تاوەکو کۆتایی دەیەی سەدەی بیست ویەکەمی خایاندو، تا ئێستاش درێژەی هەیە بە لام لەم ماوە دوورو درێژەدا عەلمانیەت لە کوردستاندا (چونکە عەلمانیەتی کوردی خۆی باس وخواسیتر هەڵ دەگرێ) جەندین گۆرانکاریی و سیماو رووی نوێی لە خۆگرتووەو زیاتر لە فیکری مارکسی –لینینی دا خۆی بینیوەتەوە، هەرچەندە خاڵی نەبووە لە رەوتەکانیتریی مارکسییەت، هەریەك لە حیزبی شیوعی ویەکێتی نیشتمانی کوردستان (بە تایبەت کۆمەڵە)و پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبەکانی وەکو حسك وزەحمەت کێشان وحیزبی کۆمۆنیست کرێکاریی و.. لەو حیزبانە بون کە خۆیان بە عەلمانیی زانیوەو، زۆرجار لای بەشێکیان مارکسی بون لە سەرووی کوردایەتیشەوە بووە، بەلام لە کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکانەوە زیاتر حیزبیی کوردی هەنگاوی نا بەئارستەی حیزبی عەلمانیی لیبرالی بە حیزبی شیوعیشەوە؟!!

ئەم سیمایە زیاتر لە دوای ڕاپەڕینەوە بە دەرکەوت و زەق بویەوە، لە ۲۰۰۳یشەوە زیاتر توخ بووەتەوە و، کاریگەریی سستەمی نوێی جیهانی سەرەتای نەوەدەکان ویەکجەمسەریی ئەمریکی و هاتنی ئەمریکا لەم رووەوە زۆر رۆڵی بینیوە، و دەزانم لە ۲۰۰۵بە دواوە خەریکە عەلمانیەتێکی تا ردەیەك میانەرەوتر لە رووی فیکرەوە لە ناو حیزبە عەلمانییەکاندا خەریکی خەملآن ودروست بوونە، بونیی ئەم گۆرانکارییانەی ئەم دووایییەی ناو ی.ن.ك. زیاتر یارمەتیی ئەم رەوتە دەدات بە تایبەت لە هەڵوێستی بەرامبەر بە ئایین و ماف وئازادی ودیموکراسییەت..کە ئەکرێ ئەمە ببێتە قۆناغی چوارەمی عەلمانیەت لە کوردستاندا.

ئەم پۆلێن کردنەش زیاتر سەرنجێکی شەخسیی سەرپێییەو دەکرێت لەم ڕووەوە کاری جیددی وئەکادیمیی زۆر زیاتر ئەنجام بدرێت، یاخود لە روانگەو دیدی ترەوە قسەی لەسەر بکرێت، ئەوەشمان لە بیرنەچێ کە ئەوەی بەعەلمانییەتی کوردی خۆی

ناسـاندووە تـاوەکو ئێسـتەش گـیرۆدەی چـەندین دیـاردەی ناعـەلمانیی ودژە دیموکراسـین بـە پێـوەرە ڕۆژئاواییـەکان ونـەیانتوانیوە تـەجاوزنی زۆر کۆسـپ و تەگـەرە بکـەن لـە و ڕووەوە، زۆر جاریش لـە سنوری بیری خێڵ وهەنـدێ حساباتی ناوچـەیی دا خولاونەتـەوەو بـارو دۆخـە کۆمەڵایەتیـەکان کـە بەشـێکیان سـلبیی بـون کاریگـەرییان بـووە لـە چـۆنێتی هەڵسوکەوتیان بە ئێستاشەوە کە هەندێکیان لە دەسەڵاتیشدان!

**ڕێنوێن: ڕێبەرانی عەلمانیەت لە کوردستان کامانە بوون؟**

دیارە ڕێبەرانی عەلمانیەت لە کوردستان لە کۆن ونوێ دا لـە چـەند گـروپ و دەسـتە یـان توێـژی تایبەتـدا هـەبوون وهـەن، زەقترینیان نوسەر و سیاسی وهونەرمەندەکان بوون، لە ڕێیی ئەم سێ توێژەوە عەلمانییەت بونی خۆی بەرجەستە کردووە، توێـژە سیاسـییەکەش زیـاتر توانیویـەتی خـەڵکی لـە دەوری حیـزب وپارتـە عەلمانییـەکان کـۆ بکاتـەوە نـە لـە بەرئـەوەی عەلمانییـەت وەکو فیکر جێ بایەخ و خواستی خەڵکی کوردستان بوبێ، بەڵکو

بەهۆی ئەو داکۆکی و خەباتە سیاسییەوە بووە کە کە ئەو کەسانە لە مێژووی خۆیاندا پێیی هەستاوون، بەو هۆیەی کوردیش خاوەنی دۆزێکی ڕەوایە هەرکەس بەش و پشکی لەو خەباتە دا زۆر بوبێ ئەوا جەماوەریشی زۆر بووە، خەڵکی زۆرینەی هەرە زۆری شوێنی بیرێك نەکەوتوون بە ناوی عەلمانیەتەوە بەڵکو شوێنی ڕەمزە کۆمەڵایەتی وئایینیەکانیان کەوتوون لە هەرسەنگەرێکدا کە بەسەنگەریی ڕەوای بەرگری کردن لە خۆیانیان بینیبێ.

کەمتر سیاسییەکان وەکو سونبولی عەلمانییەت(لە ئاستە فیکرییەکەدا) دەرکەوتوون مەگەر هەندێ لەوانەی لە کۆمەڵەی ڕەنجدەران و حیزبیی شیوعی دا بوبن، بەڵکو زیاتر سونبول و ڕەمز بوون لە بواری خەباتی سیاسی و نەتەوەییدا بە دەرکەوتوە، ئەمەش وا مان لێ دەکات کەمتر ئاماژەیان پێ بکرێ، ئەوان لەبەر ئەوەی هەندێکیان سەرکردە بوون لە ناو حیزبێکی سیاسی عەلمانیی ڕۆژهەلاتیدا بۆیە خۆیشیان دواجار برەو پێ

دەری ئەم ڕەوتە بوون، بەڵام بانگەشە کردن بۆ عەلمانییەت زیاتر لە نێو نوسەران دا بە دەرکەوتووە، ئەو ناوانەش لە هەشتاکانەوە زیاتر دیارن، وا دەزانم پێشتر زیاتر خوێندنەوەی کتێبە مارکسییەکان باوتر بووە وەك لە نوسین، لای هونەرمەندو ئەدیبەکانیش نوسینی چیرۆك و ڕۆمان و هەروەها لە دراماو شانۆو هونەری نواندن دا ئەو فیکرە(بە تایبەت بەدیوە مارکسییە چینایەتییەکەیدا ) زیاتر ڕەنگدانەوەی هەبووە لە دوای نەوەدەکانیشەوە چەندین نوسەر بەدەرکەوتوون کە ویستویانە لە ڕێگەی وەڵام دانەوەی ئیسلامییەکان وگوتاری ئەوانەوە زیاتر تەعبیر لە خۆیان بکەن، کە زۆرتریان موناقەسەو دەعمی حیزبی لە پشتیانەوە هەبووە وەك لە تەنزیر کردن بۆ عەلمانیەت بە شێوەیەکی جیددی، بەڵام خاڵیش نییە لەو جۆرە نوسەرانە، کە نامەوێ لێرەدا ناویان هیچ یەك لەو نوسەرانە بهێنم، ئەوە بۆ دەرفەتێکیتر بەجێ دەهێڵم. واش نازانم ڕێبەریی مەزنی عەلمانییەت لە کوردستاندا بونی هەبێت، ئەگەر شتێ هەبێت

زیاتر لە برادەرانی رەهەندو هاوبیرەكانیاندا رەنگی داوەتەو لەگەڵ هەندێ كەسایەتیی تری كەم لە سەنتەرو ناوەندە توێژینەوەییەكاندا.

**ڕێنوێن: لەكودستان دابەشبونی بانگەشەكەرانی عەلمانیەت لەسەر چی بنەمایەكن؟**

گرنگە ئاماژە بدرێ بەوەی عەلمانییەكان سەرەڕای خاڵی هاوبەشیان بەڵام دەكرێت پۆلێن بكرێن ولە چەند ئاستێكی جیاوازدا بیانخوێنینەوە، پێش ئەوەش گرنگە بزانین پارتە عەلمانییەكانی كوردستان لە شێوازی عەلمانییەتی رۆژهەڵاتین و كەمتر توانیویانە لە واقعیی ئاینی وكۆمەڵایەتی خۆیان بگەن و عەلمانیەتیان زیاتر لە فۆرمە تەقلیدیەكەیدا وەرگرتووە، سەرەتای دەركەوتنی دیاریی پارتە عەلمانیەكانی كوردستان زیاتر عەلمانیەتێكی توند رەو بو ە لەو جۆرەی عەلمانیەت بووە كە بەعەلمانیەتی گشتگیر(العلمانية الشاملة) دەناسرێت و بەهەموو توانایەكیەوەو یستویەتی(بەتایبەت لە ٧٠-٨٠كان و

لای زۆرینـــەیان) ئـــایین ورەهەنـــدی غـــەیبی لـــە ژیـــان دابرێـــت، ودیدێکی مادییانەی بۆ ژیان هـەبووە و دژایـەتی تـەواوی ئـایینی کردووە و بۆ گەیشتن  بە ئامانجەکانی کـەمتر رەچاوی بەهایـەکی مرۆیی وکۆمەڵایەتی وژیارییـەکان دەکات ودەست دەخاتـە نێو کاروبـاریی ژیانـەوە، هەرچـەندە عەلمانیـەتی کـورد ی لـە ڕووی مەعریفییـەوە لـە و ئاسـتەدا نـەبووە، بـەڵام بـە کوێرانـە شـوێن کەوتنی مارکسییەت هەڵەی گەورەی مێژووی پیٚ کردووە.

عەلمانیـــەکانی کورد(حیزبـــەکان)، بـــەها دیموکراســـییەکانی عەلمانییەتی ڕۆژئاواییان وەرنەگرتبوو تاوەکو ئێستەش خوێنی دیکتاتۆرییـــەت لـــە شـــادەماریاندا ســـووری ئاســـای خـــۆی هەیـــە هەرچەند پەستانی واقع ناچار بە زۆر شتی کردوون بەڵام لەکاتی تەنگژەو ناکۆکییەکاند جارێکیتر گیانی پاکتاو کردن وسڕینەوەو لەناوبردنی ئەویتری بەرامبەر دەژێتەوە..

بەشێکی دیاریی عەلمانییەتی کوردی بەنوسەرەکانیشیەوە کاتیٚ کە دێنـە سـەرخوێندنەوەی ئـەوەی ئـەوان بـە ئیسـلامیی سیاسـی دەیناسێنن تەنها یەك ئیجابییەتێکی تێدا نابینن؟!!

ئێ باشە هیچ عەقڵ ومەنتقێك ئەوە دەسەلمێنێ کە ئیسلامییەکان بە تەواویی ڕەوت و باڵە جیاوازەکانییەوە، تەنانەت ڕەوت وبزاڤە میانە ڕەوەکانیشیان تاکە ئیجابیەتێك لە خۆ نەگرێت، داتاشینی وێنەی ناشیرین ورەش ببوە باو و باوە لای هەندێ لەو نوسەرانە!!

لای ئەوان ئیسلامیەکان کە بەرەی دژە عەلمانیین، تەنها و تەنها شەڕیی رووتن؟!! ئەمە ئەگەر توند ڕەویی فیکریی نەبێت چییە؟!!نوسینەکانی شوان ئەحمەد ورامیار مەحمود و فوأد مەجید میسری وسەرۆ قادر و هەندێ کەسیی سیاسیی و حیزبیی تر نمونەی ئەم ڕەوتەن و زیاتر دەچنە ئەم بۆتەیەوەو ئەم ڕێبازە زیاتر زاڵە بە سەریاندا، لەو لاشەوە کەسانێکیتر هەن لە نێو ڕەوتی عەلمانیدا کە کەسانێکی جیددین و لەگەڵ جیاوازی فیکرشماندا دەبێ بڵێم خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنی ئەوان جۆرێك لە بە ویژدانی و حساب کردن بۆ بەرامبەری تێدایە با نەیاریی فیکری ئەوانیش بن، بۆچونەکانیی ئەوان سەرەرای

جیاوازی فیکری وبیروبۆچونمان ناچار بەوەمان دەکات دان بە جیددیی بونیان دا بنێین، نمونەی ئەمانەش ڕێبین هەردی ومەریوان وریا و قانع و ستران عەبدلا(کە لە هەندێ کۆڕیدا لەو باسە دواوە) وهتد..

لەو لاشەوە عەلمانیەتی گشتگیرو توندرەو لە رووی فیکرییەوە لەسەرەتای نەوەدەکاندا لە کۆمۆنیستی کرێکاریی وباڵەکانیدا خۆی نمایش دەکرد، سەرەرای هەندێ نوسەرییتر کە ئێمە بەنوسەریی جیددی ناو زەدی دەکەین.

وا دەزانم ئێستا رەوتێکیتر لە ئارادایە بە ئاراستەیەکی میانە رەوتر هەنگاو هەڵدەگرێت ئەمەش دوو بەشە یەکەمیان: ئەو پارتە عەلمانیانەن کە دەیانەوێ ئایین وهەستی ئایینی بۆ خۆان ولە بەرژەوەندی خۆیان ئاراستە بکەن، نەک لەبەر رێزی دین وخۆش ویستنی بەڵکو لە بەر دەنگ وپشتگیریی سیاسی لە گۆرەپانەکەدا، کە پێ دەچێت پارتەکانیی دەسەلات لەم روەوە یاریکەرێکی باش بن لە ئێستادا، بەشێك لە ئۆپۆزسیۆنییش ئەم

یارییە ئەنجام دەدات کە هیوادارم لە قەناعەتێکی ڕاستگۆیانەوە بێت بەرامبەر بە خودی ئایین وبیروباوەڕیی خەڵك نەوەك تاکتیکێکی سیاسی ڕووت؟!!

هەندێکیشی لە بەرەنجامی موتوربەی ئیسلامی-عەلمانیی هەندێ نوسەرە کە سەرەنجامەکەی قورس کردنی لایەنی عەلمانییە وەك لەوەی بە دیوی ئیسلامیی بوندا بکەوێ بەلاَم دەیەوێ ڕێزێکی زیاتر و ڕۆڵێکی باش و فراوانتر بە ئیسلام بدات؟!

ئەوەی ئەمرۆ بە ئاشکرا لای عەلملنیەکان لە ئاستە سیاسییەکەیدا ولەناو حیزبەکانیدا بە دەردەکەوێ زیاتر عەلمانییەتێکی جوزئییە کە زیاتر کار لە سەرجیاکردنەوەی ئایین لە کایەی سیاسی دەکاتەوە، بەلاَم هەندێ ڕەفتارو هەڵوێستیشیان ئەو قەناعەتەمان بۆ دروست دەکات کە کرۆکی ئەمانە عەلمانیەتێکی گشتگیرە نەك جوزئی بەلاَم نوسەرو

ڕۆشنبیرە عەلمانییەکانی کوردستان زیاتر عەلمانیەتی گشتگیرو توندرەو لە ڕووی فیکریەوە زاڵە بەسەریاندا..

**ڕێنوێن: ئەزمونی عەلمانیەت لە کوردستان (سەلبی و ئیجابی) چۆنن؟**

لە ڕووی مێژووییەوە کورد وەکو نەتەوە ئەزمونێکی تاڵی هەیە لەگەڵ عەلمانییەت دا، هەر لە دابەشکردنی کوردستان لە لایەن دەوڵەتە عەلمانییە ئیمپریالیزمەکانەوە بیگرە تاوەکو عەلمانیەتی تۆرانی ئەتاتورك کە پەیمانی سیڤەری هەڵوەشاند ولۆزانی لە جێی دانا و زمان و فەرهەنگی کوردی ئیلغا و قەدەغە کرد و تا دەگاتە عەلمانیەتی بەعسی لە عێراق وسوریە و عەلمانیەتی شا لە ئێران و عەلمانییەتی شیوعی وسۆڤیەتی لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران کە بونیی کوردی نزیك بە نەمان و پاکتاو کردن کرد؟!!

لەسەر ئاستی ناوخۆی ئەزمونی تاڵیی براکوژیی و چونە سەنگەریی دوژمنان زۆر ڕوون و ئاشکرایە، لە سەرئاستیی بیروباوەر وبەها ئایینی وئەخلاقییەکان عەلمانییەکان ڕۆڵێیکی

یەکجار زۆرە سەلبیان گێراوە بە تایبەت لە ڕاگەیاندنەکانیاندا، ئاراستەی باوو زاڵیی ئەوان لە ڕاگەیاندندا سڕینەوەی کوردە وەکو نەتەوەیەکی خاوەن شوناسی تایبەت لە زۆر ڕووەوە کە ئێرە جێی باسکردنی نیە، گەندەڵی مۆرکێکی دیاریی حوکمرانی ئەوان بووە، خاڵە ئیجابییەکانیشیان لە کوڵ نەدان بووە لە خەباتیی نەتەوەی دژ بە داگیرکەرانی کوردستان وجۆشدانی خەڵك لەو پێناوەدا، کە دواتر چەندین دەستکەوتی نەتەوەیی بۆ کورد بەدی هات، هەرچەندە زۆرجار بەهۆی خراپ ئیدارە دانەوە زیانی زۆر گەورە کراوە.. ئەمانەش قسەی زۆر هەڵ دەگرن وفرە ڕەهەندن، لە ئێستاش دا نەوەیەکی ژیرو ماف خوازو دیموکراسی ویست لە نێو ڕۆشنبیروڕۆژنامە نوس و نوسەرە عەلمانییەکاند پێ گەیشتووە و لە واقعی کوردستاندا جێ دەستیان دیارە.

**ڕێنوێن: کاریگەری شاڵاوی فیکری و کرداری عەلمانیەت لە کوردستان چی بوون؟**

بێگومان شاڵاوی فیکری و کرداری عەلمانیەت لە کوردستان دا کاریگەریی زۆری بووە، چونکە هاوکار بوون بۆ راپەراندنی ئەو ڕەوتە جیهانییەی کار لەسەر لاوازکردنیی بەها ئەخلاقییەکان دەکات.. وەکو ئامارەشماندا راگەیاندن وکەناڵە ئاسمانییەکانیان نمونەیەکی بەرچاون لەم رووەوە، هەروەها عەلمانیەتی دەسەڵاتدار لە کوردستاندا بۆ نمونە لە پرۆسەیەکی وەکو تەبشیردا بێ دەنگە یا مرونەتی زۆرباسی نواندووە، ئەمە ئەگەر نەوترێت پشتگیرو هاوکارە، چونکە زۆر ئامارە هەن دەری دەخەن کە عەلمانیەکانی کوردستان لە ڕێگەی دەسەڵات وحیزب وکەسایەتیەکانیانەوە خزمەتێکی گەورە بەپرۆسەی تەبشیر دەکەن وداکۆکی کەرێکی سەرسەختیشن لەو روەوە بەڵام بەدواداچون و ساغ کردنەوەی ئەم بۆچونە زیاتر لەم ئامارەیە دەخوازیت.. لە کاتێکدا ئەو بە رەنجامە بەرەنجامی پرۆسەیەکی

عەقلیی حیواریی نەبووە لە کوردستاندا بەڵکو زیاتر قۆستنەوەی نەداری و کەم دەرامەتی و کارەساتەکانی کوردستانە.. لە رووی فیکرییەوە عەلمانییەکانی کوردستان توانیویانە کاریگەریی خۆیان لە گۆرەپانی رۆشنبیری کوردستاندا بە جیّ بهێڵن کە بەشێکی بە پاڵپشتی و لە رێی دە زگا زەبەلاحە حیزبیە-حکومیەکانەوە ئەنجام دراوە؟!!

**ڕێنوێن: پەیوەندی عەلمانیەتی کوردستان لەگەڵ دەرەوەدا چۆن دەبینی؟**

لە پرسیارەکەدا دیار نییە مەبەست لە و پەیوەندییە چییە؟ لە چ ڕوویەکەوە؟ لە چ بوارو ئاستێکدا؟ بەشێوەیەکی گشتی بە هۆی کرانەوەی زیاتر و ئاسان بونی رایەڵەکانی پەیوەندییەوە هەموو بۆچونەکان دابراو نیین لە یەك ، ئەو پەیوەندییانە لە چەندین ئاست ولە چەندین رووەوە درێژەیان هەیە، فیکری و ڕۆشنبیری و سیاسی و موخابەراتی و..هتد

**ڕێنوێن: پەیامت بۆ عەلمانی و ئیسلامی لە کوردستان چی یە؟**

لێرەدا بەو پێیەی پرسیارەکانی بەرێزتان زیاتر لە چوارچێوەی عەلمانییەکاندا بوو، قسە کردنیشم لە سنوری پرسیارەکانی ئێوەدا یە ئەگین شتی تر زۆرن بۆ وتن و وەدەکرێ لە دەرفەتی تردا بکرێن..هەر رووەشەوە پێم خۆشە زیاتر روو لەوان(عەلمانییەکان) بکەم، گفتوگۆم لە گەڵ ئیسلامییەکان بۆ دەرفەتێکیتر بەجێ دەهێڵم و بڕواشم وانییە ئیسلامییەکان بێ پەلەو هەڵە بن، یاخود ڕەوتی عەلمانی هیچ ئیجابییات و خاڵی ئەرێنیەکی نەبێ.

زۆر گرنگە عەلمانیەکانی کوردستان کۆپی هیچ عەلمانیەتێك نەبن بەڵکو سودمەند بن لەو خاڵە ئیجابییانەی لە عەلمانییەتی رۆژئاواییدا بەدی دەکرێن و وەدەرژێنە خانەی مافەکانی مرۆڤ و هەستی عەدالەت خوازی و یەکسانی و خێر خوازیی و دابین کردنی خزمەت گوزاریی و ڕەفاهییەت بۆ هاوولاتیان بە دەر لە بۆچون ودیدە جیاوازەکان، چونکە دواجار ئەم خالانە لەگەڵ عەدالەت و ماف و بەرپرسیارێتی و هەستیی

راوێــژ خــوازیی و بــەها جــۆراو جۆرەکــانی ئیســلام دا یــەك دەگرنەوەو هاوکار دەبن لە خزمەتی هاوولاّتیاندا، بەمـەش وەکو کورد وهاوولاّتی کورد لە دوو لاوە سودمەند دەبین، لەو لاشەوە دەکــرێ بــە شــێوەیەکی ســەلبیی ســوود لــە عەلمانییــەتێکی دکتاتۆری و ستەمکار وەربگیرێ کە تاوەکو ئێستە ش نەك لە ڕۆژهەلاّت دا لە نێو هەندێ دام و دەزگای تایبەتی ڕۆژئاواییشدا بونی ماوە، ئەو دڕندەیەتییەی لە هەندێ ولاّتدا بەرامبەر مرۆڤ دەکرێ لە لایەن هەندێ سوپا ودەزگای تایبەتەوە هی ڕژێم و ولاّتــە عەلمانییــەکانن کــە بانگەشــە وپیــادەی دیموکراســییەت دەکەن!!

دەخوازم عەلمانییەتی کوردی بەتایبەت حیزبەکان ودواتریش ڕۆشــنبیران لێبــوردەیی و مــاف و ئازادیــەکا ن و ڕوونــی و شەفافییەت لەوانەوە فێربێت و بکرێتە ڕۆشتبیریی باوو زاڵ..

لە ڕووی بیرو باوەر وبەهاکانیشەوە کە پێکهێنەریی لایەنی کۆمەلاّیەتی وئایینی و ڕۆشتبیری ئێمەن، گرنگە خۆمان بە کەم نــەزانین، بەشــە خــراپ و نــەخوازراوەکانی نێــو پێکهاتــەی کۆمەلاّیــەتی و ڕۆشــنبیریمان پاڵفتــەکردنی دەوێــت بــەلاّم نــەك

جینۆسـاید کردنـی، چـونکە خـاڵیی زۆر بـەهێزی تێدایـە کـە کەڵەکەبووی سەدان ساڵەو وا بە سانایی بە دەست نەکەوتووە ناشکرێ بە هەرزان لە دەستی خۆمانی دەرکەین، هەر گەلێك بە تایبەتمەنـدی خۆیـەوە هەیـە و دەناسـرێت و دەکـرێ شـانازی بکـات، بـەڵام کـاتێ لـە ڕووی ڕۆشـنبیری وکۆمەڵایەتیـەوە بویـت بەویتر ئەوە تۆ نیت هەیت، بەڵکو بویت بە ئەویتر، کە ئەمەش پرۆسەی تواندنەوەیە نەك بەهرەدار بوون، بۆیە عەلمانییەکانی کوردستان دەبێ لەم خاڵەشدا هەستیار بن، ئەوان نایانەوێ ببن بە ئیسلامی بەڵام گرنگە بزانن شارستانییەت ئیسلامی بونێکی زۆر گـەورەیی مێـژوویی ڕابـردو و هەنوکەیـە و قورسـاییەکی گەورەشی لە نێو ئێمەی کورددا بە دیوە ئیجابییەکەیدا هەیە وناکرێ نا دیدە بکرێ، وە دەتوانرێ بە شێوەیەکی زۆر ئەرێنەیی لـە قـازانج وسـودی مانـەوەو بـونی گـەلی کـورددا سـودی لـێ ببینرێـت، دیـار شـتی تـر زۆرە بـۆ وتـن بـەڵام لـە م دەرفەتـەدا ئەوەندە بەسە بۆ وتن.



# عەلمانیەت ئەوەی من لێی تێگەیشتووم..

نووسینی: کامەران بابان زادە



ئەمەی بەردەستتان لەسەر عەلمانیەت، خوێندنەوەیەکی خۆمە، من دیراسەی (عەلمانیەت)م کردووە لەڕێگەی خوێندنەوەی ژمارەیەك سەرچاوە، لەدوای ساڵی ٢٠١٣ بە ووردی دیراسەی کتێبی (حزب العدالة و التنمية في تركياو القضية الكردية)م کردو لە ئێوارە سمینارێکدا لە باخچەی قاوەخانەی کەلتووری خوێندنەوەم بۆ ئەو بەشە کرد کە پەیوەست بوو بە ستایلی ئاك پارتی و مامەڵەی لەگەڵ عەلمانیەتی تورکیا. دوایی ئەم کتیبە کرایەو کوردیو من پێداچوونەوەی وردم بۆ کوردیەکەی کرد، دوایی نزیك بە ساڵێك لەگەڵ ژمارەیە لە هاوڕێکانم خەریکی وەرگێرانی کتێبی (حوارالاسلام والعلمانيه في كردستان) بووم. دوایی بە هەموو کتیبەکەدا چوومەتەوەو ئێستا کاری وەرگێرانی تەواو بووە، لەوەتەی هاتوومەتە ناو دونیانی خوێندنەوەو بوارە فیکریەکان بە بەردەوامی لەسەر عەلمانیەت و بەریەك کەوتنەکانی لەگەڵ ئایین دەخوینمەوە، هەندی جار دەنوسم. لێرەدا نامەوێ

نوسنیکی ئەکادیمی بنوسم، ئەکادیمیەت بەو مانایەی ئەمڕۆ باوە، لەگەڵ هەر بیروبۆچونێك لە پەراوێزدا ئاماژە بە سەرچاوەو روونکردنەوە بدەم. هێندەی دەمەوێ پوختەی ئەو قەناعەتە بنوسم کە لە ئاکامی خوێندنەوەو بەشداری لە کۆڕو سمینارەکان لەسەر ئەو جەدەلە بنوسم.

خوێندنەوەو بەشداری لە گفتوگۆو کۆڕو سمینارەکان لە ڕووی تیوریەوە بەرچاوڕوونی زۆری پێداوم لەسەر عەلمانیەت، ئەمە سەرەڕای دیراسەیی مێژوییم لە سەر پارتە کوردیەکان و مێژووی ڕەوتی نەتەوایەتی کوردی لە چوارچێوەی ڕۆژنامەگەری و ژیانی حیزبایەتی و خەبات و بەرخودان و....هتد. سەرەڕای نوسینەکانم لەسەر بزاڤی نوێ و هاوچەرخی کورد..

لەلایەکی ترەوە دوو تەوەرە لای من زۆر گرنگ بووە بۆ تێگەیشتن لەو بابەتە. تەوەرەی یەکەم: دیراسەی پارتە ئیسلامیەکان و ڕەوتی ئیسلامی لە وڵاتانی ئیسلامی و ڕەوتی ئیسلامی لە کوردستان بە زۆربەی دیدگا جیاوازەکانەوە سەلەفی و

ئیخـوانیو نـورو جیهـادی...هتـد. تـەوەرەی دووەم بابـەتی ئیسـلامو حـوکمڕانیو چـەمکەکانی حـوکمڕانی لـە مێـژووی سیسـتمی حـوکمڕانی ئیسـلامیو ڕۆژئـاوایی. ئـەویش بـەو حیسابەی بایەخێکی زۆرم بەمێژووی ئیسلامی هەیە بەتایبەت بابەتی حوکمڕانی.

ئەوەی دەینوسم پاڵافتەیە لەو سەرچاوەو بوارانەی لەسەرەوە ئامـاژەم پێـداوە لەگـەڵ ئـەوەی بۆخـۆم لـە مەیـدانی لـە واقیعـی سیاسـیو بەشـداری لـە کـۆڕو سمینـارو دیـدارەکان پێـی گەیشـتووم. دیـارە لێـرەدا مەبەسـتم کـورت دەکەمـەوە لـە چـەند خالێکدا:

یەکـەم / نووسـەرو مێژوونووسـانی ئـەوروپی هەمیشـە زۆربەی چەمکە سیاسیو مەعریفیو فەلسەفیەکان دەگەڕێننەوە بۆ دوو ویستگەی مێـژووی ئەوروپا، یـەکیان بـۆ مێـژووی کـۆن واتـە سـەردەمی یونـانیو ڕۆمـانی، شارسـتانیەتی ئـەغریق لـە پێش زاین، یان دەیگەڕێننەوە بۆ سەردەمی بوژانەوەی ئەورووپی

لە (ڕێنیسانس) لەسەدەی ١٥ بۆ ١٧ی زایینی. دەکرێ بڵێین قسەرکردن لەسەر خورافەی کەنیسەی کاسۆلیکی و سەرەتای سەرهەڵدانی ریفۆرمی ئاینی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڕێنیسانس بەڵام عەلمانیەت وەکو چەمکێکی سیاسی و فیکری و بەشداری کردەیی لە کایەتی سیاسی دەگەڕێتەوە بۆ دوای شۆڕشی فەڕەنسی ١٧٨٩ لە ئەورووپا.

هەیمەنەی دەسەلأت لە ئەورووپا لەپێش هاتنی حەزرەتی مەسیحەوە خوای لێ ڕازی بێ، هەتا زیاتر لە چوار بۆ پێنج سەدەش دوای هاتنی حەزرەتی مەسیح بەدەست ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیەوە بووە. قوستەنتینی گەورە (٢٧٢-٣٣٧ن) بۆ یەکەم جار لە مەرسوومی (میلان)دا دانی نا بە ئاینی مەسیحی وەکو ئاینی فەرمی دەوڵەت، ئەو دانپێدانانە خێر نەبوو پەیڕەوکەرانی ئاینی مەسیحی، بەڵکو پێگەی ئاینی مەسیحی لە ماوەی ئەو ٣ سەدەیە سەرەڕای ئەو هەموو ئەزیەت و ئازارەی بەرانبەر پەیڕەوکارانی هەبووە، پێگەیەکی گەورەی میللی هەبووە، ئەگەر

ئیمپراتۆریەتەکانی پێش قوستەنتین لەو باوەڕە دابوون، پەرەسەندنی ئاینی مەسیحی عەرشی ئیمپراتۆر لاواز دەکات، ئەوە قوستەنتین بە پێچەوانەوە لەو باوەڕە دابووە دانپێدانانی دەبێتە بەهێزکردنی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەت و لەپێگەی مەسیحیەکان سوود وەردەگرێ هەر واش بووە، لە زۆر ڕووەوە بۆ فراوانکردنی پێگەی دەوڵەت بایەخی هەبووە، لێرەوە مەسیحیەکان بوونە پشتیوانی دەسەڵات و پشتیان لە مێژووی ڕابردوویان کرد، کە ئەوان لەسەر شانی ڕەش و ڕووت و چینەکانی خوارەوە مانەوەی خۆیان پاراستبوو.

لێرەوە هێدی هێدی ئیمپراتۆر وەکو خودانی ئاینی مەسیحی و پاریزەری ئەو ئایینە نمایشی دەکرد، کەنیسەو دەسەڵات بوونە دوانەی لێك جیانەبووەوە بۆ دژایەتی زانست و هونەرو داهێنان....

دوای دابەش بوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ئەم حالەتە بەردەوام بوو، کەنیسەشی لەگەڵ خۆیدا دابەش کرد، کەنیسەی

ڕۆما لە خۆراوا کەنیسەی قوسەنتینیە لە ڕۆژهەڵات، گوزارشت بووە لەدوو ناوەندی دەسەڵاتی سیاسی لە ئەوروپا. هەردوولا کەنیسەو فەرمانڕەوایەتی دابەش بووی ئەوروپا ئیلهامیان لە یەکتر وەردەگرت، لەگەڵ سەرەتای تێکەڵ بوونی کەنیسە بە ژیانی سیاسی ناکۆکیە ناوخۆییەکانی دەست پێکرد.

لە هەموو حالەتەکان کەنیسە لەگەڵ دەسەڵاتێکی بارگاوی بە ئەفکاری کەنیسەو لە ژێر ئەفکاری ماق خودایی شەرعیەتی خوایی دەدایە دەسەڵات، بە جۆرێ ڕەعیەت تەنیا ماق گوێڕایەڵی هەبووە. دەسەڵاتیش دەبوایە شەرعیەت لە پاپا وەربگرێ، ئەو شەرعیەت لێوەرگرتنە بووە سەرچاوەی نەهامەتی بۆ کەنیسەو بۆ دەسەڵات، چەمکی دەوڵەتی ئاینی لێرەوە دەستی پێکرد، لێرە پاپا خۆی وەکو تەخویلکراوی خوا دەردەخست، پلێتی ڕەواندنەوەو ڕەشکردنەوەی تاوانی بۆ هاولاتیە بێ ئەقڵە خۆ بە تاوانبار زانەکان دەنووسی و لە بەرانبەردا داهاتی کۆدەکردەوە، لێرە کەنیسە لە پاڵ چینە باڵادەستەکانی دیکە دەوڵەمەند بوو،

ئەمەش ڕەهەندێکی دیکەی گەندەڵی و نابەرانبەری لێکەوتەوە، ئەو تێزە بۆ ماوەی زیاتر ١٠ سەدە وڵاتانی ئەورووپی بە قۆناغێکی ئیستیبدادو تاریکی دا برد.

لە سەدەی ١٥ و ١٦ کۆمەڵێك گۆڕانکاری گەورە لە مێژووی ئەورپا رووی دا، لەوانە سەرهەڵدانی بزوتنەوەی ریفۆرمی ئاینی لە ناو مەزهەبی پرۆتستانت کە کالڤن (١٥٠٩-١٥٦٤)و مارتن لۆسەر (١٤٨٣-١٥٤٦ن) ڕێبەرایەتیان دەکرد. بزوتنەوەی ریفۆرمی ئاینی پرسی دەربازبوونە لە دەسەلاتی کەنیسەو هەیمەنەی کەنیسەی کاسۆلیکی کە بە پڕ کۆتبەتدترین مەزهەبی مەسیحی ناسراوە لاواز کرد.لەو ڕێگەوە شەڕی مەزهەبی دەستی پێکرد، کە پێشتر مەزهەبی پرۆتستانت سەری هەڵدا خۆی لە خۆیدا کۆمەڵێك ئەفکاری ریفۆرمی جیاوازی لەوەی کاسۆلیکی هەڵگرتبوو.

دوای ئەوە لە ساڵی ١٤٩٢ کریستۆف کۆڵۆمبس کیشوەری ئەمریکای دۆزیەوە، ئەو هەنگاوە هاوکات دونیای تازەی

لەبەردەم پەرەسەندنی بارزگانی و پەرت بوونی ڕەوتە ئاینیەکان لە ئەورووپا کردەوە، بیورتاتە دژە کاسیولیکەکان و پرۆستانتەکان ڕوویان لە کیشوەری تازە کرد. ئەو دوو بزوتنەوەیە بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئاینی و بزوتنەوەی دۆزینەوەی کیشوەری تازەو ئەوەی بەدوای خۆیدا هێنا تەکانێکی تازەی وەربەر بزوتنەوەی بوژانەوەو ڕێنیسانس دا.

لێرەوە ڕەوتێکی فیکری پەیدا بوو، کە دواتر لە سیفەتەکانی عەلمانیەت دا خۆی دەدیتەوە.

ڤۆڵتێر (١٦٩٤-١٧٧٨ز) و تۆماس جیفرسۆن (١٧٤٣-١٨٢٨ز) لە پێشەنگی ئەوانە بوون، کە ئەو بیرۆکەیان خستە ناو کۆمەڵگای ئەورووپی... کە پێشتر بیریارانی تری وەکو مکاڤیلی (١٤٦٩-١٥٢٧ز) وەکو پێشەنگایەتی بۆ پتەوکردنی لایەتی تیوری گەشەیان بە بیرۆکەی عەلمانیەت دا.

ناکرێ بانگەشە لەو سەردەمە بۆ بیرۆکەی دابڕینی کاریگەری کەنیسە بکرێ لە کاروباری سیاسی و فەرمانڕەوایەتی بە بێ

دابینکردنـی ئـەو زەمنیەیـەی کەنیسـە بـە تایبـەت کەنیسـەی کاسـۆلیکی سـازی دابـوو لـە دژایـەتی کردنـی زانسـتو دانـانی دادگـا بـۆ سەپێچیکارانو کـۆنترۆڵ کردنـی کایـەی ئـابووری لـە ڕێگەی وەقفەکانی کەنیسەو.. هتد.

کەواتـە کەنیسـە دژایـەتی کردنـی خۆشـگوزەرانی دونیـای خەڵك، دەستخستنە ناو هەموو کایـەکانی ژیـان، دژایـەتی کردنـی ئـەدەبو هونـەر، لەرێگـەی شـەرعیەت وەرگـرتنی دەسـەڵاتی دونیایی بە پاسای مافی خودایی، گەندەڵی سیاسی یەکێکی تر بووە لەو هەهامەتیانەی کەنیسە بەسەر کۆمەڵگای ئەورووپی دا هێنا، ئەمە لە کاتێکدا پاپا لەرێگەی سیستمی سیوکراتی بەڕێوە دەچوو، بـەوەی خـوای گـەورە ئـەو مافـەی پـێ داوەو خـەڵك تـەنیا مـافی گوێڕایـەڵی هەیـە، ئـەوجا وریابوونـەوەی دەسـتەبژێری ئـەورووپی لەرێگـەی کۆمـەڵێك بریـارو سـەرهەڵدانی سـەرەتاکانی چینی ناوەند، پاشان دابەش بوونی کەنیسەو بەشداری کەنیسە لـە شـەڕی خوێنـاوی ئـەهلی لـە ئـەورووپا ئەمانـە ژێرخـانی

بەهێزبوونی مەعریفەی عەلمانی بوون، كە دواتر لە بوار پراكتیكی بەرجەستە بوو.

عەلمانیەت لێرەدا بۆ سنووردانان بۆ دەسەڵات كەنیسەو پیاوەكانی زەرورەت بوو، چونكە ئاین ڕێرەوی خراپی لە ژیانی كۆمەڵگای ئەوروپی وەرگرت. بەجۆرێ ببورە سەرچاوەنی نەهامیەتیەكان. دەربازبوون لێی زەرورەتی سیاسی و كۆمەلایەتی و فەرهەنگی و ئابووری بووە.

ئەگەر بە ئینسافەوە سەیری مەزهەبەكانی كەنیسە بكەین، دەبنین كەنیسەی كاسۆلیكی كە خاوەنی زۆرترین كەنیسەو پەیڕەوكار بووە، تاوانی زیاتر دەكەوتە سەر شانی، زیاتر كاردانەوەكانیش بەرانبەر كەنیسەی كاسۆلیكی بووە. فەرەنساو ئیتالیا لەوانی تر زیاتر ببووە سەرچاوەی كاردانەوە بەرانبەر كەنیسەو زۆربەی بیریارو بزوتنەوە فیكریەكان بۆ دژایەتی كەنیسە خەڵكی ئەو دوو وڵاتە بوون، بۆچی فەرەنساو ئیتالیا زیاتر كاردانەوەی هەیمەنەی كەنیسەی تێدا بەدیار كەوت؟،

چونکە ئەو دوو وڵاتە بەتەواوی لەژێر هەیمەنەی کەنیسەی کاسۆلیکی دابوون. بەجۆرێ پەیڕەوکارانی پرۆتستانت لە وڵات وەدەنران.

ئەو وڵاتانەی ژێر هەیمەنەی کەنیسەی کاسۆلیکی لەبەرانبەردا ئەو وڵاتانەی مەزهەبی پرۆتستانتی تێدا بلاو ببۆوە، دەبینین کێشەیان لەگەڵ ئایین کەمتر بووە، بۆ نمونە ئەڵمانیاو نەمساو بەریتانیا.. سەرچاوەی بیروباوەڕی جیاوازبوون، بەریتانیا لە ڕووی سیسمی سیاسی بە ئاقارێکی هێمنانەتر دا ڕۆیشتووە، هەتا ئستاش عەلمانیەتی بەریتانی و ئەڵمانی بە بیریارەکان و یاساو هەیکەلی حوکمڕانی عەلمانیەتێکی میانەڕەوترە لە هی فەڕەنسا.

دووەم /(سکیولار)و (بێ دینی) و (عەلمانیەت) و (عیلمانیەت) و (لایکی) و هەتا (مەدەنیەت) و (نوێگەری)و (دیموکراتیە)یش کۆمەڵە زاراوەیەکن لەپاڵ عەلمانیەت دێنە پێشەوە، بۆیە پێش ئەوەی بچینە سەر لایەنەکانی دیکەی ئەو

چەمکە، با بزانین بۆ ئەو دیاردەیە لە جیهانی ئەورروپی و دوایی جیهانی ئیسلامی ئەو ناو و ناونیشانانە کامانەن بۆ پرسی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت بەکار هاتوون.

فەرەنسیەکان بە هەمان ناوەرۆکی عەلمانیەت دەڵێن ((لایسازم)).. عەرەبەکان تەرجمەیان کردووە بۆ دوو وشە (عەلمانیەت) و (عیلمانیەت)، کە هەریەکیان گوزارشت لە دونیابینیەك دەکات، لە رووی ناوەرۆکەی تێکدەگیری لەگەڵ واقیعی بەرجەستە، بەڵام وەکو بەرانبەر وشە ئەوروپیەکەی (سیکیولار) بەراوردی بکەین تەرجمەیەکی تەواوە.

واتە بەو پێوەدانگەی کە سکیولار لە ئەوروپا دەیبەخشێ بەرانبەر هەموو جۆرەکانی خوێندنەوە بۆ پێگەو شوێنی ئایین لە بوارە جیاوازەکانی ژیان، ئەوە عەلمانیەت تەرجمەیەکی خراپ نیە، لە ناو ئەو دوو خوێندنەوەیەدا عەلمانیەت بە (ژێری عەین) یان بە (سەری عەین) هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ، لەو بارەوە بۆچونی جیاواز هەیە،لەسەر ڕاستیەتی عەلمانی یان عیلمانی،

هەیە لەو بارەیەوە باوەڕی بە هیچ لەو دوو گوزارشتە نیە، بۆ نمونە سەفەر حەوالی لە کتێبەکەی لەسەر (عەلمانیە) لە دوو بەرگدا بەدرێژی لەو چەمکە دواوە، بە پشتبەستن بە ئەنسکلۆپیدیانی بەریتانی پێی وایە (اللادینی) کە نادینی یان (بێ دینی) کوردی دەکات تەرجمەتەکی دروست بێ.

عەلمانیەت لە زمانی عەرەبیدا زیاتر ترجمەکەی حەرفیە، ئەگینا لەرووی ناوەرۆکەوە، عەلمانیەت هێندەی رووخساری ئایدۆژیو سیاسی وەرگرتووە، ئەوەندە رەنگدانەوەی ئەو بوارە مەعریفیەش نیە کە لەناوەخنی سەرچاوەکاندا هەیە، بەدیدێکی ئەگەر عەلمانیەت لە روانگەی بایەخدان بەم دونیایەوە هاتبێ، بە دابڕینی هەرچی کاریگەری دونیای غەیبو ئایین هێناویەتی، ئەوە زۆر لە پارتو گروپە عەلمانیەکان لە دەسەلات لە موعارەزەییدا لەدونیای سێیەمدا نەك دونیای خەڵکیان پێ ئاسوّدە نەکراوە بەڵکو بوونەتە مایە وێرانەیی ئەم دونیایە. لە ڕوانگەیەوە کە عیلمانیەت لە علیمو زانستەوە هاتبێ، ئەوە.

کەواتــە دەگەینــە ئــەو قەناعەتــەی وەکــو زۆر لــە زاراوەو گوزارشــتەکان دوو خوێندنــەوە بــۆ دەکــرێ بــۆ عەلمانیــەت، ئەوانیش خوێندنەوەی زمانەوانی و خوێندنەوە زاراوەیی یان ناوەڕۆکیە، بە واتانی عەلمانیەت یان علیمانیەت لە رووی واتاوە، مانایەك هەڵدەگرێ، مەرج نیە ئەم مانایە پڕ بە پێستی ناوەڕۆکەکەی بێت.

بــەراوردی نێــوان نــاوەڕۆك و زاراوە، هەیــە کــت و مــت رەنگدانەوەیــەتی و هەیــە لێــك نزیکــەو هەیــە لــە وشــەیەکەوە سەرچاوەی گرتووە، دوو دونیای جیاوازن لەگەڵ بەرانبەرەکەی. نمونــە وەکــو (قیتــار) سەرچــاوەی وشــەیەکە شــێتکەو نــاوەڕۆك شتیکی ترە.

پەیوەنــدی نێـوان عەلمانیــەت لــە رووی زاراوەو ناوەڕۆکــەوە کۆمەڵێك دژ بە یەك هەیە، لەوانە عەلمایەت بە (سـەری عـەین) کە بەمانایی دونیـایی: واتـە نـاڕووحی و نـادینی، لێرەدا عـەلمانی دژی پــیرۆزی دەوەســتێتەوە. لەراســتیدا بــە خوێندنــەوەی

سەرچاوەکان بۆ عەلمایەتو مومارەسەی عەلمانیەت، زۆر لە عەلمانیەکان لە باوەڕە دا نین، داماڵینی دینو پیرۆز بێ لە ژیانی مرۆڤەکان بەڵکو داماڵینی دینو پیرۆزیەکان لە سیاسەتو حوکمڕانی. لە کاریگەری بەسەر یاساو ئیدارەدانی کۆمەڵگا، بەڵام لە بواری تاك مرۆڤەکان ئازادن لەوەی مومارەسەی دین بکەن.

یان عیلمانیەت بە (ژێری عەین) لەرووی زمانەوە لەگەڵ لە زانستی بوونو دونیای ئەزموونو تاقیکردنەوە یەکانگیرە، کەچی لە ناوەرۆکدا گەشەسەندنی زانستو مەعریفە هاوئاست نیە لەگەڵ دونیای بایەخدان بە عیلمانیەت. هیچ مەرج نیە سیستمە عیلمانیەکان لە بواری زانستو پێشکەوتن هەنگاوی بەرچاویان هەبێ، یان عیلمانیترین سیستم لەبەرانبەر پڕ زانستو مەعریفەترین سیستم بێ. زۆرسیستمو دەوڵەتی پڕاوپڕ لە بانگەشەی عەلمانی هەیە، کە لە ناوڕۆکدا لە دواکەوتوویی و بێ مەعریفەیی دا دەژی.

کەواتە لێرە هەر ساتێ بنوسین عەلمانیەت یان عیلمانیەت ئەوە هەردوو مەبەست دەگەیەنیٚ و پێویست ناکات هەردوو وشە لە بە دوای یەکدا بەکاربهێنین. کات نەگرین لە ئاست ناوهێنانی ئەو گوزارشتە بە عەلمانی پێمان وابێ ئەوەی دیکە راست ترە یان بە پێچەوانەوە.

بە گەڕانەوە بۆ دونیای سکیولاری رۆژاو دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە عەلمانیەت لە بەرانبەر ئەو تێگەیشتنانە دێ.

یەکەم/ ناڕووحی و نادینی، لێرەدا عەلمانی دژی پیرۆزی دەوەستێتەوە.

دووەم/ عەلمانی دەچێتە پاڵ ئەقلانی یان سوودمەندی بەشێوەی گشتی یان تایبەت.

سێیەم/ هەندێ جار وشەی عەلمانی بە مانای ناپیرۆز "مدنس" و irreligious "بەکاردێت، کاتێ عەلمانی بەکاردێت، واتە لەواقیعدا شتێکە پەیوەندی بە ئاینەوە نیە..

چوارەم/ هەندێ جار بۆ پاشەکشە یان وازهێنان لە ئیمان و بیروباوەڕی ئاینی و کلاسیکی قۆناغێکی دیاریکراوە بەکاردێت.

لەگەڵ ئەوەدا دوای بە دواداچوون فیکری خۆمان کۆبکەینەوە لەسەر پیناسەو ناساندن بۆ عەلمانیەت دوایی دەگەڕێنەوە بۆ سەرەتا بەوە عەلمانیەت یەك شێوەو روخسارو دیدگا نیە، بە پێی بۆچوون و شرۆڤەی بیریارو ژینگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری هەتا لە ئەورووپا گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەمە لە ئەورووپا، ئەدەی لە دونیای ئاسیاو ئەفریقیا، لە دونیای سێیەم، بە دڵنیاییەوە چەندان مۆدیلی عەلمانیەت هەیە.

سێیەم /سەرەتای بیرۆکەی عەلمانیەت و کاریگەریەکانی لە ڕێگەی تورکە لاوەکان، یان کۆمەڵی ئیتحادو تەرەقیەوە هاتنە ناو دەوڵەتی عوسمانی، ئەستەنبوڵ بووە یەکەم ویستگەی سەرهەڵدانی ئەو بیرۆکەیە، قسەمان لەسەر چۆنیەتی هاتنی ئەو بیرۆکەیەو گەشەکردنی دیدی تازە نیە لە ناو دەوڵەتی عوسمانی کە لە چارەکی کۆتایی سەدەی ١٩ەوە مقمقۆی خستە ناو والی و فەرماندە سەربازی و بەرپرسە ئیداریەکانی دەوڵەتی عوسمانی،

سەرەتای کردنەوەی دەرگای ئیدارەدانی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ سەرەتای هاتنە سەر حوکمیّ سوڵتان عەبدولحەمید لە ساڵی ١٨٧٦ بە دامەزراندنی ئەنجومەنێك لە شێوەی پەرلەمان و دەستوورێك سەر شێوازی ئەوروپی، دوایی پەشیمان بوونەوەی سوڵتان لەو دوو گۆرانکاریە، بووە سەرەتایەك بۆ ململانێی چۆنیەتی ئیدارەدانی دەوڵەتی عوسمانی، تا جارێکی تر هەم سوڵتان عەبدولحەمید خۆی رێکخستەوەو هەم ئیحادیەکان بۆ ململانیەتی تازە، دوا جار کۆدەتای ١٩٠٨ی بە دواداهات، لێرەوە ئایدۆلۆژیای ئیتیحادیەکان لە عەلمانیەتیەك کە داواکاری دەوڵەتی موئەسەساتی بووە تاوێتە بوو لەگەڵ عەلمانیەتی ئیستبیدادی و ناسیونالیسیتی تورکی.

بەلام وەکو بیریاری تونسی "راشید غەنوشی" دەڵیّ: لەئەوروپا سوڵتە گیری خواردبوو بەدەست دینەوە، عەلمانیەت هات بۆ رزگارکردنی سوڵتە لە دەستی دین، لای ئێمە دین گیری خواردووە بە دەست سوڵتەوە.

لە واقیعی بەرجەستە ئەم قسەیەی غەنوشی زۆر راستە، دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتێکی دینی نەبووە بەو ناوەرۆکەی لە

ئەورووپا هەبووە، سوڵتان شەرعیەتی لە ئاینەوە وەرنەگرتووە، بەو مانایەکی دامەزراوەیەکی ئاینی هەبێ‌و شەرعیەت بە سوڵتان بدات، ئەوەی هەبووە، کەلتورێکی حوکمرانی درێژکراوەی سەدەکانی ناوەڕاست بووە، ئەم سیستەمە پشتاوپشت بووە، دامەزراوەیەکی سەربازی‌و کارگێری گەورەو فراوان بووە، بەڵام لە پەیوەندی نێوان دین‌و دەسەڵات زۆر جیاواز بووە، لێرەدا ئیسلامی نە هاوشێوەی پاپاو دامەزراوەی کەنیسەی هەبووە، نە دەسەڵات سیوکراسی بووە، نە دادگای تەفتیش هەبووەو نە بلیتی ناوانرەوێن‌و نە وەقفی زۆرو دارایی زەبەلاح‌و نە دەیستێوەردان لە کاروباری دەولەت‌و مونافسەی نێوان دەسەڵاتی دینی‌و دەسەڵاتی دونیایی، هەتا لە رووی پشتگیری کۆمەڵگا بۆ عەلمانیەت دوو دونیای زۆر جیاواز بووە، عەلمانیەت لە ئەورووپا زوو لەلایەن کۆمەڵگاوە پێشوازی لێکرا، کەچی لە دونیا ئیسلامی هەر بەردەوام هەڵگرانی بیری عەلمانیەت کەمینە بوون.

ئاینی ئیسلام وەکو بیرکردنەوەو ئەعیدەوی خواپەرستی و بەشداری ئاینی ئیسلامی لە جومگەکانی حوکمرانی لەگەڵ ئەوەی لە ئەوروپا هەیە دوو دونیای جیاواز بوون، ئەی پرسیارەکە لێرەدایە پاساوی عەلمانیەتی ڕۆژهەڵاتی دونیای ئیسلامی چی بووە، کامانە ئەو دروشمانەی دژی دین هەڵیانگرتبوو؟؟.

ئەوەی ببورە دروشمی ئیحادیەکان، وەکو هێزێکی عەلمانی بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی سوڵتان بووە، هیچ دامەزراوەیەکی ئاینی هەمیشەیی نەبووە ئیتحادیەکان دژی بووەستنەوە، ئایین، ئەوە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەی زمانحالی ئەو ڕەوتە هەیە سەبارەت بە ئاینی ئیسلام و کەسایەتی پێغەمبەر درودی خوای لێ جۆرێکە لە گێچەڵ پێکردن و شەڕ پێ فرۆشتن، ئەگینا ئەوەی لەوێدا هاتووە بەوەی ئیسلامی ڕێگربووە لەبەرانبەر پێشکەوتن و شارستانیەت. لێرەدا کۆپیەکی ڕاستەوخۆی ئەو دیدە ئەوروپیەیە گواستراوەتەوە بۆ گوتاری

عەلمانیەتی ڕۆژهەلاتی لەسەر ئەوەی ئایین ڕێگرەوە دەبێ پەراویز بخرێ، هەموو ئەو پاساوانەی لەسەر لەسەر دژایەتی ئایین کرابوونە دروشم، لە دوو خوێندنەوە بەدەر نەبوون، یەکەمیان: وێناکردنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم وەکو دیکتاتۆرو پێشێلکاری سیستەم و هەڵوەشێنەوەرەی پەرلەمان و کارکردن بە دەستوور. دووەم: تاوانبارکردنی ئیسلام بە جۆرێ کە پاساوەکانی ئەو تۆمەتبارکردنەوە یان مومارەسەی مسوڵمانەکانە یان دانانی وێنایەك بۆ ئیسلام بەجۆرێ ئەو وێناکردنە مەسیحیەت و دامەزراوەی کەنیسەی کاسۆلیکی دەشێ نەك بۆ ئیسلام و دامەزراوەکانی.

لەڕێگەی ئیحادو تەرەقی عوسمانیەوە عەلمانیەت گوازرایەوە بۆ ناو کورد، بەشێکی بنەڕەتی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ئیحادو تەرەقی کورد بوون، دوای کۆدەتای ۱۹۰۸ تورکە ئیتیحادیەکان ئاراستەی حوکمڕانیان بەرەو ناسیونالیستی تورکی برد، کوردەکان بە ئایدولۆژیای عەلمانیەتی ئیتیحادو تەرەقی و بە

كارادنەوەى ئيتيحاديە توركەكان كۆمەڵەو ڕێكخراوەى سياسى كورديان دامەزراندو سەرەتايەكيان لە خەباتى نەتەوەيى بە ئايدۆلۆژيانى عەلمانى لە ناو كورد دەست پێكرد.

لێرەوە ئاڕاستەيەكى تازە بۆ بزاڤى نەتەوەيى كوردى زياد بوو، ئەويش ئاراستەيى نەتەوەيى بە خوێندنەوەى عەلمانيانە، پێشتر بزاڤى نەتەوەيى لە ناو كورد لەسەردەستى شێخ عوبێدوڵڵاى نەهرى لە ساڵى ١٨٨٠ دەستى پێكردبوو، ئەو بزاڤە ئاوێتە بوو بە (نەتەوايەتى – ئيسلامى بە خوێندنەوەى سۆفيگەرى).

بە درێژايى نيوەى يەكەمى سەدەى بيستەم ئەو دوو ئاراستەيە نەتەوەييە لە ناو كورد هەبووە، ئاراستەيەك نوخبەى خويندەوار لە ژێركاريگەرى خوێندنەوەى ئەورووپا بۆ ژيانكردن‌و ئاراستەيەكى ئيسلامى خۆماڵى، شێخانى تەريقەت‌و زانايانى ئاينى ئيسلامى نوێنەرايەتى دەكرد.

ئاڕاستەى ئيسلامى بۆ بزاڤى نەتەوەيى لە بزاڤە ميلليەكەى مەلا سەليمى بەدليسى ١٩١٤و شێخ سەعيدى پيران‌و كوڕانى

شێخ عوبیدوڵلای نەهری‌و ژمارەیەك پارت‌و ڕێکخراو بەرجەستە بوو.

ئاراستەی دووەم لە کوڕانی بەدرخان‌و ریبەرانی کۆمەڵی خۆیبوون‌و هیواو ژێکاف بەرجەستە بوو.

ڕاستە ئەم دوو ئاراستەیە لە بزاڤی کوردیەتی هەبووە بەڵام ناکرێ ئەو پۆلینە وەکو دابەش بوونێکی کۆنکریتی وەربگرین. لە نێوان ئەو دوو ئاراستەیە ئەگەر وەکو ڕەش و سپی وێنەی بۆ بکێشین وەکو شێوە قاوەیی‌و بۆری هەبووە.

ئەوەی دەمێنێتەوە لێرەدا ئامـاژەی پـێ بکـەین، وەکـو خەسـڵەتی بەشـداری هـەردوو ڕەوتـی ئیسـلامخوازی و عەلمانیخوازی کورد لە بزاڤی سیاسی‌و ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی کورد لەو قۆناغەی هەردوو ڕەوت بە ئاشکرا لە بزاڤی کوردایەتی هەبووە.

سـەبارەت بـە ڕەوتـی عـەلمانیخوازی کـورد ئـەوە هـەر لەسەرەتاوە وەکو نوخبە بەدیارکەوتووە، لە بزای ڕۆژنامەگەری‌و

پێکهێنانی پارتی سیاسی و بەشداری لە بزاڤی مەعریفی ڕەنگی داوەتەوە، بەڵام بە نوخبەیی ماوەیەوە، کاریگەری ئایدۆلۆژیای بەڕێوەچوونی بزاڤی مەعریفی و ژیاری ئەورووپی لەو قۆناعە بەسەر ڕەوتی عەلمانیخوازی کوردیەوە ڕۆشن و دیارە.

خاڵی لاوازی ڕەوتی عەلمانیخوازی کورد بە تایبەت ڕەوتی سیاسی لەو قۆناغە دەستەوەستان بووە لە سەرکردایەتی کردنی بزاڤی میللی و وەکو نوخبەیەکی سیاسی دابڕاو لە بەگەڕخستنی جەماوەر ماوەتەوە، دەستەوەستانی کۆمەڵەی ئیستیقلال بەسەرۆکایەتی خالد بەگی جیرانی و پەنابردن بۆ شێخ سەعیدی پیران لە شۆڕشی ١٩٢٥ لە کوردستانی باکوردو دەستەوەستانی سەرکردایەتی کۆمەڵەی ژێکاف لە بەگەڕخستنی جەماوەرو پەنابردن بۆ قازی موحەمەد، یەکێك لە گوزارشتە دیارەکانی دەستەوەستانی ئەو ڕەوتەیە لە بەگەڕخستنی هەموو چین و توێژەکان لە سایەی ئەو ئایدۆلۆژیایە.

لە خەسڵەتە باشەکانی ڕەوتی دینداری لە بزاڤی سیاسی کورد، توانایەکی باش بووە بۆ بەگەڕخستنی جەماوەر بۆ بەگژاچوونەوەی داگیرکەران، بەڵام دەستەوەستان بووە لە دابینکردنی پرسنسیپی شۆڕش و شێوازی بەگژاچوونەوە.

دەستەوەستان بووە لە دارشتنی تیوری کوردایەتیەک کە ئاوێتە بێت بە دین و تێزی ئیسلامەتی بۆ ئەو ڕەوتە زۆر لاواز بووە لە دارشتنی ئەدەبیات و گرتنە خۆی توێژە خوێندەوارو خاوەن خولیای کورد. بۆ هەمیشە شۆڕش و ڕاپەڕینی عەفەوی و بێ پرنسیپ لە ژێر سایەی ڕێبەرایەتی ئەم توێژە ئایینیەی کوردستان پەیدا بووەو بە زوویی کۆتایی هاتووە.

ئەمڕۆ کاتێک دەمانەوێ بە مێژووی بەشداری بیری ئیسلامەتی لە بزاڤی سیاسی کودایەتی دا بچینەوە، ئەم بەشداریە لەسەر توێژە میللیە گشتیەکان زۆر کاریگەرە بەڵام لەسەر نوخبە کەمترە، لە ناو پانتایی جەماوەر کاریگەرەو لەسەر لاپەڕەی چاپکراوەکان کەمە. ڕاستە بەشداری کۆمەڵێک

موفەسیرو شەرعزانمان هەیە، کە ڕۆڵیان دیوە لە هوشیارکردنەوەی کۆمەڵگای کوردی بە ئایینەکەی بەس ئەوانە زیاتر خۆیان لە قەرەی ئەو باسانە نەداوە کە ڕەهەندی نیشتیمان‌و نەتەوە، داگیرکردن‌و چەمکە سیاسیەکان لە خۆ دەگرن.

لێرەوە موحەمەدی جەلی زادە دەبێتە زانایەکی کەم وینە لەو بوارەدا، کە خەمی نەتەوەو نیشتیمان‌و خەمی دینداری پێکەوە گرێداوە. لەکاتێکدا ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە ناو نەتەوەکانی دەوروبەرمان هەبووە، لەگەڵ سەرەتای سەرهەلدانی چەمکی تازە لە سەر نەتەوە، لە کۆتایی سەدەی رابردوو، جەمالەدینی ئەفغانی‌و موحەمەد عەبدە و موحەمەد رەشید رەزا و عەبدولحەمید بادس‌و عەبدولرەحمانی کەواکبی ئەو بۆشاییەیان لە بزاڤی سیاسی‌و مەعریفی عەرەبی پڕ کردۆتەوە.

چوارەم / پەیوەندی عەلمانیەت لەگەڵ لیبرالیەت‌و مەدەنیەت‌و دیموکراسی، ئاریشەیەکی ترە لە سەر ئەو پرسە.

چونکە رەوتی ئیسلامی لە کوردستان لەسەرەتاوە مامەڵەی تەندروستو ئەکادیمی لەسەر ئەو چەمکانە نەکردووە، چونکە رەوتی عەلمانی لە کوردستانو ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەش کراوە، چونکە رەوتی عەلمانیەت لە یەك کاتدا بانگەشەی بۆ دیموکراتیەتو لیبرالیەتو دیموکراسی کردووەو لە واقیعشیدا ئیستیبدادو چەوسانەوەی مومارەسە کردووە. لە دیدی رەوتی ئیسلامی زۆری دەوێ هەتا جیاکردنەوەی ئەو چەمکانە لە فەرهەنگی رەوتی دینداری هەرێمی کوردستان لێك جیا دەکەیتەوە.

لیبرالیەت کە گوازرشت لە ئازادیو دابەشکردنی دەسەڵاتەکانو سەرەوەری ئاساو ئازادیە کەسیەکان دەکات، لە سەرچاوەو مەوسوعیەکان چەمکیکی جیاوازە لەگەڵ عەلمانیەت.

مەدەنیەت کە پەیوەندی بە دەوڵەتی هاوڵاتیو هاونیشتیمانیەوە هەیە، پەیوەندی بە یەکسانی هاوڵانیانەوە هەیە بەرانبەر یاساو ئەركو مافەکان، پەیوەندی بە کارابوونی رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیەوە هەیە، پەیوەندی بە

دژایـهتی تونـدو تیژیـهوه هەیـه لەبەرانبـەر جیاوازیـه رەگـەزیو ئاینیو نەتەوەییو رەنگو ئایدۆلۆژیاو بیروبۆچونە جیاوازەکان. دیموکراسی بە گوزارشتی مەوسوعەو لە دیدی بیریارو زانایانی بواری فیکریو حوکمڕانیو لـه مومارەسـەی وڵاتـانی ئـەمریکیو ئـەوروپی واتــه میکیانیزمێـك کـه بتـوانی لـەو رێگـەوه چـەند پرنسپییك دابنێ بۆ پێشبڕکێی لایەنە سیاسیەکان بۆ ئالوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات. یان فەرمانڕەوایەتی بە نوێنەرایەتی گەل، ئەم نوێنەرایەتیەش لە رێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە دەبێ. ئینجا داڕشتنی یاساو پەسندکردنی پەیڕەوکردن لە سیاسیەتی گشـتی لەریگـەی ئـەو نوێنەرانــەوە دەبـێ کـه متمانـەی گـەل وەردەگرن.

دیموکراستیرین رژێمی حـوکمڕانی ئـەو رژێمەیـە کـە باشـترین نوێنەرایەتیو تـوخترین رەنگدانـەوە بیروبۆچوونو خواسـتەکانی گـەڵ بـێ. لـه بەرانبـەردا ئـازادی سیاسـیو فیکـری فەرهـەم بـۆ قسەکردن لە سـەر چۆنیەتی حـوکمڕانی. لێرەوە دەردەکەوێ کـە

دیموکراسی تەنیا دروشم نیەو ناسینەوەی ڕژێمە دیموکراستیەکان.

چەمکەکانی دیموکراسی و مەدەنیەت و لیبرالیەت چەمکی جوانن، لە مومارەسەی تەندروست لەگەڵ ئەو چەمکانە وڵات بەرەو پێش دەڕوات.

بەڵام دەبێ ئەوەی وریای بین، مەرج نیە ئەو ڕژێمە عەلمانی بێ دیموکراسی بێت و مەرج نیە ئەو ڕژێمەی دیموکراسی بێ مەرجە عەلمانی بێ، هەتا سەرهەڵدانی بیری عەلمانیەت لە ئەوروپا نەبەستراوبۆوە بە دیموکراسی و مەدەنیەت و لیبرالیەت، ئەمە ڕژێمە دیکتاتۆریەکان بوون لە پاڵ مومارەسەی ئیستیبداد بانگەشەی دیموکراسیان کردووە، بەپاڵ عەلمانیەت پرۆپۆزسیونەکانی خۆیان بە تایبەت لە ڕەوتی ئیسلامی بە ڕێگەی توندوتیژی لە ناوبردووە، چەمکی مەدەنیەتیان لە ڕەقس و شەماو یانەی شەوانە کورتکردۆتەوە، چەمکی لیبرالیەتیان لە تەشهیرکردن بە ئایین گوزارشت کردووە.

ئەمــە لــە کاتێکــدا عەلمانیــەت لەگــەڵ دیموکراســی و مەدەنیــەت و لیبرالیــەت جیــاوازن، مــەرج نیــە پێکــەوە لەگــەڵ کۆببنەوەو ناکرێ ئەوانە باجی عەلمانیەت بدەن. یان بە گشتی هیچ چەمك و زاراوەو ئایدۆلۆژیەك باجی یەکتر بدەن.

پێنجەم / لەوەتەی بیرم دێ، لە کوردستان عەلمانیەت یانی بێ دینی و خوانەناسی، عەلمانیەت واتە بێ ئیمانی، لە دیدی ئیسلامیەکانی کوردستانیش لە دوای ڕاپەڕین، ئەم زاراوەیە وەکو کوفرو بەتکردنەوەی ئایین وێنا کراوە، عەلمانیەت واتە بەرۆژاوایی کردنی سەراپای ڕەهەندەکانی ژیان، عەلمانیەت واتە ڕەتکردنەوەی کەلتووری خۆماڵی بە چاك و خراپیەوە، ئەمە بەشێك لە هەقیقەتی تێدایە بانگەشەکارانی عەلمانیەت لە کوردستان بە گوتارو هەلسوکەوتیان ئەو قەناعەتەیان لای بەرانبەریان دروست کردووە.

لە کوردستان عەلمانیەت تێکەڵ بە بیری مارکسیەت و ئیلحادی بووە، لە دیدی ئیسلامخوازای کوردستان عەلمانیەت واتە خستنەڕووی ئایین وەکو تێزێکی دواکەوتوویی، کۆسپ

لەبەردەم دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی، ئیستیغلاکردنی هەستی دینـدارانی خـەڵکی کوردسـتان، چـەندان گوزارشـتی وەکـو: کوردسـتان بـە زەبـری شمشـێر لەلایـەن مسـوڵمانەکانەوە کـاتی خۆی داگیر کـراوە، لـە مەینەتیـەکانی کـورد بـرا مسـوڵمانەکانی دەرودراوسیێ زۆر خراپ بوون لەگەڵ کورد، ئاینی ڕەسەنی کورد زەرادەشتیە. سـەلاحەدینی ئـەیوبی دەوڵـەتی بـۆ کـورد دروسـت نـەکردووە، سـەلاحەدین خزمـەتی عـەرەبی کـردووە نـەك کـورد، ئیسلام ڕێگرە لەبەردەم پێشکەوتن، هۆکارە بۆ توندوتیـژی دژ بە ژنـان. کوردسـتان وڵاتێکـی فـرە ئـایین و مەزهەبـە، زیـادبوونی پێگـەی ئـایین لـە حـوکمڕانی و دامـەزراوە فەرمیـەکان و کایـە کۆمەڵایەتیەکان یانی دامەزرانـدنی دەوڵـەتی دینـی، ئەمـەش تێك دەگیرێ لەگەڵ دەوڵەتی مەدەنی.

لێـرەوە پـرۆژەی ئیسلامخوازی تێکەڵ دەکرێ بە دەوڵـەتی دینی و دژایەتی هاوڵاتی بوون و مافخواردنی کەمینە ئایینـەکان و بـرەودا بـە توندوتیـژی..لێـرەوە ڕەوتـی عـەلمانیخوازی کـورد،

ئيسلام بە شێوازێك وێنا دەكات، كە نە دەچێتە خەسڵەتی ئيسلامو شوناسی ئيسلامو نە ديدی ئەم سەردەمەيە.

ديدی سەدەكانی ناوەڕاست، هی زەمەنی ڕابردوو، تێكەڵ بە ديدی عەلمانی بۆ ئاينی مەسيحی، ئەوجا ئاينی مەسيحی سەدە نۆزدەو بيست نا، بەڵكو ديدی ئاينی عەلمانيەت بۆ ئاينی مەسيحی لە پێش سەدەكانی چاخی ڕێنيسانيسی ئەورووپی.

من پێم وايە هەردوولا واتە ڕەوتی عەلمانی خوازی كوردیو ڕەوتی ئيسلامخوازی كورد، شەڕو ململانێيەكی تەندروست ناكەنو لە چەند شێوازو چۆنيەتی ناكۆكی هاوبەشن وەكو:

يەكەم/ هەردوو پێويستيان زياتر بە ناسينی ئەو بيربۆچوونو چەمكانە هەيە، كە بەرگری لیٚ دەكەن، يان دژی وەستاونەتەوە، واتە ڕەوتی ئيسلامخوازی زياتر پێويستی بە ناسينی ئيسلام هەيە، بە تايبەت لەسەر چەمكەكانی پەيوەست بە حوكمڕانی.. هەروەها پێويستی زياتری بە ناسينی عەلمانيەتو مەدرەسە جياوازەكانیو جياوازی لە نێوان عەلمانيەتو ديموكراتيەتو مەدەنيەتو نوێگەری هەيە.

لەبەرانبەرانبەردا ڕەوتی عەلمانیخوازی کورد پێویستی زیاتر بە وردبوونەوە هەیە لەو چەمکانەی پەیوەستن بە عەلمانیەتو داکۆکیان لێ دەکاتو هەروەها پێویستی بە ناسینی زیاتری ئیسلامو مێژووی ئیسلام هەیە.

دووەم/ هەردوو ڕەوت لە هەرێمی کوردستان لەوەدا هاوبەشن کە خوێندنەوەی زەمەنێکی جیاوازو واقیعێکی جیاوازیان هەیە بۆ عەلمانیەتو ئیسلام، هەردووک لە واقیعی ئێستاو ئەم سەردەمە ناکۆڵنەوەو نمونەو ئەو مەعریفەیەی قەناعەتیان لەسەر بنیات ناوە، باککراوندە بە مێژوو، هەروەها باککراوندە بە ژینگەیەکی جیاواز. دەبێ جارێکی تر خوێندنەوەی ئەم سەردەمو ئەم هەرێمەیان پێ بێ بۆ گفتوگۆ.

سێیەم/ ناتەواوی هەردوو ڕەوت لەوەدا یە کۆڕ دەبەستنو دەنوسنو چاوپێکەوتن دەکەنو ڕوونکردنەوە لەسەر یەك دەدەن، هەندی جار زمانی زبر بەکاردەهێنن، بەڵام ئەوەی پێویستە

ئەنجامی نادەن، ئەویش گفتوگۆی ڕاستەوخۆو هێواش لەسەر خۆیە.

ئەوەی خاڵی ئەرێنییەو دەبێ پەرەی پێ بدرێت، ئەوەی لایەنی ئیجابییەو دەبێ پێشوازی زیاتر لێ بکرێ لەم ململانێیە:

یەکەم/ لە ڕووی سیاسیو تەدەخولاتی پارتە سیاسیە عەلمانیەکانەوە کەمتر ناکۆکی ئیسلامی – عەلمانی زەق دەکرێتەوە، ئەمە لەناو ڕەوتی ئیسلامی خەریکە ببێتە ئەرکی توێژێکی دیاری کراو بەناوی بانگخوازان، لەناو ڕەوتی عەلمانی زیاتر نوخبەی فیکری لەسەر ئەو پرسە دێتە سەر خەت. واتە خەریکە ناکۆکی و ڕکەبەری عەلمانی – ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان لە ئەرکی پارتە سیاسیە ئایدۆلۆژیەکانەوە ببێتە ئەرکی کاراکتەرەکانی دەرەوەی کایەی سیاسی. ئەمەش کارێکی باشە.

دووەم/ وەکو کۆتایی سەدەی ڕابردوو، هەندێ جار ناکۆکی ئیسلامی – عەلمانی توندوتیژی تێ دەکەوت، بەریەك کەوتن زۆر بوو، ناکۆکیەکان دەگەیشتنە زبری، بەڵام ئیستا خابۆتەوە، زیاتر

بۆتــە ململانێــی ئاکــارو کــردار، ســەردەمی دروشــم بــازی کــاڵ بۆتەوە، کۆمەڵگای کوردیش هوشیارانەتر مامەڵە دەکات.

سێیەم/ خۆیەکانی ڕاگەیانـدن و تەکنـەلۆژیا ڕۆڵـی بەرچاوی هەیــە، لــە خســتنەڕووی ئــەوەی هــەردوو ڕەوت لەڕێگــەی کەرەستەکانی ڕاگەیاندنەوە پێیان باشە بیگەیەنن.

چــوارەم/ تەقســیمبەندی کۆمــەڵگا لەســەر ئینتیمــانی ئایــدۆلۆژیو تێکــەڵ کردنــی بــە ئینتیمــای سیاســی، شــکڵو شێوازی تازەی وەرگرتووە، دیواری نێوان ئەو دوو دیدگایە لە چاو لەیەکتر سوورکردنەوەوە، بۆتە ستایلێك لە نێوان مۆڕە لەیەکتر کترو یەکتر قبوڵ کردن.

**لە کۆتاییدا وای دەبیم:**

**یەکەم/** ئەمەی لە ناکۆکی عەلمانی – ئیسلامی هەیە لە کوردستان لە ناو نوخبە نەچۆتە خواریّو نەبۆتە کەلتووری لێکترازانی نێوان ناکەکانی کۆمەڵگا، هەر قوڵ کردنەوەیەك بە ئاراستەی لێکترازانی کۆمەڵگا بە زیانی هەردوولا دەشکێتەوە.

**دووەم/** جۆری ئەو دیدەی پێشکەش دەکریّ لەسەر عەلمانیەت لەلایەن عەلمانیەکانو ئیسلام لە لایەن ڕەوتی ئیسلامیەوە زۆر پێویستە، بە گوزارشتی ئەمڕۆ ئەو کەوالیتەی دەخرێتە ڕوو. چونکە هەم ئیسلامو هەم عەلمانیەت لە ئەنجامی پرۆسەی مومارەسەو شرۆڤەی جیاواز دەیان قوتابخانەو مەزهەبی جیاواز پەیدا بووە ئەمە بۆ هەردووکیان ڕاستە، بۆیە پێویستە ڕەوتی عەلمانی لە هەرێمی کوردستانو ڕەوتی ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان ئەزموونی دەرووبەرو وڵاتان کۆپی نەکەن، بەڵکو لە شێوازێك بگەڕێن دەروازەی پێکەوە ژیانو یەکتر قبوڵ کردنیّ تێدا بەرجەست بکریّ.

کوردیش وەك باقی میلەتانی ناوچەکە لە کۆتایی سەدەی ١٩ بیری عەلمانی پێگەیشت،لە سەرەتای سەدەی بیستەم ئەو بیرە بەرجەستە بوو لە هەندێ جم وجۆڵی سیاسی وفکری وئیداری ویاسای تا گەیشتە دروست کردنی کۆمەڵەو دەستەو حزب،بەلام بۆ هەر هەمویان مێژوویەکی هاوبەش لە دروست بوونی زەمینەیەك بۆ جێبوونەوەی عەلمانیەت لە نێو ئەو ڕەوشەنبیرانی ئەو میلەتانە، هەولدەدەین بەکورتی ئەو سەربردانە باس بکەین کە خۆی لە دیاری کردنی ڕیشەیەکی فلسفی عەلمانی و هۆکارەکانی سەرهەلدانی وچۆنیەتی هاتنی بۆ جیهانی ئیسلامی و ئینجا پیناس و سروشتی عەلمانی وکاریگەریەکانی بەسەر کوردستان بە سەلبی ئیجابیەوە باس دەکەین .

**ڕیشەی فەلسەفەی عەلمانیەت:**

هەرچەندە لایەنگرانی عەلمانی لە تەقەلایەکی بێووچانن بۆ ئەوەی خۆیان لە بیدینی دورخەنەوە،بڵێن عەلمانی لەگەل

مولحیدی لیکجیایە، بەلام نەیان توانیە،چونکە ڕیشەکەی لەوێ دێت ئەگەر چی لەو سەردەمە عەلمانی باوەڕداریش گەلێ زۆرە لەهەمو ئاینەکان، ڕاستە مولحید و گوماندار وبێئاین و..هەموی لیکجیان،خەریکە بڵێین مولحیدی تەواو نەبوونی هەبوە نە دەبیێ،دوای ووردبوونەوە لەنوسینەکانی ئەوانەی ناویشیان نراوە مولحید دەردەکەوێ زیاتر گومانیان هەبوە نەك مولحیدی تەواو، کە بۆچوونەکانیان بە ووردی دەخوێنیەوە وایان لێبەدی ناکرێ،هەندیکیان باوەڕێکیان هەیە لەگەل ئەو سەردەم ناگونجێ،سوکرات و جۆردانۆ و.. تەنانەت زینفۆن(٤٣٠ پ ن)یش کە بە مولحد ودەهری ناوزەد کراوە کەچی ئەو بەرجەستە کردن وبەمرۆڤ چواندنی خوای ڕەتکردەوە،ووتی ئەورووپا وادەزانن چاوی خودا شینە،ئەفریقی بە ڕەش،ئاسیای سەروو چاوی خودا بچوك..،ئەوانەی ڕەت کردەوە ناویان نا مولحیدە،ئەوانی تریش زیاتر (دوودلن نەك مولحد) هەتا (دیگۆراس)کەبەیەکەم مولحدی ئەورووپی هەژمار دەکریت

دەردەکەوێ مولحد نەبوە دوودلی وگومانی هەبوە،بۆیەش ئەو ئامارە زیاتر نزیکە لەڕاستی کەدەڵێت ئیستا ڕێژەی مولحید تەنها لە٢٪ی جیهانە،واتە مولحیدی تەواو نەك متردد[١].

هەندێ ئینسکلۆپیدیا و توێژینەوەی تایبەت بە فەلسەفەی مێژووی یەکەم فەیلەسوفی دژ بە (ئایین و باوەڕ) دەگێرنەوە بۆ مەدرەسەی هندی و دەڵێن یەکەم مولحید (سومخیا) لە (٤٥٠ پ ن) بوە، بەشێکی تر بۆ مەدرەسەی یۆنانی لەوێش بۆ حەکیمی گەورە (پیلاس ٥٥٠پ-ن) یان دیاگراس ٥٠٠ پ-ن، ناوی هەریەکە لە (ئەناکسیۆگوراس٥٠٠پ-ن، ئەناخسیماندەر، تیۆدۆرس، گریتۆس، ئەبیکۆر(٣٤١-٢٧٠ پ ن)، (شیشرۆن ١٠٦- ٤٢ پ.ن، (سینکا ٥-٦٥ن).. هاتووە، دوای دەلێن ئەوانە لە مەدرەسەی (نازانم- گومان) ی مولحیدی سەری هەڵداوە.

---

[١] بۆ ئەو ڕێژەیە بڕوانە:دعدنان ابراهیم- مدخل الى معرفة الالحادوبرها ان النظم (مطرقةالبرهان وزجاج الالحاد) ص٢٣

بە وردبوونەوەیەکی فراوانتر وادەردەکەوێ مێژووی ئیلحاد کۆن ترە، هەر بەگوێرەی قورئانی پیرۆز و هەندێ کتێبی تری ئاسمانی هەر لە دوای (ح.ئادەم) بێ باوەڕی شان بەشانی باوەڕی پەیدابووە، بەلای کەمەوە لەسەردەمی (ح.نوح) بێ باوەڕی زۆر فراوان بووە، باوەڕدار کەمایەتی بووینە.

توێژینەوەکانی (تەتەوری‌و مادی ) هەولیان داوە قۆناغ بەندیەکی وابکەن بە پێی گەشەی عەقلانی ئاین بخەنە پاشو ریشە بۆ عەلمانیەت بدۆزنەزە، بیکەنە میژووی گەشەی عەقلانیەت،جاریش وایە عەلمانیەت وعلمیشیان تیکەل کردوە، کەچی وانیە ئاینی وناثاینی بەتەریبی هاتوە،گوایە سەرەتای کۆمەلگە(شیوعیە البدائیە) بیئاینی بوو‌بێت،ئەوە ئەسلی نیە،زۆربەی زانایانی ئەنسرۆپۆلۆجی وشوینەوارناسان کۆکن کە لەمێژوودا میلەتان بێ کۆشك وتەلار بوە، بێ فەلسەفەوهونەر بوە بەڵام هەرگیز بێ ئاین و پەرستگا نەبوە، لە (معجم لاروس)یش هاتوە کە لە تاکی دڕندە ترین میلەتانیش مەیلی ئاینی تیدا بوە،

لە قورئانیش ئاماژە بەوە کراوە بۆ هەموو نەتەوەیەك پێغەمبەرێك بەزمانی خۆیان ڕەوانەکراوە (وما ارسلنا من رسول الا بلسان قومه ليبين لهم فيضل الله من يشاء ويهدي من يشاء وهو العزيز الحكيم)[٢]، مولحدەکان مێژوویەکی ئەسیلیان نیە،هەروەك دەبینین فەیلەسوفە مولحیدەکانیوەك: هرکلیت، سومخیا، پیلاس، دیاگراس، ملیۆس، ئەناکسیۆگوراس، شیشرۆن، تیۆدۆرس، گریتۆس، سینکا،.. لایەنگری وایان بۆ دروست نەبووە لەسەر ئاستی میللی، تەنها لەسەر ئاستی توێژی فەیلەسوف و زانا و عاقڵمەندان بووە،کوا ئیستا میلەتیك لەسەر ڕاڕەوی مولحدیکی مێژوویی بڕوات،ئەوەتا جیهان دابەش بوە بەسەر میلەتانی پیغمبەرەکان،ئەوروپا بۆ مسیح وجیهانی ئیسلامی بۆ محمد ویەهودی بۆ موساو،چین وئاسیای ڕۆژهەلات بۆ کۆنفۆشیۆس،هندبۆ بوزاوزەردەشت و..بوزاو کۆنفۆشیۆس وزەردەشتیش بە تەئکید سەرچاوەی ئاینیان هەیە مادام توخمی (ئەخلاق)سەرمەشقە.

---

[٢] سورة إبراهيم – آية ٤ .

جگــە لــە پیغمبــەران شــان بەشــانی ئەوفەیلەســوفانەش فەیلەســوفانی ئــاینی هــەبوە (یۆنــانی و هەرســیَ مەردەســەی ســەرەکی ئــایینی و نائــایینی و مــام ناوەنــدی لــیَ خــەملی)، مەدرەســەی ئــایینی (یــان نزیــك لــەئایینی ) بــریتی بــوو لــە فەیلەســوف و زانایــانی وەك (فیســاگۆرس وئــەمبادیکلس و ئەنکسیمونراس تا دەگاتە سوکرات)، (المقدسی) دەڵیَ باپیرانی ئەفلاتون لە پیغەمبەرانن (وأما الحرانية فإنهم يقولون لن تحصى اسمــاء الرســل الــذين دعــوا إلى الله وان مشــهورهم أرانــي واغثــا وذيمــون وهــرمس وســولن جــد افلاطــن لأمــه)[٢]. ئــەوەی ڕوونــە هەریەکە لە فیساگۆرس و ئەنمبادیکلس قوتابی (ح.سولیمان) و (ح.داود) بووینــە، بۆیــە ئەوانــە خــاوەنی دەعــوەش بوونــە، لەگــەڵ هاتنی ئەسکەندەر بۆ ڕۆژهەلاَت دوو قوتابی فیساگۆرس بەناوی (مـــەرزنۆس وڤلانـــۆس) فەلســـەفەو بـــاوەڕی فیســـاگۆری

[٢] البدء والتاريخ ص١٥٠

وەیلنیستیان لە فارس وهند بلاودەکردەوە[٤]، بالی ئاینیەکان چالاك ترو دڵسۆزتر بووینە،بەلام دوای ئەزمونی ئەوروپا نۆرەی نائاینیەکان هاتەوە،ئیتر فەلسەفە و زانستی بێ باوەڕی بەردەوام بووە تا سەدەکانی ١٧ بەدواوە تەکانی بە خۆدا، گەورەترینیان سپنوزا و هۆبز شوبنهاوەر، دیفید هیوم، جون دیوی، برتراند راسل،.. پێیان وابوو ئاین و شەریعەت لە یاسا وەردەگیرێ نەك لە (راستی گەردوونی)، یاساش فەرمانی دەسەڵاتەوەك هۆبز(١٥٨٨- ١٦٧٩ ز) دەڵێت، واتا ئاین لە خودا وەردەگیرێتەوە بۆ نێو دەوڵەت[٥]. بەشێکیش بە کتێب و توێژینەوەی زانستی و فەلسەفی ئایدۆلۆژیا هاتنە مەیدان دژ بە ئاین، لەوانە: (النسق المسیحیه)ی شوبنهاور، (جوهر

---

[٤] – ابي الفتح الشهرستاني– الملل والنحل – تحققت محمد عبدالقادر الفضل، بیروت، طبعة الأولى ج٣ ص٧٩ – لە ( قصة الحضارة – ج١٣ ) لە ٥٢٩ز باس لە رۆیشتنی زۆریك لە فەیلەسوفان کراوە بۆ ئەو شوینانە.

[٥] ( هۆبز– مبادئ القانون – ئەوەش بە دوو بەش چاپکرا لە ١٦٤٠ ز ( الطبیعة الانسانیة )، ( الهیئة السیاسة ).

المسـيحيه)ی فیوربـاخ١٨٤١، (الوجــود والعــدم) ی ســارتر، (مستقبل الـوهم) ی فرویـد.. ئەوانـە کتێبی هـەرە مولحیدودژ بـە خواو ئاینن[٦]، ئینجا مەکیاڤیلی بە (میر)، ئیڤان باڤلۆڤ(١٩٣٦-١٨٤٩) لـەبارەی (محاضـرات فـی عمـل نصـفی الکـرة الموخیـة)، سـپیۆنزا (١٦٣٢- ١٦٧٧) (الرسـاله فی اللاهـوت و السیاسـه)..، لەدوای شۆڕشی فرنسا ١٧٨٩م بۆ یەکەم جار بڕیارِ بەناوی گەل درا لە جیاتی بە ناوی خودا، لـەدوای ئەوانـەش: فریـدرێك نیتچـە (١٨٤٤- ١٩٠٠) خـاوەنی دروشمی(مـەرگ بـەر خـودا)، داروین (اصـل الانـواع)، مـارکس ئـەنجلس لیـنین لـەبارەی شـوعیەت، تادەگاتـە سـارتەرو براتراند راسـل و هواتیهـد (١٨٦١- ١٩٤٧)، هـەمو ئەوانـە زەمینەیـەکی فکـری ومیژوییـە بـۆ لـەدایك بـوونی عەلمانیـەتیکی تونـد،لەگـەل گەیشـتنیان بـە دۆخـی ئـەورروپای شـلەژاو لـە ڕووی ئـاینی وسیاسـی وئـابووری وزانسـتی ئـەو جۆرەعەلمانیەتە لەدایك بوو،بەلام کە دەسەلاتیان گرتە دەست و

[٦] - المعجم الفلسفی الشامل.. ص ٨٩

تووشی شەڕو پێکدادان ونەهاتی هاتن جاریکی تر خۆیان هەمواركردەوە سەر عەلمانیەتیکی میانڕەو کە لە بنەچەدا دەگەڕێتەوە بۆ مەدرەسەی سێیەمی فەیلەسوفانی یۆنانی.

**دیاری کردنی ناسنامەی عەلمانی لە فکری فەلسەفیدا:**

لەسەرەتادا عەلمانیەت سیستەم نەبوە وەك ئیستا، زیاتر ئەوانە بووینە کەلە فکری فلسفی بۆچوونی تایبەتیان هەبوە لەبارەی پەیوەندی خوا بە سروشت یان هەر لەسەر خودی ئیمان، ئەو کاتی دەهریان پێدەووترا وەك(جیمس پروير) لە کتێبەکەی (الإلحاد الغربيWestern Atheism ) دەهری لەپێش سوکرات دەست پێ دەکاو هەریەکە لە(هرکلیت و ئەناکسیمینس و ئەبیکۆڕ و ئەناکسیماندر..) دەهریان پێ و تراوە[7]، لەبەر ئەوەی پانتاییەکی زۆری عەلمانیەتیش دەچیتەوە

[7] مانای دەهری لە سەرچاوە جیاجیاکان بەو شێوەیە هاتوە:أ-لسان العرب (ابن منظور مادة: دهر): الدهر اسم المدة العالم(عمر الدنيا)، رجل الدهري اي الذي لا يؤمن بالآخرة./ ب- راغب الأصفهاني في (مفردات الفاظ القرآن- مادة: دهر) رجل الدهري اي الذي لا يؤمن بالآخرة./ ج- منجد ص٢٢٧، الدهري هو الملحد.

سەر دەهری، ئەوانە ڕایان وابوە ئەو بونەوەرە دەکرێ دروست بێت بێ ئەوەی پێویستمان بە خوا و (خالق) و دروستکارێك هەبێ،دەشکرێ بەردەوامیش بێت بەهۆی سروشت، ئەوە ڕای کۆنی (دەهریەکان) و (naturalism)بوە ڕای کۆنی هرکلیتیشە کە وتبووی(بوونەوەر یەکەوکەسیش دروستی نەکردوە، هەرواش دەمێنێتەوە، بەرێك وپێکی دەگۆڕێ)[8]، لەدواییش دەقی ئەو گوفتەیە لەلایەن فریدریك ئەنجلیس لەسەردەمی نوێ هاتوەودەڵێت: دەتوانین لەو گەردوونە بگەین چۆن دروست بوە و چۆن کار دەکا بێ ئەوەی پێویستیمان بە خودا (یان هەر زیادەکی نامۆ هەبێت)، لاپلاس و هۆلباخ وزۆری تر وەك لینین وتویانە: هەرچی هەیە بریتیە لە مادەی جولاو[9]،بەو شێوەیە دەهری کۆن ومادی سەردەم یەك ناسنامەی فکری فلسفیان هەیە، عادەتەن ئەو جۆرە زاناوبیریارانە لە خزمەتی دەسەلاتێکی ستەمکاربووینە،دژی ئازادی ودیموکراسی ئەو سەردەمی

[8] ملاحظات فلسفیة – ط روسیة ص٣١٨

[9] لینین – مؤلفات ص١٦٢

بووینــە،لایــەنگیری دوور خســتنەوەی ئــاین وئــەخلاق وبــەزەیی بووینە لەکارەکانیان.

یەکەم زانا کە هەوڵی جیاکردنەوەی ئایین و سیاسەتی داوە سینکا(٤-٦٥م) فەیلەسوفی دەهری رۆم بووە[١٠]، بەهەمان شێوە فەیلەسوفی یۆنانی کۆن (هرکلیت) هەم دەهری بوە هەم دژبە بنەمای ئازادی و دیموکراسی بوە، ئەوانەی دژی بنەمای ئاییني و دیموکراسی و میلەت بووینە زۆربەیان دەهری بووینە، زیاتر لایــــەنگیری دەســــەلات بووینە،دەســــەلاتیکی دیکتــــاتۆرو ستەمکاروداگیرکار، لەوانە زینۆن(٣٠٠ پ.ن) بۆ پاپای ئەسینا، مارکۆس ئۆلیتۆس وئیکتیپۆس(٦٠-١٢٠) بە نۆکەری ئیمپراتۆر بــە ناوبــانگ بــوو.. ئەوانــە بــە (ســتۆیلی)ناوزەد دەکــران واتەماستاوچــی، بــە هــەمان شــیوە میکــاڤیلی بــۆ بنەمالــەی حوکومداری مدیتچی وئاواش لاپلاس وهۆبز و.. زانای هۆلەندی هۆگـۆ گرۆتیـۆس(١٥٨٣-١٦٤٥)بـە دامەزرینـەری یاسـای دەولی

[١٠] موسوعة علم الإجتماع ص٣٣٩

وسیستەمی عەلمانی هەژمار دەکرێ کەچی لایەنگری کۆیلەداری بوە.. وزۆری تر،ڕۆفائیلی هونەرمەند وینەی ئەرستۆ و ئەفلاتونی لەتەنیشت یەك وا دروست کردبووئەفلاتون ڕووی لە ئاسمان و ئەرستۆش رووی لە زەوی بەو مانایەی یەکەمیان لاهوتی و دوەمیان ناسوتی، یان سادەتر یەکەمیان ئاینیانەودوەمیان عەلمانیانە، ئەفلاتون ئاینی ولەڕێزی میلەت بوە وەك جون لویس دەڵێ دەنگی میلەت وشاری بوە، ئەرستۆش لە خزمەت داگیرکەرێکی وەك فیلیپی مەقدونی بوە[11]، دوایش بوە فەیلەسفی رەسمی ئیمپراتۆریەت ومامۆستای ئەسکەندەری مەقدۆنی مونەزیری دەولەتی بەندایەتی بوو، سینکای دوەم مامۆستای نیرۆنی زۆردار بوو کەدوای خۆی دەماری بڕی وسینکای کوشت[12]، مانای ئەوەنیە سەرچاوەی عەلمانی

---

[11] سبینوزا–رسالة فی اللاهوت و السیاسة ص٢١١

[12] د.عدنان علی رضا النحوی– المسلمون بین العلمانیة وحقوق الأنییسان الوضعیة، ط ١ ١٩٩٧م، ص١٠ .

مولحیدی بێت، نە ئەوەشە گوایە بیلایەن بووبێت،نەخێر،بە ووردتر بۆ دیاری کردنی ناسنامەی فکری عەلمانی دەبێ بگەڕێنەوە سەر ڕوانگەی سێ جۆرە بیرکردنەوەی لەبارەی (خوداو دروستکەرەوە )لەمەدرەسەکانی یۆنانی کۆن بەو شێوەی خوارەوە:

١. ئینکاری خواو حوکمی سروشت ئەوە فەلسەفەی مادیەکانە بریتی بوون لە (هرکلیت، دیموقریتس، لویکیب، ئەناکسیمینس، ئەبیکۆڕ، ئەناکسیماندر..) هەریەکە بەجۆریك باوەڕی بەوە نەبوو خودا داهێنەری بوونەوەرە، دیموکریت ولوکریشیس ووتویانە بناغەی هەموبوونەوەر ئەتۆمە نەك خودا[١٣].

٢. پێیان وایە خودا هەم دروست کەرە هەم حوکمیشی ڕاستەوخۆیە لەسەر ژیان وبێ ژیان وسروشت، ئەوەیان زیاتر

[١٣] لە کتیبی (دیالکتیك الطبیعة ص٢١٦ دەڵێ یەکەم زانا کە ووتی جیهان لە ئەتۆم پیك هاتوە لۆکیبۆس بوو نەك دیموکریتیس، لە ص٥٧ یش دەڵێ ئەوەی کیشی ئەتۆمیشی دۆزیەوە دالتون نەبوە بەلکودیوجین لایرسی بوە.

ڕای ئاینیـــــە پەتیەکانـــــە، نزیکـــــە لـــــە سیســـــتەمی سیۆکراتی،فیساگۆرس وسوکرات و..

٢. خـوا دروسـتکارە بـەڵام هـەقی بەسـەر گـەردوون و بونـەوەر وسروشت نەماوە، لێرە ئەبیقور لە مولحیدی پلەیەك دادەبەزیٚ و دەڵێ لە خـوای ناوەشێتەوە حوکم لـەو بوونـەوەرە لەسـەر مـارو بـــۆق وئـــاوو ئـــاگر بکـــا و خـــۆی بچـــوك بکاتـــەوە وازی لێهێنایە[١٤]،ئەوانە گەلێ زۆرن ئەرستۆ پیشڕەویانە زیاتر دیزمیان پێدەووتریٚ،

ئەوەی ئیستا لـە جیهانی نویٚ حوکم دەکات لـەو بەشـەیە، لەســەردەمی نــویٚ (هربــرت تچــیرپۆری ١٥٨٣-١٦٤٨)بەیەکـەم دامەزرێنـەرەوەی دیزمـی هـەژمار دەکـریٚ [١٥]،دیکـارتیش یەکـەم کەسە کە یاساکانی سروشتی ئاوا دارشت ودەڵیٚ:خـوا سروشـتی دروست کردوە ووازی لیهیناوە،سرروشت وژیان بیٚ خودا کـاری خـۆی بـەهۆی یاساسروشـتیەکان دەکـا، بۆیـە لـە تویژینـەوەی

---

[١٤] موسوعة الفلسفية المختصرة . ص٢٢ .

[١٥] موسوعة الفلسفية السوفيتية ص٢٢٧

(خواوەنـد) تـەنها بـۆ يەكـەم پرۆسـەی (خلـق) پيويسـتە[16]، وەك وەسفی (ويل ديورانت) خودا بە سيستەمی(مەلەكی دەستووری) شای بەريتانی چواندوە چۆن خاوەنە نەك حاكم ئەويش هەر دروسـت كـەرە نـەك فەرمانـدەرد،ەتوانين بڵـێين فكـری عـەلمانی بەگشـتی پشـت بـەو فەلسـەفەيەو ڕايـەی سێيەم دەبەسـتیٚ،وەك بەشێك لە لێك جياكردنەوەی (حاكم) و (خالق) ئايين بۆ خودا و حـوكميش بـۆ ئـادەميزاد، خلـق بـۆ خـودا وئـەمر بـۆ مـرۆڤ، لـە سروشـتيش (خلـق) بـۆ خـوا و بـەڕێوەبردنيش بـۆ سروشت.ديزميەكان لە فەلسەفەی يۆنانی.. تادەگاتە عەلمانيەتی ئەو سەردەمە كە دەڵێن (خلق) بۆ خوا دەگەڕێتەوە بەلاٚم(امر) بۆ ئێمەيە، كاروباری ئاسمانی بۆ خواو زەويش بۆ ئێمە، دەيانەویٚ بڵێن ئەودنيايەی نزيك لە ئێمە —سروشت وژينگەی ژيان وەك بونـەوەر نيـە هـەمو كارەكـانی لەدەسـت خـۆی بێـت، كـاری دونيا(سروشت) بۆ مرۆڤ بە جيهيشتوە، هەندیٚ لە ئاينيەكانيش

[16] الفيزياء ووجود الخالق ص٢٥

ئەو ڕایەیان هەیە، قەشە (ولیام سامبل)-لەکنیسە کتنبری بەریتانی دەڵێت: (خوا بەتەنها یاساو ئاینی بۆدنیا دانەهیناوە بەڵکو وای کردوە مرۆڤیش بەشداری بکا)[17]، هەرچی (مارتن لوسەر)ە ڕایەکی نزیک لەوەی هەیەو دەڵێ:(ئەندازیارو دروستکەری گەردوون خوایەبەڕێوەبردنەکەنیشی بۆ خەڵکی بەجێهیشتوە)[18]، واتە وەك شای بەریتانیا ئاسا (یملك ولا یحكم)، دەیانەوێ بڵێن خوادروستی کردوەو بەڕێوەبردنیشی بۆ ئێمە بەجێهێشتوە، بەو شێوەیە هەروەك چۆن عەلمانیەتی ئیستا لە لیکجیاکردنەوەی ئاین وسیاسەت هاتوە،فکری فلسفیەکەشی لەو لیکجیاکردنانەوەی سەروو هاتوە،ئەوەش ناسنامەی فکری فەلسەفەیەکەیەتی.

[17] هە لبزاردن لە نیوان عە لمانی وئیسلامی- نوسەر ص١٣

[18] شبلي عيسمى - العلمانية ودولة الدينية- ص٢٢

## سەرهەڵدانی عەلمانی وهاتنی بۆ جیهانی ئیسلامی

یەکەم جار عەلمانیەت بەسانایی لە ڕۆژئاوا سەری هەلدا ئینجا پەڕیەوە بۆ جیهانی ئیسلامی،بەلام نەك بەئاسانی،بەلکو پیویستی بە جەنگ وئاگروئاسن وڕووخانی ئیمپراتۆریەتیك وجەنگیکی جیهانی بوە، ئینجا نۆرە عەلمانی لەجیهان دێت وەك سیستەمیکی نوێی ژیان،بۆیە لەپیشدا پیویستی بە پیناس وڕاڤەیەکی کورت هەیە.

مانا و پێناسی: لەو سەردەمە کە سیستەمی عەلمانیەت زۆر گەشەی کردوەو زۆربەی جومگە سیاسی ویاسایە دەولی ودەڤەریەکانی گرتۆتەوە، پەلی ئاویشتوە بۆ بواری کۆمەلایەتی وفکری وزانستی وزۆرلای تر،لەو سەردەمەی کە بلۆکی شیوعیەت شکستی هێنا وبزوتنەوە ئیسلامیە کلاسیکیەکانیش کەوتونەتە قەیران،هەول دەدرێ سیستەمی عەلمانیەت وا پیشان بدری کە دەرمانی هەمو دەردانە ولە سەرووی ناکۆکی وڕاڕەو مەدرەسەکان بێت،جاروەیە دەلێن بێلایەنەهەتا بەرامبەر ئاینەکان،بەلکو سودبەخشەو نیوانی ئەوانیش ریکدێخی،بەو

شێوەیە تیکەڵی دەکەن لەگەل زانست وعەقلانی وديموكراسی، لەفەرهەنگی حزبی بەعس (تعريفات ببعض المصطلحات) لە ماددەی (عەلمانیەت) واهاتووە (كلمة مشتقة من العلم والعالم وهو بخلاف رجل الدين)، لە مەبەستەکانی (مل ملاذیّی شارستانی-هندگتۆن) دەیەوێ ماناکەی بە (علم) گوزارش بکا، وا خزمەتی ستراتیجیەتی پێ دەکرێ، بەڵام لە ئەسڵدا مانای (سیکولاریزم) زانستی (علم scince) ناگرێتەوە، بەلکو لە (سایکولم )ی ئەگریکی هاتووە، فەرەنسیەکەش (لائیکی-Laigue) لە لایکسی یونانی هاتوە بەمانای رەمەکی (عامی )، لە بنەچەدا بەپێ ی هەندێ سەرچاوە (سیکولار) لەڕۆمای کۆن و دواتر ئەو عەوام و کەسانە بووینە کە پایەی ئاینیان نەبووە لە کەنیسە[19]،ئینجاعەلمانیەتیش نوی نیەبەلکو هەر شیوازیکی تری ململانێی ئاینی و نائاینیە.

---

[19] بۆ زیاتر سەرنج بدە : ا-العلمانية تحت المجهر ب-موسوعة السياسة ج٤ ص١٧٩ ج- معجم الشامل للمصطلحات الفلسفية.

لەسەروو لە ناسنامە فکری وفلسفیەکەی دەردەکەوێ یەك جۆر عەلمانیەت نیە،دابەش کراوە بۆ عەلمانیەتی توند ومیانڕەو یان عەلمانیەتی شمولی ونیمچەعەلمانیەت، بەلام بەتێکڕاکۆمەڵێك مانای جیاجیای پێ دراوە ماهیەتی هەریەکە، لە لایەن هەندێ فقهی ئاینی بە کوفر وەسف کراون،تێڕوانینی بنچینەیی لە ئەکادیمیەتی ئیسلامی لە پێناسی دا ئەوەیە، ئەوانە مرۆڤ بە (سید الکون) دەزانن عەلمانین، کەچی ئیسلام بە (خلیفة الارض)ی دەزانێ.

هەرچی فەرهەنگ و زانایانی عەلمانی خۆشیان، بە دنیایی، دنیا پەرستی، نا ئاینی، باوەڕ بە کاروباری دنیایی و خۆشەویستی دنیا و باوەڕنەکردن بە دەرەوەی ئەمانە).. یان وەك لە هەموو فەرهەنگەکانی هاتووە جیاکردنەوەی دەوڵەت لە ئاین، جم و جۆڵی سیاسی لە ئاین، گێڕانەوەی کاروباری مرۆڤ لە خواییەوە بۆ بەشەری[٢٠]..واوەسف کراوە، دائیرەی مەعاریفی

[٢٠] کیالی- الموسوعة السیاسیة ج٤ مادە :العلمانیە.

بەریتانی، عەلمانیەت: بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیە مەبەستی وەرگێڕانی ڕووی خەڵکی لەدوا ڕۆژ بەرەو واقیع و دنیا بە تەنها، فەرهەنگی (العالم الجدید-لابستر): سیستەمێکی دنیاییە تێکەڵی عیبادەت و بڕوای ئاینی نابێت، لە مەوسوعەی بریتانی ۲۰۱۱ بەو سادەییەی گوزارش کردوە: any movement in society directed away from otherworldliness to life on earth ، فەرهەنگی ئۆکسفۆردبەدەسەڵاتێکی دژ بە کنێسە، هەرچی مەوسوعو نوێکانی جیهانی ئیسلامیە لەوانە الموسوعە العربیە العالمیە:دەڵێت بریتیە لەجیاکردنەوەیەکی ڕەهای نێوان سیاسەت و ئایین، ئەوە عەلمانیەتە.

سەرهەڵدانی (نەوەی یەکەمی )عەلمانیەت:

لە سەروو ڕیشەو سەربردەمان باس کرد دەرکەوت گوزارش لە مێژوەکی قوول دەکا،بەلام وەك بەرجەستە بوونی بەرەسمی لە ساڵی (١٦٤٨) لە مۆرکردنی ئاشتی (وستڤالیا) بەکارهات کە دەوڵەتی نەتەوەیی پێ دروست بوو لەجیاتی سیوکراتی، یەکەم کۆماری عەلمانیش لەدوای شۆڕشی ١٧٨٩ لە فەڕەنسا دروست

بوو، لە دوای ڕابوونی ئەوروپیش باوی وەرگرت، کاریگەری شۆڕشی ئەمریکاش لەبینا کردنی دەولەتیان ڕوون تر لەوە دێت کاتێ ویلایەتی ڤێرجینیالە سالی ١٧٨٩ ویستی ئاینی فەرمی مسیحی بێت، جیفرسۆن ڤیتۆی دژ بە بەکارهێنا بۆ ئەوەی دەستور جێی بنەماکانی مسیحی ودەسەلاتی کنیسە بگرێتەوە و بوە هۆی لێك جیاکردنەوەی تەواوی ئاین لە دەولەت بەشێوەی فەرمی، دوایش ناوی نرا(اعلان الحقوق)، ئیتر زۆربەی زانا و فەرهەنگە کۆن و نوێکان ئەو سەرەتایانە بەمێژووی سەرهەڵدانی عەلمانیەت دەژمێرن[٢١]، دوای وا باو بوو بە خۆماڵی کردنی دام و دەزگاکانی کنێسە بۆ دەوڵەت یان مەدەنیەت دەگوترا سکولاکردن، کاتی کە پیاوانی کنێسە ستەم و زۆرداریەکی بێ سنوریان لە خەڵك دەکرد لە باج وەرگرتن، سەرانە، فرۆشتنی پسولەی لێ بووردن، ئەشکەنجەی زانایانی وەك (کوپەرنیکوس، گالیلۆ، جوردانو، دیکارت، پیکۆن، چۆن لوك، سپینوزا،..)، پاوان کردنی دەسەلات بەناوی نوێنەرایەتی خواوەند و لاهوت

[٢١] کتیبی (تیارات الفکر العربي المعاصر ص٢٠٤) زیاتر بەلای شۆرشی فرنسیة نەك شۆرشی ئەمریکی .

یان وەك پیێ یان دەووت (پادشاوەك خوای سەر زەوی- Diving right of the king)،.. لە کاردانەوەی ئەو بارودۆخە زیاتر پەرەی سەند، هەندێکی تریش لە بنچینەدا دەیگێڕێتەوە بۆ (میکاڤیلی) و ئەو کاریگەریانەی لەسەر (هۆبز)ی هەبوو لە بارەی دەسەلاتی سیاسی لە دژی بەها سیاسیەکانی مەسیحیەت،هەرچەندە هۆبز بە بێبڕوا بەناوبانگە بەلام واپێناچێ ئەو دەڵێ:دووجۆر ڕێنمایی بۆ کۆمەلگە هەبوە یەکێکیان لە داهینانی بەشەری بوە بۆگشتی کەسیاسەی بەشەری پێ ووتراوە بەشەکەی تریش کەلەلایەن خواوە هاتوە سیاسەی ئیلاهی پێ ووتراوە تایبەت بوە بە حوکمی قۆرخکارو زۆرداران[٢٢]، هۆبز پێی وایە ئەو دوودەسەلاتە لیك جیاکریتەوە حوکمی مەدەنی وبەشەری پەیڕەو بکرێت،لێرەوە مانا فراوانەکەی (فصل المطلق بین السیاسة و الدین) بووە عەلمانیەت[٢٣]، لە پێشەکی عەرەبیەکەی کتێبی (رسالة اللاهوت و السیاسة) سپنوزای دانەر

---

[٢٢] تۆماس هۆبز-اللفیاثان (الأصول الطبیعة والسیاسیة لسلطة الدولة)- ت:دیاناحرب ص١١٩

[٢٣] لەوانە ( الموسوعة العربیة العالمیة - ج١٦ص٤١٥ )

بە پێشەنگی عەلمانیەت دەژمێری کە ئاینی لە سیاسەت دوور خستەوە و نهێنی و دەستکارییەکانی ئینجیل و تەوراتی ئاشکرا کرد، هەروەها بەپێی زۆربەی (سەرچاوە زانستیەکانی) تریش هەریەکە لە (یاساناسی فەرەنسی فۆدین، سیاسەتمەداری ئەڵمانی–ئەتسیوی، پارێزەری هۆڵەندی چۆرتیۆس) دەوری هەرە گرنگیان هەبووە لە بە دەولی کردن و داڕشتنەوەی یاسای عەلمانیەت، هەموو ئەوانە و زەمینە فیکریەکەی ئەو سەردەم و شۆڕشی فەڕەنسی و هەلمەتەکانی ناپلیۆن و وەچەرخانی ئیمپراتۆریەت بۆ دەوڵەتی نەتەوەی و ڕابوونی زانستی ئەورووپی و شکستی کنێسە و بەرنامەکانی تەبشیر و هەڵمەتەکانی ئیمپریالیزمی دوای سەرهەڵدانی شیوعیەتیش.. بناغەکانی بڵاوبوونەوەو پەیدابوونی عەلمانیەتن، زانایان (لوك، لیبنتز، ڕۆسۆ، لینج،..) زۆری تر لە لایەك باوەڕیان بە خودا هەبووە بە عەلمانیەتیش، هەمان ڕاڕەوەی (ڕبوبیەش–Deism)[٢٤] کە لەسەروو باس کران،لە دوای تاوتۆکردنێکی زۆری تر (جۆن

---

[٢٤] لە ( موسوعە الفلسفیە ص ٢٢٧)ی سۆفیەتی دەڵێت: هربرت شیربۆری(١٥٨٣–١٦٤٨)باوکی ربوبیەیە واتە ئەو دایهێناوە .

هیلۆك-١٨١٧-١٩٠٦) وەك چەمکێکی سیاسی ماناکەی (گوایە بەبێ لایەنانە) داڕشت کە تا ئێستاش زیاتر بە گشتیەکەی ئەو مانایە دەبەخشێ: (دەتوانرێ بە لەباری ئاین دوورخری لە چاکردنی کاروباری مادیانەی مرۆڤ)، واتە جم و جۆڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و دروست کردنی دام و دەزگاو پارتی سیاسی بێ ئەوەی پەیوەندی بە ئاینەوە چ دوور چ نزیکەوە چ سەلبی چ ئیجابی نەبێ، ئاینیش لە گۆڕەپان بکشێتەوە ناو کنێسە و دڵی ئادەمیزاد، یان وەك (د.کەیالی) دەڵێت: مانای مرۆڤ بەخۆی ببتە خاوەنی خۆی،بەرەو مرۆڤایەتی،بەرەو ئەوەی مرۆڤ دوامەبەست بێت لەو گەردوونە[٢٥]، ئەوەی بە خێرایی تێ بینی دەکرێت (هۆلیوك) لە پێناسەکەی (بێ لایەن) نیە بەڵکو ئاینی بەخشەکەی خانەنشین کردووە لە سیاسەت و دەوڵەت و لە ژیانیشیان جیاکردەوە،.. بەو شێوەیە لە ئەوروپا لەگەڵ ئەو فاکتەرانەی سەروو ولەگەڵ ڕێککەوتنی ویستڤالیا لە ١٦٤٨ بە ئاسانی عەلمانیەت سەری گرت، لە پاش شۆڕشی فەرەنسی یەکەم کۆماری عەلمانی لە ساڵی (١٧٨٩) دروست بوو، ئیتر

[٢٥] الموسوعة السياسة ج٤ص١٨٠

تەقیـەوە، لـە سـەدەی (١٩) بـەدواوە سەرانسـەری ئـەوروپای گرتـەوە،دوای سـەدەی بیستـەمیش جیهـان بەگشـتی، زەق تـرین ڕێكـەوتن كەتائیسـتاش زیـاتر ولاتـانی عـەرەب وعەلمانیـەتی تونـدڕەو داوای دەكـا ئەوەیـە كەلـەنێوان موسـولینی وپاپـا كـرا لـە ١٩٢٩بـەو شێوەیە: مرۆڤ لەبوونیـەوە بۆ موسۆلینی بێـت تـا مردن لەوی بـەدواوە هـەتا قیامـەت ببتـە عایدی پاپا!! ئیتر ڕۆڵی ئاینی مەسیحی كەوتـە دوای مردن،یان لەباشترین دۆخیدا پەیوەندی خۆی وخوای خۆی.

**مقەوەمات وگەشەی عەلمانی:**

ئەگـەر بـەووردی سـەرنج بدەینـە هەورازونشێوی عـەلمانی و دەهـری وپەیوەندیـدارەكانی دەبیـنین لەكۆنـەوە تـا ئـەو سـاتە مقـەوەماتی وپاسـاویمانەوەو گەشـەی ناوەسـتێتە سـەر هۆكـارە ناوەكیـەكانی خۆی،بـەلكو دەكەوێتـە سـەر سـتاندەر نـەبوونی پیـادەی ئـاین لەناوكۆمەلگـە، هەلـە بكـە عـەلمانی ئامادەیـە بەدروسـتی ودادگـەری ئـاین پیـادە بكـە عـەلمانی ئۆتۆمـاتیكی نەماوە،زیاترلە پاساوو مقەوەماتی عەلمانی لە مێژوو ولـە ئێسـتا دەردەكەوێ بەو شێوەیەی خوارەوە:

لە مێژوودا: ناکرێ ئەوهەموو زانیاری و ڕێبازە دوور و درێژەی عەلمانی ودەهری بە سادەیی و نەزانی و (ئارەزوو بە زولم) پۆلین بکەین، دەتوانین بڵێین بەلای کەمی ئەوواقیعەی ئیستای جیهان لە پیشکەوتن وخۆشگوزەرانی وپەیوەندیە نیودەولەتی ومافەکان ومەدەنیەت وديموكراسی وسەروەری یاسا وبنەمای هاوولاتی بوون..لەلای فەلسەفەی نائاینی هاتوە، بابزانین گرنگترین ئەو هۆکارانە چین کە یارمەتی عەلمانی دەدا، زۆر بە کورتی ئەوانەن:

١. لە دوای دورکەوتنەوەی (زەمانی ومەکانی) پەیامی ئایینەکان لەسەرچاوەکانی (واتە دوای نەمانی پێغەمبەرەکان) ئەوا کۆمەڵێك گۆڕانکاری بەسەردێت بەهۆکاری جیاجیای نەریت و ئاستی زانیاری خەڵکی و هەندێکیش بە ئەنقەست لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە، ئایین پەروەریەکە کاڵ و سادە دەبێتەوە، گەڵی جار لە ناوەڕۆك و قورساییە زانستیەکەی دەپچڕێ، دەبێتە نەریت و کاری سۆفیگەرایی و پاککردنەوەی دەرون، ئەوکاتیش هەموو ڕوداوێك دەدرێتە پاڵ خودا، ئەوەیان لەسێ ئایینە خاوەن

کتێبـــە ئاسمانیەکـــەش بـــەدی دەکـــرێ، لەتـــەورات و ئینجیـــل بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، لە ئایینی ئیسلام ئەو خەلەلە لەخودی قورئـان و فـەرمودەی دروسـت بـەدی نـاکرێ بـەڵام لـە فیقهـی ئیسلامی و عەقیدە بەدی دەکرێ، دەڵێن هەرچی ڕوودەدا لەباران بارینـەوە لـە بروسك و گرکـان و مـانگ و ڕۆژگیران تـا ڕووداوە کۆمەڵایەتیـەکان و مـردن،.. هـەمووی دەڵـێن بـە ئـەمری خودایـە(تیۆری المشـیئە) پشـت بـەو ئایەتـەی (والی اللە ترجـع الامـور)[٢٦] دەبەسترێ،، لـە نێـو مەسـیحیەکانیش نـەك قەشـەکان بەڵکو فەیلەسوفەکانیشیان لە ڕەدی سپینۆزا دەیان ووت هەرچی ڕوودەدا بە ئیرادەی خوا ڕوودەدا ڕاستەوخۆ[٢٧]، وادێننـە بەرچاو کە خودا زۆرسەرقاڵ وماندوو بێت بە سوڕانی ئەستێرەو زەوی و ڕۆژومانگ ومەخلوقاتی تر،نـەیان زانیـە خـوای گـەورە یاسـای بۆ هـەمو (خلـق) دانـاوە (الا لـە الخلـق والامر)واتـە خـودا خـەلقی نەکردوون بە عەبەسی بەلکو (امر)ویاساشی بۆ داناون،کە پێیـان دەلـێن یاسـای سروشـتی،بەتایبـەتی (قـانون السـببیە) کرۆکـی

---

[٢٦] سورة الحدید ایة٥

[٢٧] سپینوزا لە کتێبی (الاخلاق)وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە – دیالکتیك الطبیعة ص٢٣١

فەلسفەی ئاینیە، ڕوون نەکردنەوەی ئەو بڕگەیە سەرچاوەی زۆربەی خالەکانی تری خوارەوەدەبێت کەوەك پارادۆکسی دینی دەردەکەوێ.

٢. زاناو بیریارانی عەلمانی لەلای ئاینی گوێیان لێدەبێت دەلێن خودا بۆ خۆی هەمو کارەکانی زەوی وئاسمان دەکا،کەچی..لەسەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤایەتیەوە تائەو ساتەلەکاتی پێویست وکارەساتی سروشتی و کۆمەڵایەتیدا، لەکاتی زوڵمی بەشەری لەزۆرکاتی تر هەست بەبونی ڕاستەوخۆی دەستی خوایی ناکرێ بۆ کۆتایی هێنان بە مەینەتیەکان.

٣. هەر لەپەیوەست بە خالی (١) وکارەساتەکان زۆر لە خوا دەپاڕێنەوە کەچی هەر زۆردارە بەسەر هەژار سەردەکەوێ، یەکێ لەعەلمانیە توندەکانی عەرەبی ئەو سەردەمە دەڵێ: لەسالی ١٩٤٨ ەوە عەرەب ویەك ملیار موسوڵمان دوعا دژ بە ئیسرائیل دەکەن کەچی سەرکەوتن هەر بۆ ئیسرائیلەو شکستیش بۆ عەرەب، لە ئەنفالەکان زولمی ئەوەندەگەورە لە ژن ومندالی کورد بە

شـــیوەیەکی وا کرابــە زینـــدوویی لــە ژێــر خــاك بنرێن..کەچـی هەردوعا دەکراو وەڵامی دەماودەست نەبوو، وەك لائیکێکی کورد دەڵێ هـەمو ئەو دوعایانـە ناکاتـە بەرگریـەك کە بەدەسـتی خـۆت دەیکـەی، لـە زۆربـەی هـەرە زۆری خانـەوادە کۆنـەکان (ئیسـتاش) هەر دوعای (کوڕ) بوون کراوە کەچی ڕێژەی کچ وەك کوڕە ئەگـەر زیاتر نەبێ[28]، کەچی کوڕ بوون وکچ بوون یاسای مەندل دیاری دەکا..کـاری ڕۆژانــەمان وژیــان بریتیــە لــە پــەیڕەوی یاســای سروشـــتی و(هۆوئەنجام)نـــەك دوعـــاو تـــەوەکول، بۆیـــە (هینزپاچلین)لەکتێبی(دستور الکون) ئەو یاسایا سروشـتیانەی ناونا دەستوری گەردون[29]..

٤. لەسەر ئەو بنچینەی ئەو دوو خالـەی سـەروو هـەر هەولـدراوە یاسا بدۆزرێتەوە بۆ ڕووداوەکان هۆکار بدۆزرێتەوە،کە (لاپـلاس)

---

[28] لە کتیبی( ئافرەت لە نیوان عەلمانی وئاینیدا ) نوسەر بەدرێژی باسی هۆکارە سروشتیەکانی ڕێژەی زیادی ئافرەت بەرامبەر پیاو کراوە.

[29] بڕوانـە: بـۆل دیفیـز- الإقـتراب مـن اللـة- ص٩٨ ئـەو کتیبـە لـە بنچـینەدا ناوی(Mind of God) وای بە شیاو زانیوە ئاوای وەرگێڕی.

كۆمەلیك یاسای سروشتی دۆزراوەی ڕیزكرد،لە وەلامی پرسیارێكی ناپلیۆن(كە ووتبووی كوا ڕۆلی خودا لە فەلسەفەی تۆ) ووتی: پێویستمان بە خوا نەما یاسامان دۆزیتەوە[٣٠]، یان وەك هولباخ لە(نظام الطبیعة) بلی ئەوەتە یاساكانی سروشت و (هۆوئەنجام)م دۆزیەوە لە سروشت چیتر پێویست ناكا بلین بە تەمای خوا، ئیتر هەرچی دۆزینەوەو پیشكەوتنێك تۆماتیكیانە گورزبوە لە ئاین(لە ژێر ئەوجۆرە فقهە ئاینیە) وسەركەوتن بوە بۆ عەلمانیەت،تۆماس هۆبزیش پیش ئەو یەكەم جار بەبێ پەردە لە سالانی ١٦٥١ ووتی كتێبی موقەدەس وعیساو موسا هیچ پەیوەندیان بەیەكەوە نیە، ئیكۆرن لە١٧٧٩ زۆر بەتوند تر دابەزیە سەر كتێبی موقەدەس وبە خرافیاتی وەسف كرد، سپینوزا لە كتێبی(رسالة فی اللاهوت والفلسفة) بەیەكجاری كتاب المقدسی تەرت و ویران كرد، هەریەكە لە جورج ئەلیوت، جیمس فرود، جون ستوارت مل.. بەو مەنهەجە توندە دژ بە

---

[٣٠] دیالكتیك الطبیعة ص٢٢٩

مسیحی و بیری ئاینی بووینە، هەمو ئەوانە وای کرد سەردەمی ئاین بەگشتی بە(سەردەمی تاریکی) وەسف بکەن،سەردەمی عەلمانیەت بە ڕووناکی وەسف بکەن.

٥. ناکۆکی نێوان فەلسەفەو ئاین: لەدوای بانگی پێغەمبەرەکان عادەتەن وا هاتوە ئەوانەی خۆیان بە میراتگری ئاینی زانیوە لەگەڵ عاقلمەندان ڕووبەڕوودەبێتەوە، ئەوەیان لە مێژووی ئیسلامەتیدا زیاتر شێوەی ناکۆکی نێوان فقهو فەلسەفەی وەرگرتوە،.. بەو شێوەیە ئەو ناکۆکیە توندە لە نێو ئیسلام بە توومەتی توندی کافرو مولحید دەستی پێکردو لە ناو مسیحیش بە سوتان وئیعدام دەستی پێکرد، لە کتێبە فقهیەکان هەریەکە لە ئیبن سینا وفارابی وتوسی وجاحیزو سیف الدین ئامیدیو زۆری تر بە کافرو دەهری وەسف کراون، هەندێکی بە نمونە وەردەگرین(بڕوانە پەڕاوێز)[٣١] ابن تیمیە:(کان ابن سینا وأمثالە

---

[٣١] إغاثة اللهفان ج٢ ص٢٦٧، شفاء العليل ص١٤، درء التعارض ج١ص٢٨٩ الجواب الصحيح ج٤ ص ٤٦٣...

وهؤلاء وأمثالهم من رءوس الملاحدة الباطنية إلحادا أعظم من إلحاد اليهود والنصارى)[٣٢] لە(ج١ درء التعارض) لیستیكی دوورو درێـژی لەفەیلەسـوف ومدرسـەكان ڕیـز كـردوه (جگـە لەوانـەی سـەروو هەریەكـە لـە: ابـن عربـی ومبشـر بـن فاتـك، سروردی، سۆفیەكان، ئیخوان سەفا، موعتەزیلە، كلابیە، شیعە، سالمیە، تراقیە..)

٦. لەهـەموی گـرنگتر زۆربـەی ئاینـەكان لـەدوای پیغمبـەرەكان دووچـاری دەبـوو دووردەكەوتـەوە لـە پیـادەكردنی دادگەری(شەریعەت)وگرنگی دان بە دنیا،بە خێرایی دیمەنی دنیا وژیـان بـە ناشـرین پیشـان دەدرێ ،دنیـا بۆگەنیـەو هەلخەلەتێنەرەو..بەو شێوە ئاین پەروەری وتەركی دنیا پێكوە بەسترا، ئەو بۆچوونە لەنگە یەكەم جار لەسەر ئاستی دەق لەلای مسیحی هات،لە ئینجیل هاتوە: (فلا تهتموا للغد.لأن الغد يهتم بما لنفسه.يكفي اليوم شره )[٣٣]، هەمان فتوا لەلایەن ئیمامی شافیعی بە

---

[٣٢] درء التعارض العقل والنقل ج١ ص٢٨٩

[٣٣].كتاب المقدس–العهد الجديد مت(٦: ٣٤).

شیعر هاتوە:

سهـــرت اعين ونـــامت عيون في أمور تـــكون او لا تكون

فادرأ الهم ما استطعت عن النفس فحملانك تكون الهموم جنون

إن ربا كفاك بالأمس مـــا كان سيكفيك في غد مـــا يكون

لەو لیکجیاکردنەوانەی دنیاو قیامەت وئاسمان وزەوی و وای کـردوە لەکۆمەلگـەی نـەفامی ئـەرکی خوداکـانیش لێکجیـا بکاتـەوە،بیرۆکـەی خـوای دنیـاو خـوای ئاسمـان هـات، ئـەو فـرە خواییانـەو لیـك جیاکردنـەوەی ئـەرکیان و هـەروەها ئـەو جـۆرە بۆچـوونەی فقهـو ئـــەو دەقانـــەی ئینجیـــل بـــوە هـــۆی لیـــك جیاکردنەوەی چەمکە پێکوەنوساوەکانی تری وەك: دین ودنیـا، لاهـوت وناسـوت[٢٤]، عـەقڵ ونـەقل، زانـاو دەسـەلاتدار، شـریعەت ودەستور، پیاوی ئاینی ورەشۆکی، تادەگاتە ئاین وئاینپەروەران و یاسـا، عـەلمانی لـەولێك جیاکردنەوانـە هـات، لـە مێـژووی

[٢٤] – معجم الفلسفي الشامل... مادة: ناسوت ص ٨٦٧، اللاهوت: عالم الغيب، آخرة، والناسوت عالم الشهادة اي الدنيا .

ئەوروپاو هەتا لە ناو جیهانی ئیسلامیش کاری خۆی کردوە، لەسالی ۱۷۳۷ز بەرجەستە بوو لە ڕێکەوتنێکی دەگمەن لە ناوجەرگەی ئاین لە نێوان زانای ئاینی (محمد بن عبدالوهاب) لەگەڵ (حمد بن سعود)کە ئاین بۆ یەکەم ودەسەلاتیش بۆ دوەم[٣٥]، وێچووی ڕێکەوتنی مۆسۆلینی (سەرۆکی بزوتنەوەی فاشی ئیتالیا) وپاپای سالّی ۱۹۲۹ بۆ دابەشی دەسەلاّتی ئاینی ودونیایی...، هەرلەوەشەوە ئایین درایە پاڵ چینی چەوسێنەر، زۆر دەقی ئینجیلی واهەیە،بەلام بە ڕوون تر قدیس ئۆکستین لە کتێبی (ملكوت الله) دەڵێ (بۆیە خوا عەبدایەتی داهیناوەك سزا بۆیە هەرتەقەلایەك بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی عەبدایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا)[٣٦]. لەفقهی ئیسلامیش ئەو دۆخە بەدی دەکرێ چەندین ئیمام ووتویانە ئەگەر ستەمت لێکرا

---

[٣٥] حركة الأستقلال العربي، رسالة الماجستر –جامعة المستنصرية، بغداد١٩٨٨ ص١٢-١٣

[٣٦] ماركسية قرن عشرين ص١٤٦

بـــەرگری مەكـــە هـــەلیكرە بـــۆ دوا ڕۆژ خـــوا تۆلـــەت بـــۆ دەكاتەوە،وتویانە:( اذا كان الحاكم عادلافله الأجر وعليك الشكر واذاكان ظالما فعليه الوزر وعليك الصبر)[٢٧]، ( ونقل عبد الكريم الخطيب قول الحسن البصري:الا لا تسبوا الولاة فإنهم ان احسنوا فلهم الأجر وعليكم الشكر، و ان أساؤوا فعليهم الوزر وعليكم الصبر، وإنما هم نقمة ينتقم الله بهم ممن يشاء فلا تستقبلوا نقمة)، لەوەوە (بارون دولباخ )و وتی ئاین هونەری سڕ كردنی میلەتانە تا هەست بە چەوسانەوە نەكەن[٢٨]، دوای ئەویش ڕێسای(ئاین تلیاكی گەلان– الدين افيون الشعوب) لەلای ماركس هات[٢٩]، ئەو لیك جیاكردناوانە هەڵەیە چووبوە نێو ڕەهەندیكی

---

[٢٧] د محمد شحرور–الكتاب والقران ص١٠١ص٦٢٠

[٢٨] روجيه غارودى –ماركسية قرن عشرين ت:نزيه الحكيم ص١٤٣

[٢٩] . دەقی وورتەكەی ماركس لە كتیبی (نحو نقد لفلسفة الحق الهيجلية– ١٨٤٤م) وانوسراوة: إن الهم الديني هو في الوقت نفسه تعبير عن هم واقعي واحتجاج علي هم واقعي. إن الدين هو آهة الخليقة المضطهدة، هو قلب عالم لا قلب له، مثلما هو روح وضع بلا روح. إنه افيون الشعب.

تـری گـرنگ، وەك (اخـوان الصـفا) لـە بەشـی(مثنويـة الإنسـان) دەڵێن: مرۆڤ پێك هاتوە لەدوودژی (جەستەیی مادی) و(دەروونی ڕووحـانی) یەکـەمیان بـۆ دنیـا کاردەکـا ودوەمـیش بـۆ دواڕۆژ هاتوە[40]، ئەوەببوە تـەنزیر بۆ لێکجیاکردنـەوەی ئاین وسیاسـەت لە نێوان پاپاو ئیمپراتۆر: هەروەك مرۆڤ لەدوولای مادی و روحی پێك هاتوە دەبێ دەسەلاتیش لەو دوولایە پیك بیت، ئاین وپاپا بۆ روحی ودوا ڕۆژ مـرۆڤ ودەولـەت وئیمپراتـۆریش بـۆ جەسـتەو دنیا..، ئەوەیان دوای بوە بنچینەی سیستەمی عـەلمانی، تا وای لێهات لە لیکجیاکردنەوە نەوەستا بوە ڕووبەڕووبوونەوەی: عەقڵ ونـەقل، زانسـت و ئـایین، تەکنـەلۆژیا ودوعـا، موختەبەروفیقـه، مۆدێرن و فکری کۆن..، وەك (ابو علـی المعـری) و (هوايتهـد-لـە سەدەی بیست دووبارەی کردەوە) ووتیان: سەرکەوتن بۆ زانست

[40] رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء- رسالة رقم:٣٠ص١١٢-١١٣

و مۆدێرنـەو شکسـتیش بـۆ ئـاین[٤١]، هەرلەوەشـەوە (همنکـوای) دەڵێ بەسروشتی خۆی هەمو عاقلێك بێئاینی دەبێ، بی عەقلیش ئاینی دەبێ، مارکس پێی وایە بۆ ئەوەی ئایندار بێت پێویستی بە ئەقلێکی لەنگ هەیە ئەقلی دروست ئاینی قەبوول نیە[٤٢]، واتـە بۆ جیبوونەوەی ئاینی لەکۆمەڵگە پێویست بە عەقڵی لەنگ هەیە، مـەرگی ئـاین لەگـەڵ پێشـکەوتنی عەقلـە. زۆربـەی موفـەکیرانی عەلمانی عەرەبیش ئەو ڕایـەیان هـەبوە لـە نوێیەکـەیان عبـدالمنعم الحفنی دەڵێت: سەرم سوڕماوە لە هەندی عاقڵمەند چۆن یەکسەر تەسـلیمی فەلسـەفەی مـادی وعـەلمانی نـابن کـە تاکـە چارەنوسیانە[٤٣].

[٤١] شـبلی عیسـمی لـە(العلمانیـە والدولـە الدینیـە ص١٠٥) دەلیـت شـیخ محمـد عبـدەش ئـەو بۆچـوونەی هـەبوە: ((اذا تعـرض العقـل والنقـل اخـذ بمـا دل علیـە العقل)تا رادەیەك (رازی)یش ئەو بۆضونەی هەبوو.

[٤٢] ١١ کارل مارکس-بؤس الفلسفة ص٢٥٦نامەکەی مارکس بۆ ئینینکۆف.

[٤٣] المثالیة والمادیة وازمة العصر ص٩٥

ئەوەی ئەو ڕایانە گەواهی دەدا ڕەوتی فکری ئەو جۆرە ئاینپەروەرانەیە، عەقل و حیکمەت وفلسفە لایان جێگەی ریز نیە،تەنانەت عەقلانیەت تۆمەتە،بۆیەش لەگەل هەر داهێنانێك یەکەم جار ڕووبەڕووی بووینە ئینجا تەسلیمی بووینە، ئەگەر بەورد تر سەرنج بدەین دەبینین ئیمانداران لەسەرەتادا دژی دەزگای چاپ بوونە یەکەم جار لە سالی ١٦١٠دەزگای چاپ هاتە لبنان زانا فقهیەکان یەکەم جار حرامیان کرد گوتیان ئەوە دروستکراوی کافرە، بەرەبەرە شلیان کردو وتیان تەنها قورئان نابێ چاپ بکرێ دوای ئەویش نەما، دیسان بۆ ڕادیۆ، دوایی چونە سەرمانگ، بەکورتی دژی خوێندنیش بوونە و بە عیلمی شەیتان وەسفیان کردووە، دوایی تەسلیمی هەموویان بوون، هەرە دواییەکەی کە زۆر دژی حیزب بوون، ئێستا وا حیزبی ئایینی دروست دەکەن..

ئەوانە هەموو زەمینەیەکی سایکۆلۆجی وا ئامادە دەکا (کەگوایە) عەقلْ و کاری مرۆڤ ئەسلە و ئایینیش لاواز و شوێنکەوتەیە وجێی لەسەردەمی مودێرنەو شارستانی نوێ نابێتەوە.

لەپاساوە نوێکانیان: ئەگەر پاساوە کۆنەکان زیاتر نەزەری وفلسفی وفکری بووبن ئەوا پاساوە نوێیەکانزیاتر مەیدانین،لە باشتری ئەزمونی حوکمی عەلمانی دێت لە حوکمی ئاینی، حوکمیکی ئاینی ڕەسەن نا، بەلکو جۆرە سیۆکراتیەك، ستەمو باج ومیراتی، هەر یاخیبوونێکیش لێیان سزایەکەی زۆر توند بوو وەك ئەوە وابوو لە خودا یاخی بیت، لە پەیامەکانی (پۆلسی ژ:١٢) بۆ میلەتی ڕۆمان هاتوە دەسەلات تەنها بۆ خودایە هەرچی ڕووبەڕووی دەسەلات ببیتەوە لە خوایاخی بووە – دەقەکەی:(١/ لتخضع كل نفس للسلاطين الفائقة، لانه ليس سلطان الا من الله، والسلاطين الكائنة هي مرتبة من الله، ٢/حتى ان من يقاوم السلطان يقاوم ترتيب الله، والمقاومون سياخذون لانفسهم دينونة..) [٤٤] ، سیۆکراتی دەڵێ (ان الحكم الا لله)ئەوەیان لە هەمو ئاینەکانە، خەلیفە سێبەری خودایە لەسەر زەوی، ئیبن تەیمیەش وەسفی سولتان وادەکاو دەڵێ(أن السلطان ظل الله في

[٤٤] كتاب المقدس– رسالة بولس الرسول الى اهل رومية اصحاح ١٣

الأرض)[45] زیاتر لەوەش لەلایەن ئیمامەکان وتراوە ٦٠ سال لە سولتانیکی زالم باشترە لەوەی یەك شەو بێ سولتان بین، خراتر لەوەش ئۆقرە گرتن بەرامبەر دەسەلاتی ئاواو دەسەلاتی ستەمکار بە عیبادەت هەژمارکراوە، یان هەلگرتنی ئەو تووڕەییە بۆ ڕۆژی دوای لە ئینجیل واهاتوە: ((.. ومن أراد أن یخاصمك لیأخذ ثوبك، فاترك له رداءك ایضاً))[46]، کاتێ زاناو فەیلەسوف دژ بەو هەنگاوە دەوەستان ناوروناتۆرەی کافرو مولحیدو لائیکیان لێنراوە، بۆیە دەبێ ئاگاداربین لەو توومەتانە گەلێ جار پێچەوانەیە. لیرەوە (ئاین تلیاکی گەلان– الدین افیون الشعوب) لەلای مارکس ه وبارون دولباخ وزانای تر هات،هەرلەوەشەوە توومەتی جیاجیا ڕووبەڕووی ئاین بوویتەوە، تا ڕادەی جیاکردنەوە لە ژیان.

بەو شێوە دەتوانین بە خێرایی خاڵەکانی هۆی

---

[45] مجموع الفتاوی ج٢٨/٢٩٠–٢٩١

[46] – متی ٥ (٣٩ – ٤١) الکتاب المقدس العهد الجدید–

گەشەکردنی عەلمانیەت لە ئەورووپاودوایشلەجیهانی ئیسلامی کۆ بکەینەوە لە:

١. بارودۆخی سەلبی ئاینی بەگشتی وئاینی مەسیحی بەتایبەتی و نەبونی شەریعەت لەو ئاینە.

٢. گەشەی زانست و دۆزینەوە گەردوونیەکان و تیۆری پەرەسەندن.

٣. سەرهەڵدان و گەشەی فەلسەفەی مادی.

٤. گەشەی سەرمایەداری و کەرت و بەرژەوەندی تایبەت، لە بەرامبەر هەموو ئەوانەش ئایین لە کشانەوە بوو، بەشێوەیەك عەقڵ و ئایین کەوتبوونە دوو بەرەی دژ بەیەك.

٥. وەرچەرخانی ئیمپڕاتۆریەت بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی و دروست بوونی یەکەم ئەزموونی عەلمانی لە فەڕەنسا.

٦. دارمانی خەلافەتی عوسمانی و وەستانی بزوتنەوەی وشیاری لەجیهانی ئیسلامی.

بەو شێوەیە عەلمانیەت لە ئەوروپا سەری هەڵدا (یان ڕاستتر بڵێین زیندوو بۆوە بەو ناوە)، ڕاستەوخۆتر لە زەمینەی واقیعی سەلبی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینی سەری هەڵدا.

**بەرەو جیهانی ئیسلامی:**

زەمینەی عەلمانی لەجیهانی ئیسلام ناکاو و نوێ نەبوو، لەپێش ئیسلامیش بزوتنەوەیەکی فەرهەنگی بەناوی (هیلنیستیە)* لەگەڵ داگیرکردنی ڕۆژهەڵات لەلایەن ئەسکەندەری مەکدۆنی لە ٣٣٣پ.ز. دەست پێ دەکا، ئەوکاتی (ڤیساگۆرسیەکان) چەند مدرسەیەکیان دروست کرد لە هند و فارس بۆ ئەو مەبەستە،لەدوای سەردەمی زێڕینی دەسەلاتی دادگەری پیغمبەرو هەر چوار خەلیفە،نۆرەی وەرچەرخانی مەترسی دێت، بەزەبری هێز کۆتایی بە ئیسلامی ڕاستەقینە دەهێنرێت ودەسەلاتی ئەمەوی بنامەلەیی و زۆرداروگەندەل

---

* هیلنیستیە پێك هاتووە لەدوو وشە(هیل کە لەهیلاس هاتووە- جاران ئەگریکەکان بە یۆنانیان دەووت بلادهیلاس، دوای بە مانای ڕەچەلەك-یان باپیرە - یۆنانی هات، وشەی دووەم ئیست واتە ڕۆژ هەلاتی، کەواتە هیلنیستیە بەو شارستانیە ڕۆژهەلاتیانە دەووتری کە لە ڕەگی ڕۆژئاوایی ویۆنانی پێك دێت .

دەست پێدەکات، یەکەم هەنگاوی جیاکردنەوەی (قورئان) و (سوڵتان)ی داڕشت،گەیشتە ڕادەیەك خەلیفەی ئەمەوی باوەڕی بە خودا نەبوو،(ولید بن یزید٨٨-١٢٦هـ) ئەو خەلیفەیەیە ئیبن قوتەیبەو زۆربەی شارەزایان بە بێ باوەڕی وەسفی دەکەن[٤٧]، شیعری هەیە گاڵتەجاڕی بە خواو قورئان دەکا کاتێ لە قورئان بینیویەتی باسی (سزاو پاداش)دەکا دەڵێ:

تذکرنی الحساب ولست ادری   احقاماتقول من الحساب

فـقـل لله یـمنعنی طعـامی   وقل لله یمنعنی شرابی[٤٨]

لە سەردەمی ئەمەوی وعەباسی ڕا هەردوو زاراوەی ئەهلی قەلەم (زانایان)وئەهلی سەیف(دەسەڵاتداران) لێك جیا بوویەوە، ئیترپرسی تەسەوف و تەرکی دنیا..ئەو ڕیشانەی هەیە، بەرە بەرەئاینی ڕاستەقینە لە دەسەڵات و سیاسەت دوور خرایەوە لەجیاتی فقهێکی خزمەت بە دەسەلات هێشترایەوە، ئەهلی عەقل

---

[٤٧] ابن قتيبة الدينوري- المعارف - تحقيق: ثروة عكاشة ص٣٦٦، د محمد عمارة له(المعتزلة والثورة ص٧٢) به زەندیقی وەسف دەکا

[٤٨] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص٧٢

وقەڵەم بەرەبەرە پەراوێز خران،بوە هۆیزیادبوونی کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی لە سنوری خۆی زیاتر کاری لە هەندێ زانای ئیسلامی کرد، لەوانە دروشمی (إخوان الصفا و-کە بریتی بو لە: فەلسەفەی یۆنان و شەریعەتی ئیسلامی یەکتر تەواو دەکەن)[٤٩]، لە سەردەمی خەلافەتی عوسمانیش بەرەبەرە ئەزموونەکانی دوای (ویستڤالیا-١٦٤٨) وشۆڕشی فەڕەنسا١٧٨٩ هاتە نێو خەلافەت لە ڕێکخستنی سوپا و ئیدارە و دەستوور و.. ئی دی ئەو گۆتانەی وەك (دەسەڵاتی ئاسمان و دەسەڵاتی زەوی، پیاوی ئایینی و پیاوی سیاسی، نەقل و عەقل، پیاوی ئایینی بۆ مزگەوت و پیاوی سیاسیش بۆ دەوڵەت، زەوی بۆ مرۆڤ و ئاسمانیش بۆ خودا، ئایینی ئاسمانی و یاسای زەوی،..) لێك جیاکرانەوە، ئەو لێك جیاکردنەوانە بنەمایەکی بەهێزی بۆ عەلمانیەت سازدا، تا ئایین و دەوڵەت تەواو لێك بترازێ،سلیمان قانونی (قانون نامە) بلاوکردەوە سودی لە یاسای جیهانی نا

---

[٤٩] مسعودعبدالخالق-رەوشی فلسفی سەدەی٢١ ل٨١

ئیسلامی وەرگرت، دوایش هاوسەری لەگەڵ رۆکسیلا کرد کە خانمێکی یەهودی زۆر ژیر بوو،لەوەوە هەندێك پێیان وایە ریشەی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی بۆ ئەو خانمە دەگەڕێتەوە،لە ساڵی ١٨٢٦ز بۆ یەکەم جار بەرگی سوپای خەلافەت بووە ئەورووپیانە لە سەردەمی سوڵتان محمودی دووەم، لەساڵی ١٨٣٩ لە سەردەمی (سوڵتان عەبدولمەجید) دەستورێکی تێکەڵ بەنیوە عەلمانی(پیك هاتو لە بنەماکانی شورشی فرنسی) و نیوە ئیسلامی داڕێژرا، بۆ یەکەم جار لە مێژووی خەلافەت* دەستورێك داڕێژرا کە (سەرچاوەی بەتاقی تەنها شەریعەتی ئیسلام نەبێ)،تا کۆتای سەدەی ١٩ بارودۆخ زۆر گۆڕا، چەندین نووسەر و فەرهەنگ نووس و ڕێبازی عەلمانی لەگەڵ بزوتنەوەی مەشروتیەت (دەستوری) لە نێو عوسمانی

* لەسەردەمی سەلیمی قانونی (گول خانە )دەرچو دوایش (خگ همایۆنی ..)هەندێ فەرمانی تریش بەلام ئەو شێوازەی وەرنەگرت ببتە شریك لەگەل شریعەت .

دروست بوو، لەساڵی ١٨٧٦ عوسمانیەی لاو دروست بوو،دوای حیزبی ئیتحاد تەعالی و تەرەقی تورکی لە ١٨٨٩لە یادی سەد ساڵەی شۆرشی فرنسی دروست بوو، تیایدا بیری نەتەوەیی و لیبرالی لە جیاتی بیری ئیسلامی داهێنا، نکین ئەلب (٥) بەرگی (توران)ی نووسی وەك تیۆری نەتەوەی تورك لە جیاتی شەریعەت، چەندین ناوەند و سەنتەر و حیزبی تری عەلمانی لە سەرانسەری سنووری خەلافەت دروست بوو، چەندین ڕەوشەنبیری عەلمانیش لە تورکەکان وەك نەوەی یەکەمی عەلمانی هەژمار دەکرێن لەوانە: مدحت پاشا، نامق پاشا، تکیلن ئەلب، زیا ئەلب کۆك، أنور پاشا،..تا پەیدابوونی ئەتاتۆرك خەلافەتی هەڵوەشاندەوە لە ١٩٢٤/٣/٣ یەکەم کۆماری عەلمانی دروست کرد، کەواتە ئەو بزوتنەوەیە لە معاویە دەستی پێکرد لە ئەتاتۆرك کۆتایی هات، ئیتر بەرەبەرە سیستەمی عەلمانی هەمو جیهانی ئیسلامی گرتەوە.

زۆربەی ئەفریقیاو ئاسیاشی گرتەوە،لەلایەن ئەتاتوركەوە شەش بنەماكەی عەلمانی لای ئەندۆنیسیاش بنەماكانی پانسلیشای عەلمانی جاڕدران، زۆر سەركردە و سیاسەتمەداری جیهانی تر ڕۆڵیان بینی لە هێنانی عەلمانیەت، كاریگەرییان لەسەر جیهانی ئیسلامی و عەرەبی هەبووە، لەوانە: سوكارنۆ، نەهرۆ، سۆهارتۆ، غاندی،.. لە جیهانی ئیسلامیشدا رابوونێكی عەلمانی سەرتاسەری سەری هەڵدا و بەرەبەرە جێی خەلافەت و شەریعەتی ئیسلامی گرتەوە، خدێوی ئیسماعیل لە ١٨٨٣ یاسای فەرەنسی هێنا ناو میسر، هەندێ ولاتیش لەگەڵ داگیركردنی لەلایەن ڕۆژئاوا عەلمانیەتیان هێنا جێی شەریعەت، لەوانە جەزائیر ١٨٣٠، عێراق و ولاتی شامیش لەگەڵ دروستكردن و داگیركردنی، تونس یاسای فەرەنسی لە ١٩٠٦ پەیرەوكرد. مەغریب لە ١٩١٣، زۆربەی ئەفریقیاو ئاسیاشی گرتەوە،لەلایەن ئەتاتوركەوە شەش بنەماكەی عەلمانی لای ئەندۆنیسیاش بنەماكانی پانسلیشای عەلمانی جاڕدران،... ئیتر

لەو کاتیەوە چەمکی عەلمانیەت بلاوترین زاراوەیە، بە پێ ی هەریەکە لە (د.محمد عمارە، د.احمد فرج..) یەکەم (فەرهەنگ) کە عەلمانیەتی لە جیاتی سیکولاریزمی ئینگلیزی و لائیکی فەرەنسی بەکارهێناوە فەرهەنگی (عەرەبی-فەرەنسی) لویس بەستەری میسری بوو لە ساڵی ١٨٢٨ کە لە ڕیزی سوپای فەرەنسی داگیرکەری میسر ئیشی دەکرد[٥٠]، بۆیە (علمانی) داناوە تا بەرەی "علم"وەرگرێ، واتە ئەنقەستی تیابووە، سەرنج بدە لە کوردیش (رامیار) لەجیاتی سیاسەت هاتووە واتە (مەکریان) کە گوزارش لە ڕێبازی میکافیلی دەکا، نەك هەموو سیاسەت بەهەمان شێوەش هەڵبژاردنی ووشەی عەلمانیەت وایە، لویس بەستەر (Laigue) فەرەنسیەکەی وا تەرجەمە کردووە بە (علم)، چونکە لە Lagos ی فەرەنسی مانای (علمە)، جۆرە دزیەکە. وەك سەرقافڵەی داگیرکەر هەردەم نووسەر و

[٥٠] ا-معرکة المصطلحات- د.محمد عمارە ص٦٤. ب-علمانی و علمانیە- د.احمد فرج.

ڕەوشـەنبیری وا هەبووینـە و هەنـە، بـۆ جـێ گیركردنـی چـەمك و پێناس و پێوانەكانیان، عەلمانیـەت و بەشێك لـە عەلمانیـەكان لـە ئەسڵدا ئەو پێشەنگە بووینە.

لـە نـاو عـەرەبیش نـەوەی یەكـەمی عەلمانیـەت بـریتین لـە:(نجیـب عـازوری، احمـد لطفـي سـید، سـاطع الحصـری، اسماعیـل مظهـر، قاسـم أمـین، طـه حسـین، محمـد عـزة دروزة، سەلامة موسی، انطوان سعادة، علی عبدالرزاق، بطرس بستانی، شبلی شمیل، فـرج أنطـوان، میشـیَل عفلـق، جمـال عبدالناصـر..) لەسـالی ١٩١٨ لەمیسـر ڕاسـتەوخۆ حـزب دروسـت بـوو بـەناوی (حزبی عەلمانی دوای ناوی گۆڕا بۆ حزبی وەفد(ئیستاش ماوە)، پیشووتر خدێوی ئیسماعیل لە ١٨٨٣ یاسای فەڕەنسی هێنا ناو میسـر، هەنـدێ ولاتـیش لەگـەڵ داگیركردنـی لەلایـەن ڕۆژئـاوا عەلمانیـەتیان هێنـا جێـی شـەریعەت، لەوانـە جـەزائیر ١٨٣٠، عێـراق و ولاتـی شـامیش لەگـەڵ دروسـتكردن و داگیركردنـی، تونس یاسای فەڕەنسی لە ١٩٠٦ پەیڕەوكرد. مەغریب لە ١٩١٢،

ئەوەی یەکەمی حزبەکانی عربی دروست بوون،یەکەمیان الجمعیة السوریة لە ١٨٥٧ دروست بوو، دوای جمعیة العربیة لە ١٨٧٥، دوای ئەوانەی خوارەوەش دروست بون:

١. جمعیة العربیة، ١٨٧٥م لە دمشق وتەرابلس. ٢. جمعیە بیروت ـ سالی ١٨٨٠م.٣ـ جمعیة حقوق المراة، ١٨٨٠م. ٤ـ جمعیةالسوریة الفتاة . ١٨٨٩، سەرۆکەکەی جمیل معلوف ٥ـ جمعیة الوطن العربي دامەزرێنەری خیرالله خیرالله، ١٨٩٥م لەباریس.٦ـ جمعیة رابطة (الوطن العربي)، نجیب عازوری دایمەزراند لە ١٩٠٤م لە باریس.٧ـ جمعیة الشوری العثمانیة، مصر . ١٩٠٧ . ١٩٠٨م.٨. جمعیة الأخاء العثماني . ١٩٠٨م لە استانة.٩ـ جمعیة القحطانیة، خلیل حمادە دایمەزراند لە ١٩٠٩م١٠ـ جمعیة العربیة فتاة لەپاریس، ١٩١١م.١١ـ حزب اللامرکزیة، ١٩١٢مـم.١٢ـ جمعیة بیروت الإصلاحیة، ١٩١٢م، لقەکانی چوە: دمشق، بیروت، حلب، بغداد، البصرە، الموصل..١٣ـ حزب العهد، ١٩١٢م لە نێو ئەفسەرانی

عراقییەکان.١٤ـ جمعية العلم الأخضر، د.فائق شاكر . ١٩١٣م.
١٥. جمعية العلم . ١٩١٤م[٥١].

**نەوەی یەکەمی عەلمانی کورد:**

هەروەك لەسەرەوە باس کرا بۆ هەر میلەتێك هۆکارو زەمینەی گشتی هەبوە بۆهاتنی عەلمانیەت لەهەمان کات هەندێ هۆکاری تایبەتیش هەبوە،بۆ کوردستانیش هەمان شێوازی وەرگرتوە، بەشەگشتیەکەی هاوبەش بوە لەگەل میلەتانی ناوچەکە لە تورك وعەرەب وفارس وئەوانی تر،وا دەردەکەوێ یەکەم جار تورك پێشڕەو بووبێت یان عرب یان فارس..ئاوا نیە، زۆربەی پیشڕەوانی عەلمانی نێو دەولەتی عوسمانی تورك نەبووینە،زۆربەی عەلمانی نێو عربیش مسیحی بووینە، گۆتەی(تا ئەوروپا لە کۆت و زنجیری ئایین ڕزگاری نەبوو پێش

---

[٥١]. لەو سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە: ا- الموسوعة الميسرة.. ص٤٤٤-٤٤٥، ب- دراسات في الوطن العربي.... ص٦٠-٦٤. ج ـ الصحوةالرجل المريض.. ص٣١١ د. الاسلام والعلمانية... ص٨١

نەكەوت، ئاواش ئێمەى جيهانى ئيسلامى تا لە ئايينەكەمان ڕزگار نەبين پێش ناكەوين ) زۆر باوى هەبوو، لەنێو تورك لەلايەن ئيتيحاد تەرەقى و كەمالى وتۆرانيەكان دەگۆترا سيستەمى ئيسلامى و عوسمانى زيانى بەيەكرێزى جيهانى تورك هێنا و شكستيشى لەجەنگى جيهانى يەكەم (١٩١٤-١٩١٨) زياتر توندى كردوون، بەتايبەتى دواى سەردانەكەى شاى ئەڵمانيا (ڤلهالم دوەم) لە پيش جەنگ كە ئامۆژگارى كردبوون تورك گرنگى بە ئاسياى ناوەڕاست بدا كە هەمووى توركن باشترە لەرۆژهەڵاتى ناوەڕاست.

لە نێوعەرەبيش دەڵێن عەرەب بوە قوربانى ئيسلام، ساتيع حصرى دەڵێ عەرەبايەتى ڕەسەن ترە لە ئايين، لەكاتێكدا سێ ئايين گۆڕا بەڵام عەرەب هەر عەرەبە، مەليك فەيسەڵيش لە وتارێكى وتبووى (ئێمە عەرەبين پێش محمد و عيسا و موسا)[٥٢]، (ئيبراهيم احمد)ى شاعير و بيريارى كورديش بەهۆنراوە دەڵێ:

---

[٥٢] العلمانيه والدوله الدينيه ص٣٩.

ئێمە کوردین و هەرکورد دەبین،..پیشی ئەدیان هەر کورد بووینە..

هەردوو لای عەلمانی تورك و عەرەب پێیان وایە ئیسلام هۆکاری دواکەوتن و پارچەپارچەبونیانە،لەهەموان خەست تر شبلی شمیل لەکتیبی(فلسفة النشوء والإرتقاء) بانگیشەی ئەوەی دەکرد کە (ئاین فاکتەری پەرتەوازەی ئومەی عربیە)، هەرچی ڕیشەی عەلمانیە لە کوردستان لەمێژوودا لە دوای ئیسلام سەرییهەڵنەداوە، ئەو تومەتەی دەهری کەدراوەتە هەندێ زانای گەورەی کوردی وەك سیف الدین ئامدی ئەوا لەچوارچێوەی ململانێی نێوان فقهو فلسەفە بوە، شۆڕش و شەڕ لەگەڵ سوڵتانی ئایینی کراوە، بەڵام دەهری وئیلحادی لێ دروست نەبووە، ئەگەر سەرنج بدەینە ئەوەی یەکەمی ڕۆژنامەوانی کوردی هەر ئاینی و دوور لە عەلمانی بوە،جگە لە گۆڤاری مەشروتیە(کە شریف پاشاسەرپەرشتی دەکرد )جارجاربەلای لائیکی وعەلمانی دەچوو،سەرنج بدە لە

بڵاوکراوەی (مەشروتیەت) بە پێنووسی (شەریف پاشا)ی کورد لە (ژ:٤٠ی ساڵی ١٩٠٣) چۆن نووسیویەتی: (ئەوەی دەیسەلمێنێ کورد ئازاد بووینە و ئازادیخوازن ئەوەیە کە ئافرەتانیان هەرگیز پەچە ناپۆشن)[٥٣]، ئەوەی پێی دەووترێ تاك وتەرای عەلمانی کورد دروست ببوو زۆربەیان لە ژینگەیەکی بیانی، لەلایەن ئەوانەوە هەمان بەڵێنی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی و سەربەخۆیی بە کورد درا. ئەوە مانای پێش کەوتنی وەرگرتبوو، بە هەمان ڕووکار هەندێ لایەنی هونەر و وێژەی کوردی بەرە بەرە ناوەڕۆکێکی عەلمانی وەرگرت.

بەو شێوەیە لەناو کوردستانیش لە سەرەتا بیری عەلمانی لاواز بوو ،زەمینەی مێژووی کەمتر گونجاوە، بۆیە ئەوەی یەکەمی عەلمانی ئەوەیەکی خۆماڵی نابێت،عەلمانیەکەیان لە هۆکارو زەمینەی کوردستانی ئەشونمای نەکردوە، بەلکو لەزەمینە گشتیەکەی عوسمانی سەری هەڵداوە، دوای ئەوەی

[٥٣] بڕوانە : ڕۆژنامەکەری کوردی بە زمانی فەرەنسی.

پرسی نەتەوەیی بۆ کورد دروست دەبێت لەدوای سالانی ١٩٠٨ ئینجا بەرەبەرە ئەو بیرە لەکوردستانیش لەگەل بیری نەتەوەیی وکوردایەتی تێکەل دەبێت، عەلمانیەتی کورد لە ڕێی دۆزی نەتەوەیی هاتۆتە ناو کوردستان، یەکەم جار وەك باڵێك لە ناو نەوەی یەکەمی حزبە کوردیەکان.

**ئەو نەوەیە و نەوەی یەکەمی حزبەکوردیەکان:**

لەسەرەتادا سیستەمی عوسمانی دژی دامەزراندنی حزب بوو،فتوای شیخ الاسلامی عوسمانیش هەبوو،بەلام لە ١٩٠٩/٨/٣ یاسای (الجمعیات)ی عوسمانی دەرچوو،ڕێدرا حزب وکۆمەل دروست بکرێت، ئیتر حزبەکان لە نهێنیەوە هاتنە مەیدانی ئاشکرا، هەروەك یەکەم جار بیری عەلمانیەت نەهاتە ناو کوردستان یەکەم جزبی عەلمانی لەناو کوردستان دروست نەبوو بەلکو لەناو تورك دروست بوو، بریتی بوو لە ئیتحادو تەرەقی کەلە سالی ١٩٨٩ دروست بوو، (٢)لە (٤)دامەزرێنەرەکەی (اتحاد الترقی) کورد بوینە. دامەزرینەرەکان بریتی بوون لە:دعبالله

جودت لـە عربگير لـەدايك بوەو كورد بـوە، ئيسـحاق سكوتلی لـە دياربـەكركوردبوە، ئيـبراهيم تەمۆـ ئـەرنائوتی بـوە، محمدرشـيد چەركەسـی بـوە..هيچيان تـورك نـەبوون، ئەوانـەی ڕۆلی گرنگيـان بينـی لـە تـەغريبی عوسمـانی ووەرچـەرخانە گـەورەكانی كۆتـايی عوسمـــانی عـــەيرە تـــورك بووينـــە،بەشـــێكی زۆريـــان كـــورد بووينـــە،ئەوانـــە بەشـــێكن لەنـــەوەی يەكـــەمی عـــەلمانی كـورديش،بـريتين لـە: د.عبداللـە جـووت، د.ئيسـحاق سـكوتلی، فكـری لـوتفی، زيـا ئـەلب كـۆك، عصـمت ئينينـۆ، بەشـێك لـە بەدرخانيەكان،شـريف پاشـا..زۆری تـريش، بـە پێـی هەنـدێك سەرچاوە ئـەوەی بناغـەی پەيوەنـدی نێوان ئـەلمانياو عوسمـانی ڕێكخسـت ولەدوايـدا پێكـەوە كەوتنـە بەرەيـەكی جـەنگ شـريف پاشای كورد بوە، ئـەوەی پيتـی لاتينـی هێنـا نـاو عوسمـانی هـەر كـورد بـوو (د.عبداللـە جـودت) بووـ لـە ڕاسـتێدا ئـەو پيـاوە مونەزيری توركيای نویێ بوە نـەك مستـەفا كمـال، ڕەوشـەنبيرانی تـورك و عـەرەب كـەمێك لـە پـێش سـەدەی (٢٠) بيروبـاوەڕی

نەتەوایەتیان لە نێو بڵاوببۆوە، زیا کۆك ئەلبیش هەر کوردبوە خاوەنی تەنزیری تۆرانی بوە، بەو شێوەیە نەوەیەکی ئەفەندی کاریگەر بە ئاڕستەی پیچەوانەی عوسمانی لە نێو جەرگەی عوسمانی دروست بوو زۆربەی کوردبوون، هیشتا ئەو جم وجۆلە نەگەیشتبوە ناو کوردستان، دوای ئینقلابی ئیتحادوتەرەقی لە ١٩٠٨ و دوای لادانی سولتان عبدالحمید ئینجا ناسنامەی ئیتحادیەکان دەرکەوت و کوردایەتی و حزبی کوردیش دروست دەبێت.

لەبارەی یەکەم حزب لە کوردستان ڕای جیاجیا هەیە، بەپێی چەند سەرچاوەیەك (یەکێتی محمد)ی کە لە سالی ١٩٠٨دروست بوە یان ١٩٠٩) بەسەرۆکایەتی سعید نورسی یەکەم بووە، بەلام بەپێی بەڵگەنامەکانی ئەرمەنی (یەکێتی کورد) بە ڕابەرایەتی (شێخ عبیداللە نهری)لە سالی ١٨٨٠دروست

بووه[**] ، بەپێی چەند سەرچاوەیەکی تریش (کۆمەڵەی عەزم-عزم قوی جمعیتلر) لەساڵی ۱۹۰۰ دروست بووه بریتیە لە یەکەم حزب[٥٤]،لەلایەکی تریش لەسالی ۱۹۰۷لەشاری دهۆك لەمالی شێخ محمـــد بریفکـــانی لەکۆبونەوەیـــەکی فـــراوان (پەیوەنـــدی کـــورد)بەســـەرۆکایەتی شـــێخ عبدالســـلام ڕاگەیـــەنراو، لـــە بەلگەنامەکانی بەریتانی وفرنسی ناوی دەستەیەك لە کۆمەل و ڕێکخـراوی سیاسـی ونـا سیاسـی تـر بـەو شـێوە هـاتوە:دەڵێ کۆمەڵـەی عـەزم لـە سـالی ۱۹۰۰ز دروسـت بـووە لـە ئەسـتەمبۆل بەسـەرۆکایەتی ئەحمـەد ڕامـز، جەمعیـەتی نەشـری مـەعاریفی کوردلـە۱۷\۱۷\ ۱۹۱۲لەئەسـتەمبۆل- عبـد الرحمـان بـدرخان،

---

[**]لـە سـالی ۱۸۸۰ لەنـەمری کۆبونەوەیـەکی فـراوان بـۆ سـەرۆك عەشـیرەت وکەسایەتیەکان کراو تیایدا شێخ گوتارێکی ئاینی وسیاسی خوێندەوە و وتی : پێش نزیکەی ٦سەدەعوسمانی دەسەلاتی گرتۆتە دەست بێ دەنگ بووین بەلام ئیستا بەرەو عەلمانیەت دەڕوا حەتمەن تێك دەچێت، کاتی یەکگرتمان هاتوە، بەو شێوەیە کۆمەڵەی کورد لەوێ ڕاگەیەنرا ، بۆ زیاتر بڕوانە :جلیلی جلیل-الإنتفاچە و خالفین –صراع علی کوردستان والکورد والدوله العپمانیه .

[٥٤]بروانەد عبدالله جودت والقومیه الکردیه – ص۲۷ .

جەمعیـەتی هێڤـی کـورد، جەمعیـەتی مـوحیبی کـورد، (یـان کوردسـتان محبـی جمعیتلـر . د نـوری دەرسـیمی))، کۆمەڵـەی جیهـانزانی، کـورد ئیسـتقلال قومیـەتی، کۆمەڵـەی ئیرشـاد لەئـەرزەرۆم، کۆمەڵـەی دیفـاع لەهـەژاران، کۆمەڵـەی برسـیان، کۆمەڵەی دۆستایەتی کورد،..ناوی زۆر دەستەو تاقم هاتوون، بـەلام بەشـی زۆری مێژووناسـانی کـوردو بەلگەنامـەکان یەکـەم حزبـی گـەورە (تعـالی وترقـی کـورد جمعیتلـەر) دروسـت بـوە لـە ٢/تشـرین یەکـەم/ ١٩٠٨،دامەزرێنـەرانی بـریتین لـە: زو الکفـل، ئـەمین عـالی بـەدرخان شـێخ عبـد القـادر ئـەمین،..)، خـەڵکێکی مافنـاس و ئـاینی و ئەفسـەری تیـابوو، لـەویش تـاك وتـەرای عـەلمانی تێـدا بـوو، دوو ئاڕسـتەی تێـدا بـوو،زۆربـەی دامەزرێنـەرانی ئەوانـە بـوون لـە ئیتحادوتـەرەقی تـورکی هەلگڕابوونـەوە،بەشـێکیان بـە هـۆی عـەلمانی بـوونی ئیتحادوتـەرەقی بەشـەکەی تـر بـە هـۆی تۆرانیەتەکـەی، ئـەو دوو لایە یەکڕا نەبوون لە پرسەکان، لـە دنیا بینیـەکان دوای وەك بالی

عـەلمانی وئـایینی لـێ دەرکـەوت،بـاڵی عـەلمانی بێسـەروبەر بوون،بەتایبەتی (شریف پاشا) نوێنەرێکی وریای کورد بوو لە رێکەوتنەکانی ئاشتی لە پاریسبەشدار بوو، بەڵام ماندووناس و پیاوی ڕابواردن بوو، لەبارەی پەیوەندیان بە عوسمانی و پرسی مافی چارەنوسی کوردستان دووڕای جیای تێدابوو یەکەمیان داوای سەربەخویی تەواوی بۆ کوردستان دەکرد دووەمیان کۆنفیدرالیەك بە ناوی جامیعەی ئیسلامی.

**یەکەم زیان و( شکست )ی کوشندەیان:**

لەبـەر ئـەوەی ئـەوەی یەکـەمی عـەلمانی کـوردی زادەو هـەلقولاوی بـارە کۆمەلایەتیـەکانی کـوردەواری نـەبوون،زۆربـەی خـەلکانێك بـوون لـەدەرەوەی نـەریتی کـوردەواری دروسـت ببـوون،بۆیـە زیانـەکانیان زیـاتر لـە ئاسـتی نیشـتمانی بـوو نـەك کۆمەلایـەتی، ئەوانـە لـە قۆنـاغێکی وەرچـەرخان بـوون،هەنـدێکی دلسۆزیشـی تێـدا بـوو بـەلام قۆنـاغی داهـاتوو لایـان ڕوون نەبوو،بۆیە کەوتنە هەلەی کوشندە،هەر لەلایەنگیریان بۆ هـاتنی

عەلمانیـەت وئینجـا ئیتحادوتـەرەقی و ئینقلابەکـەی ١٩٠٨ تـا دەگاتـە ململانێـی ئـەتاتورك وسـولتانی عوسمـانی،خراتـر لـەوە عـەلمانی کورد خۆیـان نەخستە پال هاوپـەیمانان،چونکە ئەوان (رۆژئاواییە سەرکەوتوەکان لە جەنگی جیهانی یەکەم)شـارەزا تـر بوون،ئەوان ئەو دیوی قۆناغی نوێیان لێدیار بوو،ئەو میلەتانـەی بە هۆی ئینتداب یان ڕێنمایی تر ئیستعماریان لە پشت بوو باش تر بوون لەوانەی بێپشتیوان بـوون، ئـەوەی یەکـەمی عەلمانیـەتی کورد لـەو بـاوەرە دابـون کـە چارەنووسـی کـورد بەعـەلمانی چـاتر دەبی نەك ئیسلامی، لەسەر ئەو بنچینەیە لایـەنگری ئـەتاتورکیان کرد لە دژی سیڤەر و عوسمـانی لـە نێـوان ١٩٢٠ تـا ١٩٢٣، بۆیـە لــەنێو کــوردیش بەوهۆیــەوە بونــە دوو بــەش، لــە ڕاســتێدا سەرچـاوەی بەشـبونیان لـەوەوە دێـت ئاینیـەکان بانگێشـەی برایـەتی تـورك وکوردیـان لـە چوارچـێوەی جامیعـەی ئیسـلامی دەکرد، لەو ڕوەشـەوە ڕێکـەوتنێکی بـاش لـە نێـوان وەفـدی بـالای کوردو عوسمـانی مۆر کرابوو،سولتان لەگـەل کـورد ڕێکـەوت بـۆ

سەربەخۆیی پێدان، دوای دوو وەفد پێك هات لە هەردوولا، نوێنەرانی کورد پێك هاتبوو لە: عبدالقادر شەمزینی (سەرۆك)، ئەمین عالی بدرخان، مراد بدرخان، مەولان زادە رفعت بەگ، لە لایەن نوێنەرانی عوسمانیش پێك هاتبوو لە: دووەمین کەسایەتی نێو عوسمانی شیخ الإسلام صبری زادە(سەرۆك)، ئەحمەد عبوق پاشا، عونی پاشا لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی .

لەسەر ڕەزامەندی هەردوولا سوڵتان قایل بو کە ئەو ڕێکەوتنە ببێتە بەڵگەنامەیەکی جهانی و بۆیە ناوەرۆکی ئەو ڕێکەوتنە لە ١٩٢٠/٨/١٠ لەسیڤەریش بەرجەستەکرا، ئەگەر بەوردتریش بچینە نێو بابەتەکە دەبینین ئەو ناوەرۆکە یاسایی و سیاسیەی لە سیڤەر هاتووە، هەمان نەخشە و پلانی سەرکردە کوردەکانی ئەوسایە، بەتایبەتی شێخ عبدالقادری شەمزینی و ماڵی بەدرخانیەکان (ئەمین عالی بەدرخان)[٥٥] کە بەداخەوە بەشێك

---

[٥٥]. بڕوانە: (فایلی دواڕۆژی کوردستان . بەریتانی) لە ل٨٢، (کوردوکوردستان لە بەڵگەنامەی بەریتانی . کەمال مەزهەر)

بەشێوەیەکی تری لێ تێگەیشتوون، پێیان وایە ئەوە لە دەسکەوتی عەلمانیەتی کوردەو مانیعەکەی شێخ عبدالقادرو ئاینیەکانی تر بوە، ڕوونیان نەکردۆتەوە کە ئەو ڕێکەوتنە لە لایەن عوسمانی مۆرکراوە نەك کەمالیەکان، لەوانە مێژوونوسی کورد د.کەمال مەزهەر[٥٦]، هەروەها بڕوانە نارازیەکانی تر لە (ل٧٦ی کتێبی مالمیسانژ: القومیە الکوردیە ود. عبدالله جودت)، هەروەها کریس کۆچیراش وای بۆچوە..بەڵام هەر هەمان کتێبی (د.کەمال) دەقی گفتوگۆیەکەی (شێخ عبدالقادر) لەگەڵ ڕۆژنامەی (ئیقدام) تۆمارکردووە بەجوانی ئەوە ڕونکراوەتەوە کە شێخ عبدالقادر و ئاینیەکان چیان دەوێ، پێیان وابوو لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی ئۆتۆنۆمی وەرگیرێ بۆ ماوەیەك وەری دەچەرخێننە سەربەخۆیی تەواوی کوردستان[٥٧]،

---

[٥٦]. بڕوانە: (د.کمال مظهر. کورد و کوردستان...) ل٧٦

[٥٧]ــ بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە کورد لە بەڵگەنامەی بەریتانیا ژمارە: ٤٠، f٠.٣٧١/٥٠٦٨ بۆ وەزارەتی دەرەوە ١٩٢٠/٤/٨.

بۆ زیاتریش بڕوانە دەقی نامەکەی شێخ عبدالقادر بۆ فەڕەنسا کە لە ١٩٢٠/٦/٢٥ نوسیتی[٥٨]، ئەو پڕۆژەیە لەلایەن فرید پاشای سەرۆکوەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی (ئەستەمبۆل . سوڵتان واحدالدین) بە فەرمی مۆرکراوە[٥٩]، دیڤید ماکدۆناڵدیش هەر وای بۆچوە لە کتێبەکەی خۆی و ئۆتۆنۆمی سەرەتای سەربەخۆیی بوە چ لە ڕێی ئینتداب چ لە ڕێی ئۆتۆنۆمی. لەبەڵگەنامەیەکی تریی بەریتانی (FO.٣٧١/٥٠٦٧) کە لە ل٣٢٦ی هەمان سەرچاوە هاتوە دەڵێ: فەریدپاشای سەدری ئەعزەمی عوسمانی لایەنگیری دروست بونی دەوڵەتی کوردی کردوە، ئینجا دەبێ ئەوەش وەبیر بهێنینەوە کە(سوڵتانی عوسمانی وفرید پاشا) علی ئیحسان پاشایان ڕاسپارد بە بروسکەیەکی فەرمی لە

[٥٨] - کۆمەڵەڕێکخراوەکوردیەکان لەبەڵگەنامەکانی بەریتانیاوفرنسالەبەلگەنامەی ژ:٤٤ و ل١٥٩ بلاوکراوەتەوە

[٥٩] د عثمان علی - دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص٣٢٥، هەروەها بڕوانە: بە ڵگەنامەی بریتانی ٥١٢Air تەلەگرام لە ١٩١٩/٤/١٨.

۱۹۱۹/۱۰/۳۰ مومتەلـەکاتی عوسمانیـان تەسـلیمی حکومـەتی شێخ محمود کردو دانیشیان پێدا هێنا..

هەرچی ئەو بەشە عەلمانیە کوردە بوو بانگێشەی برایەتی کورد و تورکیـان لـە چوارچێوەی دەوڵـەتی مۆدێرنی تورکیا بـە سەرکردایەتی ئەتاتورك دەکرد[٦٠]، بە پێی بەڵگەنامە بەریتانیەکان کـە لەسـەر زاری(بیرتـرام دیکسـۆن) وەرگـیراوە لـە سەرانسـەری کوردسـتان لـە هەلچـوون بووینـە دژ بـە ئیتحـادی و زالکردنـی تورکایەتی ودابەشی کوردستان، سەرجەم بە سـەرکردایەتی ئـەو (٦) سـەرکردە ئاینیـە بـوە لـەدوای ۱۹۰۸ تـا دوای جـەنگ:( مـەلا سـلیم بـدلیس، رشـید ئاغـەی سـلێڤانی، عبـدالرحمن شـرناخی، شـێخ نـوری بریفکـانی، شـێخ عبدالسـلام بـارزانی، شـیخ سـعید الحفیـد)[٦١] هەریەکـە لـە شـێخ عبـدالقادر شمزینـی و شـریف

---

[٦٠]. بۆ تێگەیشتن زیاتر بە ووردی مێژووی دعبداللە جودت بخوێنەوە لەکتێبی: (القومیە الکردیە ود عبداللە جودت) خۆی بە نازناوی کوردی– تورکی ناوزەد کردووە.

[٦١]. دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص١٥٤

پاشا[٦٢] و شێخ سەعید پیران و نەوڕەسی و هەندێ لە بەدرخانیەكان و هەندێ دەستەی تری كوردی و ئایینیەكان[٦٣].
پێیان وابوو ئەوەی مستەفا ئەتاتورك دە یكا فرۆفێڵ و تاكتیكە و دەستكەوتەكانی كورد لە ئەستەمبۆل و پەیماننامەی سیڤەر هەڵدەوەشێنێتەوە[٦٤]، دوای ئەوەی عوسمانی بەرەو هەلوەشانەوە

[٦٢] ـ بەشێك لەكوردە نیشتمان پەروەرو بیر تیژەكان زوو تر هەستیان بەوە كرد كەئەوەی ئەتاتورك دەیكا ماڵ وێرانیە بۆ كورد زوو لێی هەلگەڕانەوە ، شریف پاشا لە سەرەتا زۆر بەلای پرۆژەكانی ئاینی وئەستەمبۆل دا نەبوو دوای ئەو هەلویستەی وەرگرت كە بینی هادی پاشای نوێنەری سولتان ئامادەیە بچێتە سیڤەر لەسەر مافی تەواوی كوردستان مۆری بكا ، ئینجا لە ٤/٢٣/ ١٩٢٠شەریف پاشا بروسكەی ڕێزی بۆ سوڵتان لێدا لە بەرامبەر هەڵوێستی چاكی بەرامبەر كورد.
[٦٣] . دیڤید ماكدۆنال ناوی لەوانە نابوو كوردی ئەستەمبۆلی.
[٦٤] ـ بۆ وورد تر بڕوانە ئەو بەلگەنامەیەی بریتانی چۆن عبدالقادر شەمزینی ئامۆژگاری ئەفەندی وسەرۆك عەشیرەتەكان دەكا كە دوای ئەتاتورك نەكەون:
مذكرة حول السيد عبدالقادر الشمزيني وسمكو من المندوب السامي البريطاني / القسطنطينية (٢٠ مايس ١٩٢٢)
...... واشتكى السيد عبدالقادر بأن كل المناشدات التي قدمها للحكومة صاحب الجلالة لم تلق آذاناً صاغية و انه فشل في كسب ثقة جلالته. وكرّر، كما فعل ذلك

ڕۆیشت ئاینیەکان دروشمی سەربەخۆییان هەڵگرت، هەروەك لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی یاداشتی (یانەی ناوەندی کوردستان) تێدایە لە بەرواری ۲۰/۳/ ۱۹۲۰ داوای سەربەخۆیی تەواوی کوردستان دەکا، بەشەکەی تر(لائیکیەکان) وەك لە بەڵگەنامەی بەریتانی لەلایەن جێگری مەندوبی سامی بەریتانی لە۱۸/ مایس/۱۹۲۰ ناردوە و دەڵێ (ناحەزانی سەید عبدالقادر) بریتین لە دەستەیەکی زۆر لەیەك نەچوو هی ئەوتۆیان تێدایە زۆر حەزیان لە سەربەخۆیی کورد نیە، زیاتر لەگەڵ ئەتاتورك ڕۆیشتون[٦٥]، بەشێکی تریش سیخوڕیان دەکرد وەك ئەو کۆمەڵە ڕەوشەنبیرە کوردەی لەدەوری (مێجەر سۆن) لە هەوڵی ئەوە بون

---

عدة مرات، بأنه كان في موقع يساعده على السيطرة على الكرد في الولايات الشمالية الشرقية، لو اعطيت له الفرصة للتحرك. واكد هذه المرة وبثقة على قدرته بإقناع سمكو للعمل وفق مصالحنا واضاف انه لا طائل من الاعتماد على اشخاص مثل مصطفى باشا وآخرين الذين يحومون هنا وهناك. هؤلاء ليس لهم تاثير حقيقي على الكرد.

[٦٥]ـ دەقی ئەوبەڵگەنامەیە لە(ئیجابیەکانی سیڤەر ـ دەقەکانی سیڤەر وخوێندنەوەیەکی تر) بلاوکراتەوە.

بەریتانیا لە شێخ محمود بڕەنجێنن بەناوی ئەوەی شێخ ئاینییە[66]، (وەك لازاریف)دەڵێت: هەندێك لە بنەماڵەی بەدرخانیەکانیش (لائیکیەکانیان) خەریکی دانوستان بون لەگەل ئیتیحادیەکان داوای پارچە زەوی گەورەو ۲۰۰۰لیرەیان کردبوو[67]، ڕەفیق حلمی فەروەیەکی بەدیاری لەلایەن شێخ محمود بۆ سوڵتان لەئەستەمبۆڵ بردبوو، لەڕێگا ڕای گۆڕی و کردیە دیاری بۆ ئەتاتورکیەکان لەئەنقەرە، ئەو دەردە گەیشتبوە کوردەکانی دەرەوەی وڵات، لە بەڵگەنامەی بەریتانی ژ:۲۱ لە ۱۹۲۹/٤/۱۸ بۆ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا نوسراوە دەڵێ: مانگانە یارمەتی۶۰.۰۰۰$ یان بۆ ئەتاتورك دەنارد تا بزوتنەوەی خۆیبون تێیانیگەیاند کە ئەتاتورك چیە و یارمەتیەکەی پێ وەستاندن، تەنانەت ئیحسان پاشاش کە لەدواییدا لە ۱۹۲۷بە شۆڕشی ئاگریداغ هەڵسا، لایەنگیری

---

[66]- بڕوانە: احمد تەقی - خەباتی کورد ل۹۲ هەروەها (دراسات فی الحرکة اکوردیة المعاصرة ص۲۷٤ )

[67]. دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص۲٥۲

ئـەتاتورکی کـرد و ئەفســەری بـەرپرس بـوو لــە ســەربازگەی ئەستەمبۆل و تەسلیمی ئەتاتورکی کرد لە دژی سوڵتان[٦٨]، لەلای سەرۆك عەشیرەتەکان زۆر زیاتر، ئەوەندە متمانەیان بە ئەتاتورك هـەبوو ببوە راوێـژکاری عەشیرەتە کوردەکان، لـە کۆبونەوەیـەکی (هاوپـــەیمانی هۆزەکـــان) لـــە ١٩١٧/١١/١٥ نامەیـــەکی (٥) پرسیاریان بۆ ئەتاتورك نووسی، تیایدا داوایـان کردبوو بۆیـان ڕوون بکاتەوە ئاخۆ ئەویش وەك سوڵتان ئامادەیە بەتـەواوی دان بە سەر بەخۆیی کوردستان بنێت،هەلەبەتـە وەلامـی درۆزنـانیش ئامادەیە.

بەو شێوەیە کوردە رۆشـنبیر و لائیك (عـەلمانی) و سـەرۆك عەشـــیرەتەکان بەشـــداریی و پشـــت گیریـــان لـــە دام و دەزگـــا و حکومەت و پەرلەمانی ئەتاتورك کرد لەژێر ناوی (برایەتی کوردو تـورك لـە دەوڵـەتی تورکیـای نـوێ)، حسـن خـەیری سـەرۆکی فراکسیونی کورد بون لە ئەنجوومـەنی مـەزنی تورکیا لـە ئەنقـەرە

[٦٨]. بڕوانە: شۆڕشی ئاگری داغ ـ نوسینی ئیحسان نوری پاشا. ل٢٢

کە ئەتاتورك دروستی کردبوو، ٧٢ ئەندامی کوردی تێدابو، ئەتاتورك وەفدێکی لێ ڕێکخستن بەسەرۆکایەتی عصمت ئینینۆ، دووکوردیشی بەگەردا (برنجی زادەو زولفی بەگزادە)، ئەوان لەوێ چوونە لۆزان بەناوی کورد قسەیان کرد، وتیان: ئێمە و تورك براین، دەمانەوێ پێکەوە بژین، نامانەوێ جیاببینەوە مادەکانی ٦٤.٦٢ دەبێ هەڵگیرێ، (حسن خەیری) لە ئەنجومەنی ئەنقەرە بروسکەی لایەنگری بەناوی هەمو کورد بۆکۆنگرەی لۆزان دەکرد[٦٩]، تاوای لێهات وەفدی ئەنقەرە بەشداری پی کراو وەفدی عوسمانی دەرکران لەو کۆنگرەیە، لەلای عیراقیش وەفدی لۆزان کورد بوە، بەریتانیا(بەسەرکردایەتی کیرزۆن) سەرپەرشتی دەکردن بەشداربوان جعفر عسکری(کوردە) وتوفیق سویدی، بەوشێوەیە ڕێکەوتنی سیڤەر گۆڕا بەلۆزان کە پیك هاتبە لە

---

[٦٩]. بەیتار دەرسیمی لە ل٢٢١ی کتێبەکەی خۆی(دەرسیم لە مێژووی کوردستان) دەڵێ حسن خەیری بە خۆی هەمو ئەو قسانەی بۆ گێڕامەوە کە چۆن بروسکەیان بۆ کۆنگرەی مەسلەتی لۆزان لێداوە .

١٤٣ماده ١٢٨جار ناوی تورکیای لێ هاتوە تاکە ناوێکی کوردی تێدا نەهات

لەومیانــەدا زانایــانی ئــاینی کوردســتان لەوانــە شــیخ عبـدالقادر، شیخ سعیدی نەورەسی، شیخ سعیدی پیران، شیخ محمــود، ... زۆر ناقایــل بــون بــەو هــەنگاوە، بــەڵام چــینی عەلمانیـەتی کورد داوایان لەوانە کرد ئەو هەنگاوەیان رزگاری کوردەو دەوڵەتێکی عەلمانی تورکی مافی کورد مسۆگەر دەکا، لـەلای ئـەو زانایانـە لەسلێمانی و کوردستانی سـەروو بەبـەیانی ڕەسمـی لـە گەرمـەی کێشـەی ویلایـەتی موسـل لـە سـالی ١٩٢٤ دەرچـوو، کۆپیشـیان نـارد بـۆ (عصـمە الامم)تیایـدا هـاتبوو کـە کوردو تـورك هـیچ پەیوەندیـەك یـەکیان نابەستەوە جگـە لـەئاین، ئاینیش نـەما لەسەردەستی ئەتاتورك ئیتر کوا برایـەتی کورد و تــورك، بۆیــەزانایانی ئــاینی ڕەوشــەنبیر داوای ســەربەخۆیی کوردســتانیان کــرد، کۆمــەڵێك لــە ڕەوشــەنبیران و نیشــتمان پـەروەرانیش لاگـیری ئـەو ڕایـەی زانایـانی ئـاینی بـوو، بـەڵام

ئەوانـەی بـەناوی مـۆدیرنی و سـیکولاری بانگێشـەیان دەکـردو سوربون لەسەر ڕای خۆیان، زانایانی ئاینیش بواریان پی دان تا گەیشـتنە بنبەسـت، دوای ئـەوەی ئـەتاتورك زال بـوو بەسـەر ئەستەمبۆڵ و بەیەکجاری خیلافەتی هەڵوەشاندەوە و کۆماریکی تورکی عەلمانی لەسەر بنچینەی تورکایەتی دامەزراند لە ١٩٢٣، لـە دەسـتور (ANA YASA) نکـۆڵی لـە کـورد کـرا و دەسـتی بـە داخستن و قەلا چۆکردنی دام و دەزگاو فەرهـەنگ و کـەلتووری و سیاسـی کـرد، کـە پێشـتر تـا ڕادەیـەکی بـاش بەئازادانـە لەئەستەمبۆڵ ئیشیان دەکرد، محمد زەکی بەك دەڵێت(هـەمو ئەو جەمعیـەت وحزبـە کوردیانـەی کـورد دروسـتی کردبـون لـە ژێـر سـایەی خیلافـەت ئـازاد بـون، بـەلام ..لەگـەل تسـلیم بـونی ئەسـتەمبۆل بـە حکومـەتی کمـالی هـەموی داخسـتن)[٧٠]، بەرنامەیەکی ترسناکیش دارشرا بۆ قەدەغەکردنی زمان وجل و

[٧٠] ـ خولاسـە.. ل٣١٤ . لـە ل٣١٥ بـاس لـە داخسـتنی ڕۆژنامەکوردیـەکانیش بـە هەمان شێوە دەکا .

بەرگی و تەوای فەرهەنگی کوردی... بەوانەش نەوەستا هەڵسا بەگرتنی هەمو ئەوانەی یارمەتیان دا، دادگایەکی ریك خست بەسەرۆکایەتی (صائب پاشا) بۆ لەسێدارەدانی سەرکردە کوردەکان، ئەو دادگایە گەیشتە هاریکارەکانی ئەتاتورکیش،لەوانە زۆربەی ئەو عەلمانیانە کوردانەی هاریکاریشی بوون.

بەو شێوەیە لەناوچەوانی نەوەی یەکەم ونەوەی دوەمی عەلمانیەت زیانێکی ستراتیجی بەر بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردستان کەوت،بەلام ئەو کاتی بەرەی عەلمانی وبەرەی نیشتمانی وئاینی لیکجودا نەکرابۆوە،بۆیە ئەو شکستە نەبوە شکستێکی بەرچاوی ئەونەوەو مەدرەسەکەیان،بۆیە عەلمانیەت لەکوردستان هەر بەردەوام بوو لە جیگیربوون وهەلکشان.

## زەمینەومقەوەماتی عەلمانیەت لەکوردستان:

ئەو مقەوەماتانە هەندێکی گشتین وهەندێکی تایبەتە بەکوردستان، گشتیەکەی ئەوەیە دەلێن (دیموکراسی و کۆماری و

مافی مرۆڤ و فرە لایەنی و دروست کردنی کۆمەڵگەی مەدەنی و بازاڕی ئازاد، گەشەکردن، یەکێتی نیشتمانی.. تەنیا بە عەلمانیەت بەدی دێت)، لەلایەکی تریشەوە دەڵێن: ئەو میللەتانەی کە زیاتر پەیوەستن بە ئایین ئەوا زیاتر دواکەوتوترن، ئەو پرۆسەیەش لەسەرەتای عەولەمە و سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن و سیستەمی جیهانی زیاتر ڕوون تر دەرکەوت، لە ئەوروپا تا لە ئایین ڕزگار نەبوون گەشەیان بەخۆ نەبینی و تابوونە پێشڕەو، ئەوانەی زیاتر پەیوەست بوون بە ئایین بوونە قوتابی و گوێگری ئەوانەی پەیوەست نەبوون بە ئایین، لەوەوە تەنزیری ئیستیعمار ئەوروپای مامۆستا و بنەمای(ملتون) سەری هەلدا[٧١]، تا ئەو ڕادەیە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی قایل بوون بچنە ژێر سیستەمی ئینتیدابی کە لەبەشی (١)ی مادەی (٢٢) ی کۆمەڵەی گەلان دەرچوو، ئەوان ببنە قوتابی وئەوروپیش

---

[٧١] د علی وردی –لمحات من تاریخ العراق... ج٥ ص٥٦ بنەمای ملتۆن وادەڵێ: ((لا تدع بریطانیا تنسی رسالتها في تعلیم الأمم کیف تعیش))،

مامۆستاو فێرکەر، لەسەر ئەو بنچینەش وولاتانی عەرەبی ئێستا دروست بووینە، لەوەش زیاتر مامۆستایان بۆ ئەو میللەتانەی مسولمان نارد کە فێری دەولەتداری و پێشکەوتنیان بکەن، لۆرانسی بۆ ولاتانی جەزیرەی عەرەب، بۆ عێراق هەریەکە لە (مس بیل) و (برس کۆکس)بۆ عیراق..، تا ئەو ساتەش وا بەدی دەکرێ لەهەر شوێنێك کە کۆمەڵێك میللەت تێکەڵ دەبن دواکەوتوەکانیان ئەو میللەتەیە کە زیاتر بە ئاین پابەندە، ئەوە لە ڕووکەش ڕاستی پێوە دیارە،بۆ خەلکی عاقلمەندیش لە قوولایی هۆکاری هەیە،بەلام زۆربەی خەلکی ئەنجام وڕووکەش دەخوێننەوە نەك هۆکارو قوولایی،بیە ئەو هاوکێشەیە گوتاری عەلمانی بەهێزدەکاو پاساوومقەوەماتیپتەو تر دەکات لە نێو جیهانی ئیسلامی.

هەرچی تایبەتیەکەی کوردستانیشە لەدوای شکستی نەوەی یەکەمی عەلمانیەتی کوردیش هەر هۆکاری گەشەیان بەردەوام بوە،مادام شکستەکەیان لەسەر شکستی بزوتنەوەی

کوردایەتی هەژمارکرا، لەو کاتیەوە بەرەبەرە عەلمانیەتی کوردی زیادی کردوە وەك کاردانەوەی چەوسانەوەی نەتەوەیی بووە، بەرامبەر ئەو زوڵم و زۆرەی دەکرێ، دەبینین داگیرکەران بەڕووکەش موسڵمانن، واهەست دەکەن هەر دەوڵەتەکان داگیرکەر و زۆردار نین بەڵکو میللەتی مسوڵمانی دەوڵەتەکەش یارمەتی دەرن، کەمتر بینیویانە زانایانی ئایینی لە وڵاتانی عێراق و ئێران و تورکیاوسوریا سۆزی ئایینی بیگرێ لەسەر کورد فەتوایەکی ئیجابی بدا، (جگە لەهەندێ زانای شیعە) نەبێ بەدەگمەن نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەندێك لەزانا و موفتی و بزوتنەوە ئیسلامیەکانیش ناوی کورد بە پیلانگێر و سەر بە ئیمپریالیزم و ئیسرائیل وەسف دەکەن.

لەلایەکی تر دەبینین لەکاتی مەینەتی و لێقەومانی کورد کەمتر وڵاتانی جیهانی ئیسلامی لەسەر کورد بەوەڵام دێن، زیاتر وڵاتانی ڕۆژئاوا و غەیرە ئیسلامیە، ئەوە کاریگەریەکی قوڵ لەسەر ناخ و سایکۆلۆژیەتی تاکی کوردکردووە، باوەڕی بە مسوڵمانان ئیسلامیش لەق بێت.

١. بەشێكی تری شارەزای مێژووی كورد هۆكارێكی سەرباری تری بۆ دروست دەبێت، كاتێ دەبینین هەندێ مەزهەبی فیقهی ئیسلامی و زانای موعتەبەر بەچاوی (مەوالی) و (علوج) و (ڕەچەلەك سوك) بەلای مێژووی كورد داچووە، لەوانە مەزهەبی ئیمامی شافیعی ئیمام سەعالبی و شێخ ئیسلام ئیبن تەیمیە و زۆری تر پێیان وابووە عەرەب پلە یەكەو كورد پلە دووە[72].

بەشێك ڕەچەڵەكی كوردیان كردۆتە عەرەب یان جن یان (ئەعرابی فارس)...، بۆچوونی ئەو زانایانە لەگەڵ تەیاری عروبی ئێستا و بۆچوونیان لەبارەی كورد دیمەنێكی زۆر ناشرینی ئاین دێنێتە پێش چاو، ئەگەر زۆر بەوردی ئەو زانیاریانە لێك نەكەیتەوە وفقهودەق لێكجیانەكەیەوە،ڕەفتاری مسوڵمان و ئەسلی ئاین لێك جیانەكەیتەوە(كە ئەو تەقەلایەش زۆر كەمە) ئەوا ئەو ڕەوشە دەبێتە زەمینەیەكی زۆر چالاكی نەك عەلمانی هەتا ئیلحادی لە كوردستان.

---

[72] ڕۆڵی عەلمانی لەدروست بوونی مەینەتی كورد ل ٣٠٨-

ئەوەی زیاتر ئەو قەیرانە قوول تر دەکاتەوە تا ئەو ساتە لایەنە ئیسلامیەکانیش نەهاتوون لەگەڵ ڕابوونی خۆیان پیشەنگ بن بۆ چاکردنەوەی ئەو دەردە مەزهەبیانە، بەڵکو زیاتر کەوتونە ژێر کاریگەری تەیاری عروبی کەبەسەر زۆربەی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی عەرەب زالە، ئیسلامی کوردستانیش بە توندو نەرمیەوە لەژێرکاریگەریەکی سەختی ئیسلامی عەرەبە بەچەوت وڕاستیەوە، لەودەمە سەرەتای تەقەلایەك بەدی دەکرێ بۆ ڕزگاربوون لە ژێر ئەو بارە قورسە.

٢. میلەتی کورد زۆر پێویستی بە یەکریزی هەیە، کەچی دەبینن ئەو هەمو کێشەیەی مەزهەبی وفقهی وسیاسی لە نێو موسوڵمانی کورد هەبێ، وادەردەکەوێ ئاین مایەی یەکڕیزی نیە.

٣. ئەوەی ئێستا لەبەشێکی فراوانی عەلمانی کورد و باڵی ئیلحادی دەبینرێ هێشتا زانیاریە فەلسەفی و زانستی و گەردونیەکانیان زۆر کلاسیکیە، کتێبەکانی (هۆبز) و (نیچە) و (ڕۆسۆ) و (مۆنتسیکۆ) توخمەکانی فیکری ڕۆشنبیری کورد پێکدەهێنێ. پێشتریش کتێبەکانی مارکس وئەنجلس ولینین و

ترۆتسکی وماوتسی تۆنگ وکیم ئیل سۆنگ و ج پۆلیتزرو..کاریگەر بوون.

بەشێکی تری هۆکاری تایبەتی ئەوەیە زۆربەی رۆشنبیرانی عەلمانی کورد دەردی لاسایی و (تقزم الثقافي) و دوور و قوڵیان هەیە، لەکاتێکدا لە کوردستان مارکسی گەرم بوو لە ١٩٧٩ بەدواوە ڕاپەڕینێکی کرێکاری لەسەرانسەری ئەورووپایی رۆژهەلات لەدژی مارکسی دەکرا بەتایبەتی لە پۆڵەندا بە سەرۆکایەتی (لیخ فاونسا)، ئینجا لەهەمان سال ئێران گەورەترین شۆڕشی جەماوەری جیهانی بە هۆی ئاینی کرد، لەڕووی زانستی و ئابوری و فەلسەفی و.. مارکسیەت دووچاری قەیرانی گەورەبوو، دوای عەلمانیەتی کوردی بازیدا بۆلای رۆژئاوای، بەو پێیە بەرەی رەوشەنبیری عەلمانی(لەو دەمە) زیاتر بەلای رۆژئاواییە،لەبەرامبەریش رەوشەنبیرانی ئاینیش زیاتر بەلای عەقلی عەرەبە، بە تێکڕاییش قەیرانی عەقلیەتی کورد دروست دەکا، ئیتر ڕاستیەکان بزردەبن و زیاتر لەقازانجی

عەلمانیەتە،هۆکارێکی زۆر تایبەت بۆ بەردەوامی فکری عەلمانی لەکوردستان دەسازێنێ.

ئەوانە هەموو وای کردوە عەلمانی لە کوردستان لەنامۆی دەرچێت، بەڵکو زیاتر لە ڕێ ی پرسی مەینەتی کورد و کێشەی مەزهەبی و کێشەی ئافرەت و مافی مرۆڤ و هەندێ کەلێنی زانستی تر بەکاردەهێنێ، رەواجیکی زۆری سیاسی وتەعلیمی پێ بدرێ.

قەیران وبەردەوامی زیانەکانی عەلمانیەت:

ئەورووپا قازانجی لە وەرچەرخانی ئاینیەوە بۆ عەلمانی کرد، بەلام جیهانی ئیسلامی قازانجی نەکردوە بەتایبەتی وولاتانی عربی،ئیستا لەدوا کاروانی میلەتانی جیهانن، خەلکی کوردستان ئەو هەمو زیانەی بەردەکەوێ لەگەل زیانێکی سەرباری تریش ئەویش زیانی نیشتمانی و دابەش وبێبەشی کوردستانە، واتە زیانەکان ئاوێتەن لە دوو لاوە،لە ڕووی نیشتمانی و لە ڕووی کۆمەلایەتی،بەتێکەڵی و بەکورتی باسیان دەکەین:

١- تێکچوونی ڕیزی نیشتمانی - بزوتنەوەی کوردایەتی تا زانای ئایینی سەرپەرشتی کردووە لەجیاتی ئایدیۆلۆژیای عەلمانی ئەوا میللەت یەك پارچەو بەهاریکار و کەم (خائین و گیرفان پڕکەر) بووە، بەڵام دوای ئەو هاوکێشە وەرگەڕاوە بە پێچەوانەیی لەگەڵ بە عەلمانی کردنی ناوەڕۆکی کوردایەتی و سەرهەڵدانی سەرکردەی عەلمانی.

٢- ئەو مەدرەسە عەلمانیانە هەروەك لەڕووی دووەلی نەبووە پشتیوان بۆ کورد، لەڕووی ناوەخۆش تەنها بوونە ماندووکردنی شۆڕش و کوردایەتیەکە،لەوانە: لێکترازان، تۆمەت، ناکۆکی، شەڕی براکوژی، تەسك بیرکردنەوە، لاسایی کردنەوە، داڕووخانی بینای ڕەوشتی کوردەواری،.. لە کۆتاییدا ئەو دیاردە دزێوانەی پەیداکرد: بێئەمەکی، بێ متمانەیی، دزی، تالان، دیل کوژی، خیانەت، جاشایەتی، بوونە بەعسی، بوونە عەرەب و تورکمان، مەبدء فرۆشی، لایەنگیری سەرکەوتوو، ناهەقی، فێڵبازی،..ئیتر ئەوکولەگە بە هێزانەن بۆپەیدا کردنی

ئەو گەندەڵیە وێرانکەریە،هەرە دواییەکەش لە کورتی دانی گیانی بەرگری و شەڕە دەسەلاتیکی بە زەقی و کانتۆنیایەتی.

٣- بەڕێکەوت نەبوو لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو مەدرەسە عەلمانیەتە لە ناوچەکەو لە کوردستان مەینەتی کوردیش سەری هەڵدا لە پەیمانی سایکس پیکۆ ١٩١٦ تا جەزائیر ١٩٧٥ و تا ئێستاش، بەردەوامیەکەشی لەگەڵ بەردەوامی عەلمانیەتە، ئێستا کە ئاسۆی ئاوابوونی عەلمانیەت دەرکەوت، ئاسۆی ئومێدی سەرکەوتنی کوردیش تاراددەیەك دەرکەوتووە.

٤- هەر ئەو مەدرەسانەن بوونە هۆی لێ تێکەڵبوونی هەریەکە لە (پشتیوان، دۆست، بێلایەن، ناحەز، دوژمن) لە ئیقلیمی و دەولی و هەندێ جاریش تەواو پێچەوانە.

٥- لە کۆی ئەزموونەکان، بەتایبەتی عەلمانیەتی نوێ تا ئەو ساتەش، ئەگەر وا هەڵکەوتبێ بەرژەوەندی نیشتمان و بەرژەوەندی حزبایەتیەکەی ناکۆك بن ئەوا هەردەم نیشتمانیەکە ژێرکەوتووە.

٦- نـەبوونی سـتراتیژیەتێك بەدیـدێکی قـوڵ و هەمەلایـەن و چارەنوس ساز.

٧- لەبارەی ئێستایاندا هەمووی گوایە دیموکراسین، کەچی تا ئێستا دەستگۆڕی دەسـەڵات لـەناو خودی حزبەکە نیەو بواری هەموو ڕەخنەیەکیش لە سەرۆکەکە نیە.

٨- دیـاردەی لاسـایی کردنـەوەو هێنـانی نـەریت و شـەریعەتی هەندەران، سەردەمێك ئەو زاراوانە باوی بوو (پرۆلیتاریا، حتمیە تاریخیـــە، ئیمپریـــالیزم، دیالیکتیـــك، ڕەجعیـــەت، برجـــوازی، بـــەکرێگیراو، ســـەرمایەداری، دیکتـــاتۆری پرۆلیتـــاری، زەحمـەتکێش، صـراع گبقـی).. ئێسـتا بـێ هـیچ بنچـینەیەکی کوردانە گۆڕاوە بۆ (دیموکراسی، مافی مرۆڤ، دژەتیرۆر، ئاشتی، دیالۆك..).

١٠- گوایە ئەو مەدرەسانە بۆ ئەو مەبەستەن ناوەرۆکی شۆڕشی کـورد لـە خێڵـەکی و بێسـەروبەری و بێنەخشـەیی ڕزگـار بکـات کەچـی تـەنها ناوەکـان گـۆڕاون، ئاغـە نـەما بـەڵام بەشـێوەیەکی توونـدتر دروسـت بـۆوە، بۆیـە لـە نـوێترین کتێـب (دیفیـد

ماکدۆیل)[٧٣] دەڵێت: شۆڕشی کوردیش سەرباری ئاغەی جاران ئاغەی نوێشی دروست کرد، مەبەستی بەرپرسەکانە.

١١- لەکۆتاییدا بەهۆی ئەو عەلمانیەتە توندە و بەپێی بنەمای (باکۆنین): (کل تحطیم للقائم هو الخیر لإنسانیة)[٧٤] ئەوە زۆربەی بناغە ڕەوشتیە کۆمەڵایەتیەکانی کوردەواری وێران کراو بەدیلیشی نەبووە بووە هۆی سەرچاوەی هەموو ئەو دیاردە دزێوانە.. بەتایبەتی جاشایەتی.

١٢- ئێستاش حزبە کوردستانیەکان لە کۆمەڵێك قەیرانی فکری و سیاسی و گەندەڵی ئیداری و میللی زۆر سەخت دان سەرەڕای قەیرانەکانی دووبەرەکی و نیشتمانی و ئیقلیمی و دەولی (کە لێرەدا بوار نیە باسی بکەین)، چارەنووسی ئەو حزبانە

[٧٣] بە ئینگلیزیەوتەرجومە نەکراوە-Amodern Historey of The Kurds١٩٩٥

[٧٤] مبادیء الثورة – ئەو کتیبەیە کەناوبانگی باکۆنینی پێ دەرچوو تیایدا داوا دەکا دام ودەزگای ئیمپریالیزم هەلتەکینرێ بە چاکوخراپەوە، ریکخراوە تیرۆریستیەکانی وەك بادرماینهۆڤ وئەلویە ئەلحمرا و..لەو تیۆرە سەرچاوە دەگرن.

لەسەر ئەوسكەيە وێستگەكەی ديار و ئاشكرايە و بەرەو قەڵۆشيە، هەموو هەنگاوەكان ناكۆكە خۆبەخۆ، هەر لە نمونەيەكی دووردا عەلمانيەتی كوردستان وەك عەلمانيەتی زۆربەی وڵاتانی ئيسلام بەو تێڕوانينە سادەيان بۆ ئيسلام پاساوی تيۆرەكەی (صراع الحضارات) دەكەن كەچی خۆی بۆ ئامادە ناكەن و بەپێچەوانەوە هێشتا زياتر داكۆكی لە (شارستانيەتی ڕۆژئاوا) دەكەن كە بەو گفتەيە بێت ڕۆژێك لەڕۆژان يەكتر دەهاڕن، عەلمانيەتی جيهانی ئيسلاميش لەسەر شارستانيەتی ئيسلام حيساب كراوە، واتە لايەنگيری شارستانيەكە كە سەركەوتنی هەم نەمانی عەلمانيەتە ژێركەوتنيشی هەر نەمانە، خۆی لەو ململانێيە خستۆتە خانەيەك لەشێوەی (قۆڵی پێنجەم).

١٣- بەگشتی فاكتەرەكانی ئايين و ئەخلاق و ئايدۆلۆژيا بەشێكە لەتەواوكەری كەسێتی، ئەوەش وادەكا كەسێكی لەرزۆك وپڕاو كرێگرتە نەبێ، بەبەرگری بێت بەتايبەتی بەرامبەر داگيركاری.

١٤-ئـەزمونی مێژوویـیـەکانیش بـەهاوار پێمـان دەڵـێن ئەوانـەی وڵات فرۆشن ئاین و مەبادیئو ئایدیۆلۆژیان نیەو نەبوە، (ولید بن یزید)یەکێك لە خەلیفەکانی ئەمەویەو باوەڕی بەخوداو قورئان‌و زیندووبوونـەوە نـەبوە[٧٥]، چـی بەسـەر نیشـتمان هێنـاوە؟ خوراسانی فرۆشتە (نصر بن سیار)، ولایەتیکی تری بە(یوسف بـن عمـر )بـە والی و کارمەنـدەوە فرۆشـت، ئیتحادیـەکانی عوسمانی(لەدوای ١٩٠٨) وعەرەبی کەنداو فەلەستینیان فرۆشتە یەهودیـەکان بـە دوو سـینی لیـرەی زێـڕ[٧٦]، لیبیایـان فرۆشـتە ئیتالیا بە دوو بەلەمی سەربازی[٧٧]، ڕووباری دیجلـەیان فرۆشـتە ئینکلیـز بـە ( ٢٥٠ )هـەزار لـیرە[٧٨]، شـیخەکانی کەنـداو مووچـەی مانگانەیان بە زێڕ هەبوو لەبەرامبەر فرۆشتنی وولات.

---

[٧٥] د محمد عمارة–المعتزلة والثورة ص٧٢-٧٣

[٧٦] – اليهود والدولة العثمانية.. ص٢٢٩

[٧٧] يقول جوليتي– رئيس الحكومة الإيطالية عام١٩١١م عن حكومة الإتحاديين: لقد طلبوا منا اذا كانت ايطاليا مستعدة للتنازل لصالح تركيا كتعويض لها عن ضياع ليبيا، عن سفينتين من احسن سفن اسطولها.(الباحث– الإسلام والعلمانية واثرهما على نشأة الدولة العراقية الحديثة ص٧٩)

[٧٨] عباس العزاوي– العراق بين الأحتلالين–.. ج٨– ص١٨٦

گۆڤاری(شؤون خارجیة) لە لندن دەردەچوو لە کانونی دوەمی ١٩٢٧ز زانیاریـەکی وردی بـەناوی (امـراء العـرب وداوتنـغ بسکریت) ناوی هەریەکە لە ئەمیرە عەرەبەکان وموچەی سالانەی ئاشکراکرد بەوشێوەیە:﴿١- ابن السعود ١٠٠هەزار جنیـه، ٢- الملك حسین- شریف مكة- ١٠٠ هەزار جنیـه، ٣- فهد الهذال هەزار ١٤٠ هەزار ربیة، السید الأدریسي ١٢ هەزار لیره..﴾[٧٩].

ئەو دۆخە بۆ کۆمەڵگەیەکی بێ دەوڵەت و یاسا بەتایبەتی بۆ ئەو میللەتانەی لە فەترەی گواستنەوەن یان لەفەترەی ڕزگاری نیشتیمانین (کە دەوڵەتیان نیە) یەکجار زۆرتر پێویستیان بە ئایین و ئەخلاق و ئایدۆلۆژیا هەیە، بۆئەوەی بەدیل بێت بۆ حکومەت و یاسا و پۆلیس و زینـدانی بتـوانی پەیوەنـدی کۆمەڵایەتی وژێرخانەکەی بپارێزی، ئەو فاکتەرانە لەو قۆناغە دەبنە ڕێگری هەرە گەورە تا خۆویستی و خۆفرۆشی و گەندەڵی

[٧٩] عبدالرزاق الحسني – تأریخ الوزارات العراقیة –دارالشؤون الثقافة العامة – بغداد ١٩٨٨م ج١ص٩٢ هەروەها د.علی الوردی – لمحات.. ج٥ ص٣٧ هەروەها (الإسلام والعلمانیة واثرهما علی نشأة الدولة العراقیة الحدیثة ص٧٩

و.... دروست نەبێ، لەو قۆناغە کۆمەڵگە پێویستی بە هاریکاری و تەبایی و ئۆقرە و گیانی بەرگری هەیە.

١٣- بەکورتی ئەزموونی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی ولەکوردستانیش بەو شێوەیە بوە: ﴿١- لەرووی ئابووری – گرانی، ٢- لەرووی ئیداری- گەندەڵی، ٣- لەرووی کومەلایەتی – وێرانی بەها و ئەخلاق وبەرتەوازەیی، ٤- لەرووی زانستی – دواکەوتووی، ٥- لەرووی فەرهەنگی- لاسایی‌کردنەوەی بێ داهینان(تقزم الثقافی)، ٦- لەرووی سیاسی – میکافیلیەت، ٧- لەرووی حوکم رانیەوە- دیکتاتوریەت، ٨- لەڕووی پەیوەندی -کراهیەت، ٩- لەڕووی نیشتمانیەوە- بێ ئینتمایی (واتە هەلوەشاندنەوەی کوردایەتی )..﴾ لەکۆتایی ماوە بلێین ئەو جۆرەعەلمانیەتیە دیمەنێکی ناشرینی هەیە، خۆی بەستۆتەوە بەدەسەلات و سوپا و زل هێزانی جیهان، ئەگەر تەنگاو بیت زۆر بەسانایی دەست بۆ دوژمنانی میللەتەکەی دەبا ولە دژی ئۆپۆزیسۆنی، ئیستا دۆستەکانی رۆژئاوا زۆربەی لایەنە عەلمانیە دیکتاتۆریەکانن، بۆیە رۆژئاوا لەجیهانی ئیسلامی دیموکراس خواز نیە.

**ئەزموون لەبارەی زیانە نیشتمانیەکانی:**

ڕۆجی غارودی هەروەهاش مەکسیم ڕۆدنسن دەڵێن ئیستعمار بۆ جێگیر بوونی خۆی لە وولاتانی داگیرکراو هەولی یەکەمی دەرکیشانی ئاین وکەلتوری ڕەسەنی ئەو میلەتە بوە، بۆیە تەبشیری پیشرەوی ئیستعمارە..[80]، مەبەستی بنچینە تەبشیری گۆڕینی ئاینی داگیرکراو بوە بۆیە پیشەنگی داگیرکاری بوە [81]، تەنانەت داگیرکەر هەولی داوە ئاینیکی بەهیزو بەرگر بگۆڕێ بە ئاینیکی تری سادە،چونکە ئاینی ڕاستەقینە هەرگیز ناشێت ونابێتە کەرەستەی هیچ داگیرکەرێك، جورج کامبل لە کتێبی (الأفرقا الإستوائية) لەگەڵ ڕای(جورج کارپنتر) هاوڕان ودەڵێن ئاینی ئیسلام ڕۆلی سەلبی نەبوە لەداگیرکاری، تەبشیری بە پێچەوانەی ئیسلام سەربەخۆیی نیشتمانی تیك شکاندوە لە

[80] روجیە غارودی–مارکسیة قرن عشرین ص١٤٩ وص١٩٥ هەروەها مکسیم ڕۆدنسن لە کتیبی (الإسلام والمارکسیە) ئەو باسە دەکات.

[81] هاری ماجدۆف– الإمبريالية من عصرالإستعمار الى اليوم ص٦٧

ئەفريقا[٨٢]، سەرەڕای ئەوەش هيشتا ئاينێكی لاوازيش باشترە لە بیّ ئاينی، ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەينە مانەوەی گيانی بەرگری ميلەتی كيبك لە كەنەدا دەبينين يەكیّ لە هۆيە بنچينەييەكە ئەوەيە رۆحی ئاينيان هيشتۆتەوە وەك بەشيك لە سەربەخۆيی (وەك لە ئامارەكەی سالی ٢٠١٠ دەركەوت).

لە ئەزمونی ئەپارتايدی ئەفريقا ورۆديسيای پيشوو سەرنج بدە ئەو تيمەی سپيەكان دژ بە رەشەكانيان دروست كردبوو بەناوی(عصابە التمساح) تا ژێرخانی ميلەت داخورێنن بۆ ئەوەی بەرگريان نەمينی، هەول دەدرا بەهاو ئاينی ڕەسەنيان بتوينەوەو فەرهەنگی ئەوروپيان بەسەردا زال بكەن،هەولدراوە جۆرە عەلمانيەتيكی سەلبيان لە نێو بلاوبكەنەوە [٨٣]، لەوە زياتر (فرانتزفانون)دەڵێت ئيمپرياليزم وداگيركاری كەسێتی و

[٨٢] عباس محمود عقاد- مايقال عن الإسلام ص٩١ هەروەها: جورج كامبل- الأفرقا الإستوائية ج٢ص٢٧٦

[٨٣] مايكل ريبون-النار السوداءحرب العصابات فی روديسيا ص٧٦-، ص١١٧

سروشتی مرۆڤ تێك دەشێوێنیێ و عەقڵیشی دوادەخا[٨٤]، بۆیە لە بنەماکانی(تصفیە الإستعمار) واهاتوە:بۆ رزگاری یەکجاری پێویستە خۆت لە هەمو ئاسەوارەکانی ئیستعمار رزگار بکەیت بەسیستەمی عەلمانیشەوە[٨٥]، تەنانەت لە نێوان وەسفی عەلمانی بۆ مرۆڤ (حیوان ناطق) و بەرەڵا و ئارەزووباز..لەگەل وەسفی ئاینی بۆ مرۆڤ زۆر جیایە،لەیەکەمیان بەرژەوەندی پەرست و خۆبەدەستەوەدەر لەدوەما بەبەرگری و مرۆڤایەتی،لە ڕاستیشدا زۆربەی فەیلەسوفانی رزگاری خواز مرۆڤیان بە (کائن متدین) وەسف کردوە، پێیان وابوە بەبێ ئاین کەسیتی مرۆڤ تەواو نابێ[٨٦]، نمونەگەلی زۆرە بۆمانەوەی ئیستیعمار و داگیرکەر تەقەلای داوە ئەو هەنگارانە بێنێتەدی:

---

[٨٤] معذبو الأرض- ص٦

[٨٥] عبدالکریم العبیدی – تصفیة المصالح الإمبریالیة الأمریکیة ص٤٨

[٨٦] المعتقدات الدینیة لدی الشعوب ص٧ بۆزیاترلەوبابەتەبروانە: إدوارد سعید (الاستشراق والثقافة والإمبریالیة – Orientalism ١٩٧٨، Culture & Imperialism ,new york ١٩٩٣).

١. میللەتی داگیرکراو گەشە نەکا بەرەو مەدەنیەت و ڕووناکی و شارەزایی.

٢. هەردەم دەیەوێ سیاسەتو ئاین ومەبادیئو گیانی نیشتمانی لیك جیا کاتەوە.

٣. یەکپارچەیی و گیانی هاریکاری و زیندەکی و هەست بە ئازادی و دیموکراسی نەکا.

٤. هەوڵدەدا پەیوەندی نێوان خاك و میللەت ومێژوو لاواز بکات.

٥. هەوڵدەدەن بەرژەوەندی تایبەتی و خۆویستی زاڵ بکەن بەسەر هەست بەبەرپرسیاریەتی و بەرژەوەندی گشتی و خۆشەویستی خاك و نیشتیمان و دژ بە زوڵم و زۆرداری.

٦. بۆهەموو ئەوانە هەوڵ لەسەر کۆی ئەو هەنگاوانە لەسەر چاوەیەك دەکا ئەویش تەقەلای لاوازکردنی ئایین و ئەخلاق و مەبدەئە لەناو ئەو میللەتە، لەبەرامبەردا فەلسەفەی مولحیدی بلاودەکاتەوە.

هەموو وڵاتێك بەتايبەتی میللەتانی ژێر دەستە بۆ ئەوەی نەتوێتەوە، بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت، ئەوا پێويستی بەوە هەيە ژێرخان و ڕووحی كۆمەڵگەكەی بپارێزێت كە بريتيە لە ئايين و كەلتور وفەرهەنگی، بەپێچەوانەش دەبێ هەوڵبدا هەموو ئەو دەروازانەی دەچێتەوە سەر بیروفەرهەنگ وكەلتوری عەلمانیەت دەری كێشی، ئەوە مانای زاڵكردنی ئايينێك بەسەر ئايينێك نيە، لێبوردەيی يەكتر قبوڵكردن و تەبايی بكرێنە بنچينە لە چوارچێوەی هاوڵاتی هاوئادەمی بوون، خۆ ئەگەر لەناو ئەو میللەتە ئايينيش نەبوو ئەوە نەريتە ئيجابيەكان و مێژوو و فەرهەنگ بكرێتە بنچينە، خۆ ئەگەر هەر عەلمانی بوون ئەوا ئەو جۆرە عەلمانیە بن لەسەر بنچينەی فەلسەفە و زانست بێت باشترە لە (نەفامی مولحيدی))، هەر وەك لە قورئانيش ئەو پۆلەی پێ باشترە ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ﴾[٨٧].

---

[٨٧] الحج : ٨

لەکوردستان: ئەوەو ئەوەی سەرووتریش بۆ گشت وولاتە داگیرکراوەکانەو بە ئاشکرا لەکوردستان بەدی دەکریٚ، ئەوەی زۆر ڕوونەو بینیومانە قوڵبوونەوەی فەلسەفی ناویٚ کە داگیرکەران بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەنیازی چیە لە کوردستان، بۆئەوەی داگیرکاریەکەی ڕەسەن بکا هەڵساوە:

١. فەرهەنگ و کەسایەتی کورد هەڵتەکێنیٚ...بەهۆی بەتەماح کردنی و خۆویستی و مادی بوونی و..

٢. هەوڵی داوە ئایین لە کوردستان لاواز بکا.. چ بە سوتاندن و وێرانکردنی مزگەوتەکان چ بەناشرینکردنی لە ڕیٚ ی ناوی ئایینی لە پرۆسە عەسکەریەکانس دژ بە کورد.

٣. هەوڵی داوە ئەو تەبایی و هاریکاری و ئەخلاقە کۆنەی کوردی لەناو ببا کە جاران ناوی قورەیشی عەجەم بوە.. بەهۆی ناکۆکی خستنە ناویان و گواستنەوەیان لە شوێنی خۆیان و کۆکردنەوەیان لە کۆمەڵگە و دروستکردنی (فوج) بۆ هەر عەشیرەتێك بەناوی(افواج خفیفە) کە هەمان ناوە لەسەردەمی

ئیتحادیـــەکانی عوسمـــانی لـــەدوای ســـالانی ۱۹۰۸ بـــۆ کـــورد کرایەوە.

٤. لـەکۆی ئەوانـەش هـەوڵی داوە پەیوەنـدی نێـوان کوردسـتان و کورد لەیەکتر جیا بکاتەوە، پەیوەندی تاکی کوردیش بە (مێژوو ئایین و فەرهەنگ و کورد و نیشتیمان) لێك بکاتەوە، تا ئینتیمای تـاك بـۆ میللـەت و نیشـتیمان لاواز بکـا، کەسـێکی یـاخی و (لامنتمی) لێ دەرچێ..بەهۆی ژیاندنەوەی فاکتەرە ستونیەکانی عەشایەری و دروستکردنی فەوج، تاکیش سەرقاڵ بکا بە ئارەزو بازی وباقی کارە لاوەکیەکانی تر.

ئەوانەی داگیرکەران کردوویانە:

**ئاسۆی عەلمانیەت لەکوردستان:**

عەلمانیەتی کوردی وەك عەلمانیـەتی عـەرەب دووچاری قـەیرانی سەخت هاتوون ئاسۆیەکی گەشیان لەپیش نیە، لە دوای قـەلۆش بوونی عەلمانیـەت لـە جیهانی ئیسلامی بە تایبـەتی لـە کۆتـایی ســەدەی ڕابـووردوو تـا ئێسـتاش بـە فـراوانتر گەڕانـەوە ســەر

بەکارهێنانی ئایین و شاردنەوەی عەلمانیەت، هەر لە سوێندی یاسایی و یادکردنەوەی بۆنە ئاینیەکان و قورئان خوێندن و وەزارەتی ئەوقاف و.. بەلام لە کۆتاییدا هەر بەکارهێنانی ئاینە لە پێناو عەلمانیەت، مادام دەستورەکەی عەلمانیە، ئالێرەدا ناسینەوەی عەلمانیەت پێوەرێکی وردتری دەوێ، ئەویش ئەوەیە ئاخۆ لە نێوان ئەزمونی بەشەری و ئایین کامەیان (مرجع)ی دەستورە؟ یان هەرپرسیارەکەی (گیزۆ)ی فرنسی لە جیهانی ئیسلامی بە گوزارشێکی تر هاتە مەیدان، کامیان ڕابەری کامیانن؟ دەستوور یان ئایین؟ عەلمانی توندو ئاینی توند ڕێك وەلامەکەیان پیچەوانەی یەکترە، تەیاری ئاینی میانڕەو وەلامەکەی ئەوەیە کە سەرچاوەی دەستوور دەکرێت ئاینیش بێت وئەزمونی ئیجابی بەشەریش بێت، لە ڕۆژئاواو جیهانی مسیحی تەباییەکیان لەنێوان ئاینی ئێستایان و ئەزمونی بەشەری ڕێکخستوە، لەدەستوری یۆنان لەمادەی(١)و(٤٧) باس لە پابەندی ئاینیەوە دەکەن بۆ کۆمەلگەکەیان، دانمارك: هەردوو

مــادەی (١، ٢)، نــەرویج: مــادەی(١٢)، ســوید: مــادەی(٤)، كولومبیــا: مــادەی(٥٤)، كورســیكا: مــادەی(٦٦)، سـلفادور: مادەی(١٢)، اسبانیا: مادەی(٦)، برتغال: مادەی(٢٤)، باركوای: مـادەی(٣)، ارجنـتین: مـادەی(٢)..، سـەدەی (٢١) بـە سـەدەی ئاینی دەژمێرن، ناسنامەكان ئاینینە، بەلام لە ئاینی مسیحی و ئاینەكانی تر هەر ئەوەندە تێنەی تێدا ماوە بكرێتە سەرچاوەیەك لەسەرچاوەكان بۆ دەستور و ژیان،كەچی ئاینی ئیسلام (بە هۆی سەلامەتی دەقە پەیامیەكانی) تێن و ووزەی زۆری هەیە زیاد لە مونافەسەكردن، بۆیە لە جیهانی ئیسلامی عەلمانیەت بەتەواوی بـەزیوە لەبەرامبـەر تـەیاری ئـاینی، بۆیـە ناچـارە دەسـەلات وپۆسـت و هێـز بەكاردەهێنێ بۆ مانـەوەی سیسـتەمی عـەلمانی، ئەو شێوازە عەلمانیە لە جیهانی عربی و كوردی زۆر زەقە،ئەوەی پاسـاوی هیشـتنەوەی عـەلمانی جـارێكی تـر پتـەو كـردەوە پیشـكەش نـەكردنی نمونـەی جـوانی ئـەزمونی بزوتنـەوە ئیسلامیەكانە،كەبەكورتی لەسەریان دەوەستین و كوردستان بە

نمونە وەردەگرین بەو پرسیارە: ئایادەتوانین بڵێین ئیسلامیەکان لـە کوردسـتان شکسـتیان هێنـاو جـارێکی تـر خـەلکی بـە عەلمانیەکی گەندەل رازی دەبنەوە ؟

ڕەنگـە وەڵامـی ئاسـان نـەبێت چـونکە لـەو سـەردەمە لەرۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت ولـە کوردسـتانیش ئاینیـەکان تاکـە مەدرەسـەیەکن بـیٚ فاکتـەری دەرەکـی لـە هـەناوی جـەماوەر بخولقێن،خـۆی دەتـوانی خـۆی ئۆتۆماتیکیانـە چاکسـاز بکـات، بەڵام بە پێی ئەو بارو دۆخەی تێیدایە زۆر زەحمەتە نەفی کردنی ئـەو پرسـیارەش، چـونکە هـەر دام ودەزگـاو کۆمپانیـاو بزوتنەوەیەك ئەگەر لەو دۆخانەی خوارەوە بوو بە (فاشیل)پۆلین دەکریٚ:

١- دوێنـیٚ و ئـەوڕۆی وەك یـەك بێـت یـان خراتـر، ئەگـەر ئـەوە بـەراوورد بکـەین دەبینینتـا سـاڵانی١٩٩٩بزوتنـەوەی ئیسـلامی کوردستان لەلایەن ئەمریکاوە بە یەکیٚ لە ٧لایەنە کاریگەریەکانی عێراق پۆلین کرابوو ئیستاش هەروا لەکورتی دەدەن،بەتایبـەتی لە دوا هەلبژاردنی ٢٥/٧/.٢٠٠٩

٢- کەمتر لە معادەلەیەکی کارای ناوەکی وهەرێمایەتی جیهانی نەبێ بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ،هەرچەندە لەدوای دروست بوونی (بزوتنەوەی گۆران) ئاسۆیەکی تریان بۆ هاتۆتە پیش.

٣- لە دۆخە جیاجیاکاندا گۆڕانیان پێ ناکرێ.

٤- هەموو دۆخ وئەزموونەکان شکستی هێنابێ، واتە بە ئەزموونی جیهادی ئاسایی(بزوتنەوە)، ئەزموونی جیهادی توندی ( ئەنسارولئیسلام)،بەنەرمی ونیمچە نەرمی (کۆمەل ویەککگرتوو)لەهەموو بارێك هەر لە شکست دابێ.

٥- ئەگەری دەربازت لەئاسۆ دیارنەبێ، ئیمکانیەتی گەشەو گۆڕانی پەکی کەوتبێت.

٦- بەدیل نەبێ بۆ دۆخە خراپەکانی بەرامبەریشت،..بە لای کەمی هەندێك لەبیرمەندانیان گەیشتبنە ئەو قەناعەتەی کە نەبوون وبوونی وەك یەکە.

٧- زۆربەی ئەوانەی دەچنە نێو حکومەت بە نوێنەرایەتی لایەنە ئیسلامیەکان لەو تاقی کردنەوەیە دەرنەچووینە،وەك

گەندەلچـيەكانی تـری حزبـە عەلمانيـەكان كەوتونەتـە ژێـر كاريگەری پارەو كۆشك وتەلار وژن هێنانی تر ومۆنيكاو..

٨- ڕيسـايەك هەيـە لـەكارگێڕی بـالا ئـەويش ئەوەيـە ئەگـەر دەزگايـەك لادەی وكاريگەريـەكی وای نـەبێ لـەدوای لادانـی ئـەوا مانـای بـێ سـوودە،لەو كاتـە ٢٠٠٩ئـەو لايەنـە ئيسـلاميانە لـە گۆڕەپـان لابـدەی دەبيـنين كاريگەريـەكی وای لـەدوای خـۆی بـە جيناهيلی.

هەمو ئەو هۆكارانەی شكستی عـەلمانی و قـەيرانی ئيسـلاميەكان تەمـەنی عـەلمانی لەكوردسـتان درێـژ دەكاتـەوە، ئـەگينا ئاسـۆی عەلمانی لە جيهانی ئيسلامی وكوردستانيش تەنگ ولێلـە، تائـەو ڕادەيە كەوتۆتە سەر مەدرەسەی بەديل،هەردەمێك خۆی ستاندەر بكا ئاسۆی مانەوەی عەلمانيەت زۆر بەرتەسك دەبێتەوە. □



# چۆنیەتی خوێندنەوەی خوێنەرێکی سیکۆلار بۆ دەقی ئایینی

ئامادەکردن: عبدالله نصرالله



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله ربّ العالمين، والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله أجمعين:

بۆچی خوێندنەوەی ڕۆشنبیرێکی سیکۆلار بۆ دەقێکی ئایینی جیاوازە لە خوێندنەوەی ئاییندارێك بۆ هەمان ئەو دەقە؟ بۆچی ئەو کەسە بە شێوەیەك دەیخوێنێتەوە کە جیاوازە لەوەی منێکی ئاییندار؟ بۆچی کە ئاییندارەکە دەیخوێنێتەوە پێی کاریگەر دەبێت و وەڵامگۆی داواکارییەکانی ئەو دەقە دەبێت و ئەو دەقە خوازیاری هەرچی بێت پێوەی پابەند دەبێت، کەچی کاتێك کەسایەتییەکی سیکۆلار کە ئاستێکی زانستیشی هەبێت و توانا و زیرەکیشی هەبێت، کە دەقێکی ئایینی دەخوێنێتەوە سوودی لێ وەرناگرێت و هۆکارەکەی چییە؟

لەڕاستیدا هۆکاری سەرەکی سوود وەرنەگرتن لە دەقێکی ئایینی ئەوەیە کە ئەو کەسایەتییە عەلمانییە بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ ئەو دەقەدا دەکات:

یەکەم: باوەڕی بەوە نییە کە ئەم دەقە-دەقێکی پیرۆزبێت.

دووەم: پێی وایە دەکرێت ئەو دەقە تەئویل بکرێت. واتە مانایەك هەڵبگرێت کە ئەو مانایە نەدات بەدەستەوە کە زۆرینەی هەرە زۆری ئەوانەی پابەندن بەو ئایینەوە کە لەو دەقە تێدەگەن، دەکرێت جیاوازبێت لە مانای ئاییندارەکان. بە بۆچوونی ڕۆشنبیری سیکۆلار دەکرێت مانایەکی تر هەڵبگرێت.

کەواتە گرفتە سەرەکییەکە، هەروەك لە عیلمی کەلام و فەلسەفەی ئیسلامیشدا باس دەکرێت، لە دوو شتەوە سەرچاوەی گرتووە:

ا- بە (صحیح)ی نازانێت، واتە بەڕاستی نەزانێت.

ب- بە (صریح)ی نازانێت، واتە بە ڕاشکاوی نەزانێت لەو مانایەدا.

چونکە ڕستەیەك یان بابەتێك یان دەقێك کاتێك دەتوانیت باوەڕی پێبکەیت و پابەندبیت پێوەی کە دەبێت ئەو دوو مەرجەی سەرەوەی تێدابێت کە هەم(صحیح) و هەم (صریح) بێت. واتە هەم باوەڕت وابێت کە ڕاستە، وە هەم دڵنیاش بیت کە ئەو دەقە بە ڕاشکاوی ئەو مانایە دەگەیەنێت کە تۆ لێی تێگەیشتوویت. دەی گرفتی یەکەمی ڕۆشنبیری سیکۆلار ئەوەیە کە بە

(صحيح)ی نازانێت و پێی وانییە کە ئەمە لە سەدا سەد وتەی خودایە، ئەو خودایەی کە دروستکەر و بەدیهێنەری بوونەوەر و ژیان و ئادەمیزادە و پێویستە ئەم باوەڕی پێ بکات. وە گرفتی دووەمیشی ئەوەیە کە پێی وایە ئەم دەقە ڕاشکاو نییە سەبارەت بەو پرسەی کە لەبارەیەوە دەدوێت و دەکرێت مانای تر هەڵبگرێت. جا لەبەرئەوەی دەکرێت مانای تر هەڵبگرێت، ئیتر بە ئاسانی خۆی قوتار دەکات لەوەی کە پابەند بێت پێوەی. کەواتە هەڵوێستی ڕۆشنبیری سیکۆلار بەرامبەر بەو دەقە ئایینییە بەم جۆرەیە:

ا- باوەڕی پێ ناکات، لەبەرئەوەی بە ڕاستی نازانێت.

ب- پابەندیش نابێت پێوەی، لەبەرئەوەی دەکرێت ئەو مانایە نەگەیەنێت.

دەی ئەم دوو گرفتە سەرەکییە لەلای کەسێك کە باوەڕی بە ئایین نییە و پابەند نییە پێوەی و مامەڵە لەگەڵ دەقێکدا دەکات، زەمینە سازکەرن بۆی کە بونیادی فیکری مەعریفی خۆی سەبارەت بە خوێندنەوەی دەق و پرسەکان لەسەر (تەئویل) بونیاد بنێت.

(تەئویل) چییە؟!

زۆرێـك لـەو لێكۆڵـەر و توێـژەرە سـیكۆلارانەی لـە جیهـانی ئیسلامیدا هەن لە نمونەی: (عەلی حەرب، محمد ئەرگۆن، طیب تیـزیـنی، نەصـر حامـد ئـەبو زێـد، حەسـەن حەنـەفی، سـەید ئەلقەمەنی، هاشم صالح و زۆرێكی تریش) كە داكۆكی لەسەر ئـەم بیروڕایـە دەكـەن، زۆر گرنگـی بـەوە دەدەن كـە قوتابخانـەی (تـەئویل) بكەن بـە قوتابخانەیـەكی گـەورە و پێیـان وابێـت كـە بنچینە و بنەڕەتی ئەم قوتابخانەیە لـە هەموو قوتابخانەیەكی تر گەورەتر و فراوانترە و دەتوانێت ڕاڤە و شیكاری بۆ هەموو جۆرە دەق و پرسێك بكات.

ئەمانـە لەبەرئـەوەی لـەناو كۆمەڵگـەی موسـڵماناندا دەژیـن، خـاڵی یەكـەم ڕاناگەیـەنن كـە (بـاوەڕ نەبوونـە بـە دەقەكـە). ئـەم كەسایەتییانەی كە بانگەشەی بە ئاشكرای سیكۆلاریزم دەكەن بۆ كۆمەڵگا و بۆ دەوڵەت، وە پێیان وایە دەبێت دەقە ئایینییەكان لـە دەوڵەتـداری و دەسـەڵات جیابكرێتـەوە، خـاڵی یەكـەمیان زۆر بـاس ناكـەن و زۆر بـە لایـدا نـاڕۆن. واتـە نایـەن ڕاسـتگۆیانە و

ڕاشـکاوانه لـه ڕاگەیاندنـەکان و ڕۆژنامـه و گۆڤارەکـان و کـۆڕ و سیمینارەکاندا بڵێن: "خودایەك له ئارادا نییه و موحەممەد(ﷺ) پێغەمبـەری خـودا نییه و قورئـان پـەیامی خـودا نییـه". ئەمـەیان ناکـەن، چـونکه ئەمـەیان چەند کێشـه و گرفتێکـی گـەورەیان بـۆ دروســت دەکــات. ئەگــەری هەیــه بازنــەی بانگەشــەکردن و قسەکردنیان تەسك ببێتـەوە یـان ئەگـەری هەیـە زینـدانی بکـرێن، چـونکه کێشـه و گرفتێکـی کۆمەڵایـەتی دروسـت دەکـەن و ئـیتر دەسەڵات ناچارە کە نەیەڵێت ئەمانە ببنە مایەی پشێوی و ئاژاوە یـان ئەگـەری هەیـە بکـوژرێن یـان ئەشـکەنجە بـدرێن یـان لەلایـەن کەسـوکاریانەوە دژایـەتی بکـرێن. جـا لەبەرئـەوەی ئـەم هـەموو ئەگەرە هەیە کە زیانیان پێ بگات، لەبەرئەوە هـەتا بۆیـان بکرێـت بـە ئاشـکرا و بـێ پێچ و پەنا و بە ڕاشکاوانە باسـی ئـەوە ناکـەن بڵێن: "خودا بوونی نییە" یان "موحەممەد(ﷺ) پێغەمبـەر نییـە" یان "قورئان پەیامی خودا نییە".

کەواتـە زۆر قسـە لەسـەر ڕاسـتبوونی بابەتەکـە ناکـەن، بـەڵکو قسـە لەسـەر بەشـی دورەمـی دەکـەن. کـە بـە داخـەوە ئـەم بەشـی

دووەمە بووە بە خۆرەیەك نەك ئەوان، بەڵكو زۆرێك لە ڕۆشنبیرە موسڵمانەكانیش ئەوانەی ماستەر و دكتۆرایان هەیە و پێیان دەوترێت: "پسپۆڕ لە بوواری فیكری ئیسلامی" یان "شارەزا لە كۆمەڵ و گروپە ئیسلامییەكان"، ئەمانیش بەشێوەیەكی گشتی لەناو كۆمەڵگەی موسڵمانەكاندا زۆرتر گرنگی بە بەشی دووەم دەدەن كە ئەمانیش پێیان وایە كە خودا هەیە و موحەممەد(ﷺ) پێغەمبەری خودایە و قورئانیش پەیامی خودایە، بەڵام ئێمە مانایەكی تری دەكەین كە جیاوازە لەو مانایەی تۆ دەیكەیت.

خوێندنەوەكەی بانگەشەكارانی سیكۆلار لەناو كۆمەڵگا موسڵمانەكاندا سەردەكێشێت بۆ ئەوەی بازەنەی ئەو شتانەی كە پێیان دەوترێت (واجبات) یان هەر نەمێنێت یان زۆر كەم ببێتەوە، وە بازنەی ئەو شتانەشی كە پێیان دەوترێت (قەدەغەكراو و حەرامكراوەكان) یان هەر نەمێنێت یان زۆر كەمی بكەنەوە. واتە دەكرێت كەسێك لە ڕووی فیكری و مەعریفییەوە باوەڕدار بێت و پابەند بێت، بەڵام لە ڕووی كرداریی و گوفتارییەوە و لە ڕووی ئاكار و هەڵوێستەوە زۆر بە دەگمەن

پابەند بێت بە ئەرکێکەوە کە جێبەجێ بکرێت یان دوورەپەرێز بێت لە قەدەغەیەك کە نابێت بکرێت.

لەبەرئەوە، ئەو ناوانەی کە لەسەرەوە ناومان بردن، زۆر کار لەسەر بەشی دووەم دەکەن. بە ڕاشکاوانە کتێبێك نانووسن کە بڵێن: "خودا بوونی نییە" یان "موحەممەد(ﷺ) پێغەمبەر نییە" یان "قورئان پەیامی خودا نییە" کە ئەمە بەشی یەکەمیەتی و پەیوەندی بە (صحیح)ـبوونەکەوە هەیە و ئەمە وا دەکات تۆ باوەڕت هەبێت و پابەند ببیت. ئەوان قسە لەسەر ئەم بەشەی ناکەن چونکە نایانەوێت هەست و نەستی سەدان و هەزاران و ملیۆنان موسڵمان بە دایك و باوکی خۆیانەوە، بە کۆمەڵگاکانی خۆیشیانەوە، بریندار بکەن. بەڵکو دەچێت بۆ بەشی دووەم کە پێی وایە ئەوەی تۆ بە (واجب)ی دەزانیت دەکرێت (واجب) نەبێت، وە ئەوەی تۆ بە (حەرام)ی دەزانیت دەکرێت (حەرام) نەبێت.

چۆن کەسێك دەتوانێت بەئاسانی ئەم بڕیارە بدات؟! کاتێك دەتوانێت ئەم بڕیارە بدات کە بونیادی فیکری و مەعریفی خۆی

و میتۆدی خوێندنەوە و تێگەیشتنی بۆ دەقەکان لە ڕووانگەی (تەئویل)ـەوە بێت نەك پابەندبوون بەو دەقەوە. وەك خۆیان دەڵێن: "تێگەیشتن(فهم)ـی دەق و ڕاڤە(تفسیر)ی دەق نییە"، ئەمەیان بەلاوە گرنگ نییە، بەڵکو (تەئویل)ی دەقیان بەلاوە گرنگە.

جا (تەئویل) بەو شێوەیەی کە لەلای زانایانی ئوممەتی ئیسلامیش هاتووە و ئەم سیکۆلارانەیش زۆر داکۆکی لەسەر دەکەن، بریتییە لە: "صرفٌ للفظ الى معنى يحتمله، بل يَطمح الى اكثر من ذلك، إلى التفكيك الذي يقطع الصلة بين النص وقائله وبين المعنى واحتمالاته". واتە: "لادانی وشەیەکە بۆ مانایەك کە ئەو ئەگەرە هەڵبگرێت، بەڵکو زیاتر لەوەش کە لاتبدات لە مانای ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوانەی دەقەکە" ئەمەیش ئەوەیە کە بتوانیت وەك کەسێك کە خوێنەری دەقێکیت ئەو دەقە دابڕیت لەو کاتەی کە لێوەی هاتووە، وە دای بڕیت لەو کەسەیش کە یەکەمجار بۆی هاتووە. بەڵکو خوێندنەوەی خوێنەری ئێستا و ژینگەی ئێستا تەحەکوم بکات بەسەر ئەو دەقەدا.

واتە وابکەن دەقێکی وەکو قورئانی پیرۆز کە سەرچاوەی سەرەکی و بنەڕەتی ئایینی ئیسلامە، دەڵێن: "ئێمە پێویستمان بەوە نییە کە بزانین پێغەمبەر(ﷺ) یان هاوەڵانی بەڕێز یان زانایانی پایەبەرزی پێشین چۆن لەم دەقە تێگەیشتوون، چونکە ئەوە بۆ ژینگە و هەلومەرجی خۆیان بووە. ئێمە باوەڕمان هەیە کە ئەم دەقە هەیە، بەڵام دەیهێنین خوێندنەوەی سەردەمییانەی بۆ دەکەین و دایدەبڕین لەو ژینگەیەی کە سەرەتا تیایدا سەریهەڵداوە و هەم دایشی دەبڕین لەو ڕاڤەکارانەی کە لە ژینگەی یەکەمجاردا بوون. بەمەش ئێستە ئێمە مامەڵە لەگەڵ دەقێکدا دەکەین کە دەکرێت ئێمە بە جۆرێك لێی تێبگەین کە هیچ کەسێك لە پێشینان بەو شێوەیە لێی تێنەگەیشتبن".

لەبەرئەوە ناچارە کە ئەو وشەیە یان ئەو دەقە لابدات لە مانا ڕاستەوخۆکەی خۆی بۆ مانایەك کە ئەگەری هەیە ئەو مانایە بگەیەنێت. لایدەدەن بۆ (احتمال مرجوح)، واتە ئەگەر وشەیەك مانایەکی ڕاستەوخۆی هەبێت و ڕاستەوخۆ ئەو مانایە بگەیەنێت، ئەوە پێی دەڵێن: "ئەم وشە مانایەکی (راجح)ی هەیە و ڕاستەوخۆ فلان مانا دەگەیەنێت، کەچی ئەمان دەیبەن بۆلای

مانایەك كە ئەگەرێكی زۆر دووری هەیە. بەڵام ئەوان پێیان وایە هەلومەرج و بارودۆخەكان وا دەخوازێت كە ئێمە وشەكان لە مانا ڕاستەوخۆكانی خۆیان لادەین و بیانبەین بۆلای مانا ناڕاستەوخۆكان، لەبەرئەوەی بگونجێت و بسازێت لەگەڵ ئەو ژینگە و هەلومەرجەی كە خوێنەری ئەو دەقەی تێدایە لەو شوێنەدا".

واتە دەكرێت هەر یەك دەقیش بێت، بێجگە لەوەی كە ئەم دەقەیان دابڕیوە لە مانا و ڕاڤە و تێگەیشتنی سەردەمی یەكەمی ژینگەی دابەزینی دەقەكە، تەنانەت دەكرێت دایشی بڕن لەو مانایەی كە زانایانی وڵاتێكی دراوسێ بەدەستیان هێناوە. واتە دەكرێت هەر یەك دەق یان یەك دێڕ لە (ئەستەنبوڵ) مانایەكی بۆ بكەن و لە (تاران) مانایەكی تر و لە (بەغداد، قاهرە و مەككە)ش یەكی مانایەكی تری جیاوازی بۆ بكرێت. وە دەشكرێت هەر پێنج ماناكە ڕاستبن و هەر پێنجیشیان دژی یەكبن. هەر یەكەیان گونجاو و لەبارن بۆ بارودۆخ و هەلومەرجێكی تایبەتی. كەواتە بەم پێیەش وشەكان مانا ڕاستەوخۆ و ڕاشكاوەكانی خۆیان لەدەست دەدەن.

کەسێك کەوا بانگەشە بۆ ئەم جۆرە سیکۆلاریزمە دەکات کە لە کۆمەڵگای خۆماندا ئەم حاڵەتە کەمە، وە ئەگەر ئەوانەی خۆمان شتێکی لەمەشیان هەبێت ئەوا دۆبلاژ و ورگێڕاوی بانگەشەکارانی سیکۆلاری ناو ئێرانی و تورك و عەرەبەکانە، ئەگەرنا ئەوانەی لای خۆمان لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی هەڵقوڵاوی ناو کۆمەڵگەی خۆمانیان نییە، وە ئەگەر هەشبێت زۆر کەمە.

با ئێمە ئەم دەقە ئاینییە (قورئانی پیرۆز) بکەین بە نمونە بۆ قسەکانمان، چونکە لەناو ئوممەتی ئیسلامیدا کە کلتوورێکی زۆر بەرفراوان و گەورەی هەیە و دەتوانم بڵێم بە ملیۆنەها کتێبی (نوعي) هەیە لەناو ئەم کلتوورەی ڕابردوودا کە تەواوی کتێبەکانی (تەفسیر و حەدیس و فیقە و عەقیدە و ئەخلاق و سیره و فیقهی دەعوە و ئوصوڵی دەعوە و علوم القرآن و علوم الحدیث و ئوصوڵی فیقه و زانستەکانی زمانەوانی و هتد) هەموو ئەمانە کۆبکەیتەوە، ئەوا زیاتر لە ملیۆنەها کتێبی جۆراوجۆری تێدایە. هەموو ئەمانەش دەبن بە دەقی ئاینی و با ئێمە لەناو

هەموو ئەمانەدا دەقێك هەڵبـژێرین کە لـە هـەموویان بـەڕیزتر و لەپێشتر و پیرۆزتر بێت کە (قورئانی پیرۆز)ە. بۆچی کەسێك لـەم بانگەشـەکارانەی سـیکۆلاریزم کاتێـك کـە عەرەبییـەکی باشـیش دەزانێـت و بگـرە بـە ڕەچـەڵەکیش عەرەبـە، کاتێـك کـە قورئـان دەخوێنێتـەوە بـاوەڕی پـێ ناهێنێـت و پابەنـد نابێـت پێـوەی؟ ئـەویش لەبـەر ئـەو دوو هۆکـارە سـەرەکییەیە کـە لـە پێشـتردا ئامـاژەمان پێدا. یەکـەمیان بـریتی بـوو لـەوەی کـە (بـاوەڕی پێـی نییـە)، بـەڵام بـە ئاشـکرا دەرینابڕێـت. وە دووەمیشـیان کـە زۆر گرنگی پێدەدات بریتییە لەوەی کە (ئەو دەقە بە جۆرێك ڕاڤە و مانا بکات کە ئەو مانایە نەدات بەدەستەوە کە خەڵکی باوەڕیـان پێیـەتی و پێوەی پابەندە، بەڵام بە شێوەیەکیش خۆی لـێ بدزێتـەوە و خـۆی لـێ ببوێرێـت کـە تـۆ نـەتوانیت ڕاسـتەوخۆ و ڕاشـکاوانە تۆمـەتباری بکەیت. ئەویش بە (تەئویلکردن)ی ئەو دەقە).

جـا بونیـادی (تـەئویل) لای ئـەو جـۆرە بانگەشـەکارانە چـەند پایەیـەکی سـەرەکی هەیـە. واتـە هـەوڵیان داوە کاتێـك کـە دەقێـك دەخوێننەوە، بەتایبەتی دەقێکی وەك (قورئانی پیرۆز)، بـە چـەند

پێوەر ڕووبەڕوو ببنەوە لەگەڵ ئەو دەقەدا و بتوانن ئەو دەقە بەو شێوەیە لێبکەن کە خۆیان مەبەستیانە. وە ئەم چەند پێوەرەشیان لە کۆی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتناسەکان و سیکۆلار و لائیک و ناسیۆنالیستەکانی ڕۆژئاوا بۆ دەقەکانی ئینجیل و تەورات کە ئەو بابەتانە سەریهەڵداوە. بەهەمانشێوە ئەو شێوازی خوێندنەوەی ڕۆژهەڵاتناس و سیکۆلار و ناسیۆنالیستەکانی ئەورووپا و ڕۆژئاوایان هێناوە و دەیچەسپێنن بەسەر قورئانی پیرۆزیشدا.
ڕۆژئاوا چۆن  بە حسابی خۆیان ڕزگاریان بوو لە باوەڕبوون بە دەقی ئایینی و لە پابەندبوون بە دەقی ئایینی و لە دەسەڵاتی ئایینی، بە هەمان شێوە ئەمەش بگوازنەوە بۆ ناو کۆمەڵگای موسڵمان و باشترین ڕێگەچارەش بە حسابی خۆیان بۆ ئەوەی گەنجان و ڕۆشنبیرانی ناو کۆمەڵگای موسڵمان ڕزگاریان ببێت لە باوەڕ بە دەقی ئایینی و پابەندبوون پێیەوە و بە حسابی خۆیان ڕزگاربوونی یاساکانی دەوڵەت لە یاسا ئایینییەکان، ئەوا دەبێت هەمان ئەو پێودانگ و ئامراز و هۆکارانە بگرێتەبەر کە

ڕۆژهـەڵاتناس و بـەناو ڕۆشـنبیرەکانی ڕۆژئـاوا گرتیانەبـەر سەبارەت بە مامەڵەکردنیان لەگەڵ دەقەکانی ئینجیل و تەوراتدا. لە ئەورووپا هەر لەسەرەتاوە و دوای شۆڕشی فەڕەنسی کە بە ئاشکرا باسی نەبوونی خودا کراوە و سووکایەتی بە خودا و بە پێغەمبەرانی خودا کراوە، بەڵام زۆرێك لە ڕۆشنبیر و بیریار و شارەزاکانیان گەیشتوون بەو باوەڕەی کە "ئەگەر ئێمە دژایەتی ڕاستەوخۆی دەقە ئایینییەکان بکەین، ئەوا سەرکەوتوو نابین. لەبەرئەوە باشترین چارەسەر ئەوەیە بەو خەڵکەی ڕابگەیەنین کە مەرج نییە ئەم دەقە هەر بە تەنها ئەو مانایە بگەیەنێت کە پێشەوایانی ئایینی و ڕابەرانی سەرەتای دابەزینی دەقە ئایینییەکان بۆیان کردووە. بەڵکو دەکرێت ئێمە خۆشمان بە مەسیحی یان جولەکە بزانین، بەڵام مانایەك بۆ ئەو دەقە ئایینییانە بکەین لەناو ئینجیل و تەوراتدا کە گونجاو و تەبا بێت لەگەڵ ئەم هەلومەرج و بارودۆخەدا".

لەبەرئـەوە دەبینیـت بـەناو ڕۆشـنبیران و بانگەشـەکارانی سـیکۆلار لـەناو کۆمـەڵگاکانی موسڵمانانیشـدا هـەمان ڕێگـە و

شێوازیان گرتووەتەبەر كە ڕۆشنبیر و بیریارەكانی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا گرتوویانەتەبەر سەبارەت بە مامەڵەكردنیان لەگەڵ دەقە ئایینییەكاندا. ئەمانیش سەبارەت بە دەقە قورئانییەكان هەمان مامەڵە دەكەن كە ئەویش ئەو چەند یاسا سەرە كییەیە كە بەو لاڕێیەدا دەیانبات كە ئەمانەن:

یەكەم: (الأصل في الكلام التأويل)، واتە:(بنچینەی ڕاست ئەوەیە كە ڕستە و دەربڕینەكان مانای ڕاستەوخۆ و دیاریكراو نەبەخشن)

پێیان وایە كە بنەڕەت و بنچینە لە قسەكردندا ئەوەیە كە چەند مانایەك هەڵبگرێت. لەڕاستیدا زۆرینەی زانایانی ئەم ئوممەتە دەفەرموون كە (الأصل في الكلام الحقيقة). واتە قسەیەك كە دەكرێت، دەبێت ڕاستەوخۆ ئەو مانایە بگەیەنێت كە ئەو وشەیەی بۆ دانراوە. بەڵام سیكۆلارەكان بە پێچەوانەوە پێیان وایە بەتایبەتی سەبارەت بەو دەقانەی كە دەقی پیرۆزی ئایینین یان دەقی شیعرین یان دەقی فەلسەفین، ئەوا ئەصڵ وایە كە

چەند مانایەك هەڵبگرن، نابێت یەك مانا هەڵبگرن. لەڕاستیدا ئەمەش یاسایەکە کە خۆیان دایاننناوە و پێچەوانە و دژی تێگەیشتنە لە قورئان لە ڕوانگەی خودی قورئانەوە، وە دژی تێگەیشتنە لە زمان، چونکە هەموو نەتەوە و کۆمەڵگایەك کاتێك بە زمانێك قسەدەکات، ئەگەر بتەوێت دادگایی بکەیت و ڕووبەڕووی ببیتەوە بە قسەکانی خۆی، ئەوا دەبێت مانای ڕاستەقینە لە قسەکانی وەربگریت، ئەگەر مانای (تەئویلی) بێت، ئەوا هەموو کەسێك دەتوانێت لە هەموو قسەیەکی خراپ بەئاسانی دەربازی ببێت و لە هەموو گرێبەست و مامڵەیەك خۆی قوتار بکات و بڵێت: "من مەبەستم ئەوە نەبوو". دەتوانێت هەرکاتێك ڕێگاکە تەسك بوویەوە یان بابەتەکە بوو بە بابەتێکی جددی، ئەوا خۆی لە هەموو جۆرە بیروباوەڕێك قوتار بکات و بڵێت: "من مەبەستم ئەوە نەبوو"، ئیتر وای لێدێت ئەم مەبەستە هەر دەرناکەوێت. بەڵکو لە ڕاستیدا مرۆڤ هەمیشە لە کۆمەڵگاکاندا قسەی بە ڕاستەقینە کردووە و ئەو وشانەی کە دانراون بۆ ئەو مانایانە ڕاستەوخۆ هەمان ئەو مانایانە دەگەیەنن

و هەر ئەوانەش بەرباسن و هەرکاتێك ویسترا بە وشەیەك مانایەکی تر بگەیەنرێت، دەبێت حساب بۆ سێ شت بکەیت کە ئەوانیش بریتین لە (علاقة، قرینة و سیاق). واتە تۆ بزانیت لە چ شوێنێکدا ئەم قسەیە کراوە، کە لەبەرئەوە ئەو مانایەی تر هەڵدەگرێت، وە هەم نیشانەیەك هەبێت بیباتەوە سەر ئەو مانایەی تر، وە هەم پەیوەندییەکیش هەبێت لە نێوان ئەم قسەیە و قسەکەی تردا.

بەڵام ئەوان پێیان وایە ئەصڵ لە قسەکردندا بریتییە لە (تەئویل). لە ڕاستیدا زیاتر (نەصر حامد ئەبو زەید) لە کتێبی (مفهوم النص) و (طیب تیزیني) لە کتێبی (النص القرآني) و (حسن حنفي) لە کتێبی (من العقیدة الی الثورة) و کەسانی تریش زۆر داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەن کە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەقێکی پیرۆزی وەکو قورئاندا دەبێت پێمان وابێت کە "الأصل في الکلام التأویل". تەنانەت یەکێکیان دەڵێت: (لأن فهم النص لایبدأ من قراءة النص وإنما یبدأ من خلفیة القارئ وثقافته والدوال

المكونة لهذه الثقافة وآفاقه المعرفية و بين النص)[88]. واتە: "تێگەيشتن لە دەق لەوێوە دەستپێناكات كە دەقەكە بخوێنيتەوە، بەڵكو لەوێوە دەستپێدەكات كە بزانين باكگراوندی خوێنەرەكەی چييە، وە ڕۆشنبيری ئەو چەندە". واتە خوێنەر دەتوانێت تەحەكوم بكات بەسەر ئەوەدا كە مانای ئەم دەقە چييە، ئەگەرنا ئەو دەقە لە خودی خۆيدا مانايەكی دياريكراوی نييە.

لەڕاستيدا ئەم بيرۆكەيە گرفتێكی گەورەيە. واتە بە بۆچوونی ئەو دەكرێت زۆر بە ئاسانی شتێك لە ڕووانگەی ئەو دەقەوە كە قورئانی پيرۆزە و بە (واجب) دانراوە، بەپێی خوێنەرەكان بگۆڕێت و دەكرێت خوێنەرێك بە (واجب)ـی نەزانێت و خوێنەرێكی تر بە (مندوب)ـی بزانێت و يەكێكی تريان بە (مباح)ـی بزانێت و ئەويتريان بە (مكروه)ـی بزانێت و لەوانەيە دانەيەكی تريشيان بە (حرام)ـی بزانێت. جا بەمەش هيچ مانايەك

[88] مفهوم النص، نصر حامد ابو زيد، لا: ١٠١

نامێنێتەوە بۆ وشەکان، چونکە پێی وایە باکگراوند و تەمەن و خوێنەواری و ئامانج و مەبەست و شێوازی خوێنەرەکەی دەریدەخات کە ئەو دەقە بۆ چ مانایەك هاتووە. تەنانەت (طیب تیزیني) لە شوێنێکی تردا دەڵێت: (والقرآن علی ذلك کله متشابه وفیه دلالات محتملة لاتحصی وتتیح للکل أن ینطقوا بإسمه)[89].

واتە: "لەسەر بنەمای ئەم مامەڵە کردنە هەموو قورئان موتەشابیهە، وە کۆمەڵێك مانای زۆری لە ژمارەبەدەر هەڵدەگرێت، وە ئەو دەقە ڕێگە دەدات بە هەموو کەسێك کە بە زمانیەوە قسەبکات" کە ئەمەش مانای ئەوەیە بە قسەی ئەو قورئان یەك ئایەتی تێدانییە کە مانایەکی تر هەڵنەگرێت. جا وەرە بیری لێ بکەرەوە کە ئەو کاتە بزانە چەند بە ئاسانی دەتوانرێت لە هەموو مانایەکی ڕۆشنی ئایەتەکان مانایەکی تاریك وەربگیرێت.

---

[89] النص القرآني، طیب تیزیني، لا: ٢٤٢

بۆیــە هەنــدێکجار دەبینــین هەنــدێك بــەناو ڕۆشــنبیری موســڵمانیش زۆر بــە ســادەیی و ئاســانی دەڵێــت: "مــن خوێندنەوەی خۆمم هەیە بۆ قورئان" یان "خوێندنەوەی تایبەتم هەیە بۆ قورئـان". واتـە بەو مانایـەی بەس تایبەتـە بە خـودی خۆیـەوە کـە بەلای خۆیـەوە دەکرێـت جۆرێـك لێـی تێبگـات کـە کەسـی تـر وا لێـی تێنـەگات. قسـەکەی ئەمیش واتـە ئـەو وشـانە ڕاستەوخۆ ئەو مانایانەی خۆیان ناگەیەنن.

(نصـر حامـد ابـو زيـد و علـي حـرب) و هـەموو ئـەوانی تـریش داکۆکی لەسـەر ئەوە دەکەن کە دەڵێن: (إنّ الـنص المحكم الـذي لايحتمل إلاّ دلالةً واحدة، لاوجـود لـه في الأرض). واتـە: "دەقێکی موحکەم [٩٠] کە یەك مەبەست زیاتر هەڵنـەگرێت لە سـەر زەویـدا

[٩٠] لە پێناسەی زانایانی ئوصولی فیقهدا بە دەقێك دەڵێن (محکم) کە (واضح الدلالـة)ـە واتـە ماناکـەی ڕۆشـن و ڕوونـە. (متشـابە) واتـە مانایـەکی سـادە دەگەیەنێت، بەلام مانایەکی قوڵتر هەیە لە پشتییەوە کە دوایی دەبێت کەسێك دەرکی بکات کە توانا و ئاستێکی بەرزی هـەبێت و ئـەو کاتـە ئەو مانایـەی تـر بگەیەنێت.

بوونی نییە". کەواتە ئەمانە پێیان وایە کە هەموو قورئان موتەشابیهە. واتە هەرچی لە قورئاندا هاتووە سەبارەت بە (ئەحکام، عەقیدە، ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە، ناو و سیفەتەکانی پێغەمبەران، سیفاتی پەیامەکانی خودا، ئەحوال و مەشاهیدی ڕۆژی قیامەت و هتد) دەکرێت مانایەك هەڵبگرن کە بەهیچ شێوەیەك ئەو مانایە نەدات کە ئەو وشە ڕاستەوخۆ دەیگەیەنێت یان ئەو مانایە نەدات کە زانایان ڕاڤەیان کردووە. واتە ئەگەر لەسەر زەویدا حەوت ملیار کەسی ژیر و خوێنەوار هەبن، ئەوا دەکرێت حەوت ملیار تێگەیشتن و ڕاڤەیان هەبێت بۆ قورئان و هی هەمووشیان جیاواز بێت لەوی تریان و ئەم کۆکردنەوەی دژیەکییانە لەلایان شتێکی ژیرانە و لۆژیکییانە بێت!

لەڕاستیدا هێنان و وەرگرتنی ئەم بیرۆکەیە بنچینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (مارکسیزم). کە یەکێك لە بنچینە و بنەڕەتەکانی (ماتریالیزمی دیالیکتیکی) بریتییە لە (التناقض). واتە هەموو شتێك لەناو خۆیدا دژەکەی خۆیشی هەڵگرتووە و دواتر

سەردەکێشێت بۆ شتێکی تر و دوایی ئەویش بە هەمانشێوە و ئیتر ئەم پرۆسەیە بەم شێوەیە هەر بەردەوام دەبێت هەتا بێ کۆتا.

تەنانەت یەکێك لەو بەناو ڕۆشنبیرانە کە (عەلی حەرب)ـە دەڵێت: (لأن النص المحكم في البعد الواحد الذي يكون أُحادي التصور، نص امبريالي دكتاتوري)[91]. واتە: "ئەگەر دەقێکی موحکەممان هەبێت و یەك مانای ڕوون و ڕۆشنی هەبێت و مانای تر هەڵنەگرێت، ئەوە دەقێکی ئیمپریالی و دیکتاتۆرییانەیە" پێی وایە دەق نابێت وابێت، بەڵکو دەبێت دەقێکی کراوە و فرەمانا بێت. ئەوان پێیان وایە دەقەکە هەیە کە قورئانە، بەڵام دەڵێن دەکرێت جۆرێك لێی تێبگەین کە جیاواز بێت لە شێوازی خوێندنەوەی هەموو کەسێکی تر. پێیان وایە ئەوانەشی خوێندنەوەیان بۆ قورئان کردووە و ڕاڤەیان کردووە، ئەوا کەسەکە و ژینگەکە سەرچاوەی ئەو جۆرە خوێندنەوەیەن نەك وشەکان خۆیان و سیاقە قورئانییەکان.

---

[91] نقد النص، علي حرب، لا:١٨

دووەم: (لاتوجدُ قراءة بريئة)، واتە: (خوێندنەوەی بێ خەوش نییە بۆ هیچ دەقێك)

پێیان وایە کە هیچ جۆرە خوێندنەوەیەکی پاك و بێ خەوش نییە کە بڵێیت ئەم جۆرە خوێندنەوەیە لەسەدا سەد ڕاستە و مانای تر هەڵناگرێت و تەنیا یەك مانا دەگەیەنێت، بەڵکو شتی وامان نییە و هەموو خوێندنەوەیەك دەکرێت ببرێت بۆ مانای تریش. بەڵکو خۆیان و خوێنەریش دەخەنە ناو کەش و هەوایەکی پڕ لە بیروبۆچوون و تێکەیشتنی دژبەیەك و ناکۆکەوە و گەلێك پێی خۆشحاڵ و شادمانن، وە پێی وایە ئەم وا خوێندوویەتییەوە و مەرجیش نییە ڕاست بێت. دەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بەردەوام مرۆڤ لەناو دوودڵی دڵەڕاوکێییدا دەهێڵێتەوە. وە ئەم وتەیەش کە دەڵێت " لاتوجدُ قراءة بريئة" لە کەسێکی ڕۆژئاواییەوە وەریانگرتووە بەناوی (ئالتۆسیر).

سێیەم: (ليس للنصوص معاني ثابتة أو دلالات ذاتية)، واتە: (دەقەکان مانای جێگیر و خودییان نییە).

دەڵێن هیچ دەقێك لە خودی خۆیدا مانایەکی جێگیری نییە. واتە هەموو وشەیەك کە لەناو ڕستەیەکدا دادەنرێت و دەبێتە دەقێك، مانایەکی جێگیری نییە و دەکرێت مانای جیاواز هەڵبکرێت. تەنانەت (نەصر حامد ئەبو زێد) دەڵێت: (ولا یمکن الوصول الی المعنی الحقیقي الموضوعي للنص والقصد الإلهي منه، لأنه لاوجود لهذا المعنی فالمعنی متغیر من عصر الی عصر)[٩٢]. واتە: "ناکرێت و ناگونجێت ئێمە بگەین بە مانایەکی ڕاستەقینە و بابەتی بۆ دەق و مەبەستی خودا لەو دەقە، چونکە ئەو مانایە بوونی نییە و مانا گۆڕانی بەسەردا دێت لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر". واتە پێی وایە دەکرێت مانایەك بۆ قورئان بکرێت کە بە هیچ شێوەیەك هیچ زانایەك نەیکردبێت، وە لە هیچ فەرهەنگێکی زمانەوانیشدا ڕێی نەبێتەوە.

چوارەم: (تأنسن النص القرآني)، واتە: (مانای قورئان خودایی نییە، مرۆڤکردە)

[٩٢] إشكاليات القراءة، نصر حامد ابو زيد، لا: ٤٧

ئەم سیفەتە لای زۆرینەیان ڕەنگیداوەتەوە و پێیان وایە کە ئەم دەقە قورئانییە دەقێکی مرۆڤکردە. ئەمە چۆن؟! دەڵێن ئەو ساتەی کە قورئان لای خوداوە دابەزیوە بۆ (موحەممەد(ﷺ))، ئەو ساتە دەقێکی خودایی بووە و کە گەیشتە دەستی موحەممەد و گەیاندی بە خەڵکی، ئیتر لە دەقێکی خوداییانە دەردەچێت و دەبێت بە دەقێکی مرۆیی. ئیتر ئەوە مرۆڤە دەیخوێنێتەوە و مانای دەکات و دەبێت بە دەقێکی مێژوویی و ئیتر دەقێکی خودایی نییە. پێیان وایە هەر لەو ساتەوەی کە لەلای خوداوە هات بۆ مرۆڤ، ئیتر ئەو تایبەتمەندییە خوداییە لەدەست دەدات و دەبێتە دەقێکی مرۆڤانە، چونکە دەکاتە دەستی مرۆڤ و هەر مرۆڤ دەیخوێنێتەوە و مرۆڤیش دەیگەیەنێت. (طیب تیزینی) دەڵێت: (فمنذ أن نزل القرآن الى البشر أصبح نصاً تأريخياً لأنه تحول من كتابِ تنزيل الى كتابِ تأويل فأصبح كتاباً بشرياً تأريخياً وتراثياً وإجتماعياً)[٩٣]. واتە:

[٩٣] الإسلام والعصر، طيب تيزيني، لا: ١٢٠

"هەر لەو کاتەوەی قورئان نێردرایە خوارەوە بۆ مرۆڤ، ئیتر بوو بە دەقێکی مێژوویی، چونکە کتێبێکی هاتووە لەلایەن خوداوە گۆڕاوە بۆ کتێبێکی تەئویلکراو و ئیتر بوو بە کتێبێکی مرۆیی لە ڕووی مێژوویی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەوە". سەرنجبدە کە پێی وایە خودا هەیە و دەشڵێت دەقەکە لە بنچینەدا هی خودایە، بەڵام بەم جۆرە تۆ لاڕێ دەکات بۆئەوەی ئەو ڕێز و حورمەتە بۆ قورئان دانەنێیت کە بڵێیت دەقێکی خوداییانەیە. ئیتر مادام گەیشتە دەستی مرۆڤ ئەوە دەقێکی مرۆڤانەیە. یان دەڵێن: (إنّ النصوص الدينية تأنسنت منذ تجسدت في التأريخ واللغة وتوجهت بمنطوقها ومدلولها الى البشر في واقع تأريخيٍ محدد. إنها محكومة بجدلية الثبات والتغير، فالنصوص ثابتة في المنطوق متغيرة في المفهوم)[٩٤]. واتە: "دەقە ئایینییەکان ئیتر ڕەنگ و شێوەی مرۆڤانە دەگرنە خۆیان لەو کاتەوەی لە سەردەمێکی دیاریکراودا سەریان هەڵداوە، وە بە زمانێکیش

[٩٤] نقد الخطاب الديني، نصر حامد ابو زيد، لا: ١١٨ - ١١٩

نووسراون کە ئەو زمانەیە کە ئەو کۆمەڵگەیە قسەیان پێکردووە و پێیان نووسیوە، بەم هۆیەشەوە دەبێتە موڵکی ئەوان. ئەم جۆرە دەقانە بڕیار لەسەردراون بە پێی دەرهاویشتە و کێشمەکێشەکانی پرس و دیاردە گۆڕاو و جێگیرەکانی کۆمەڵگە، دەقەکان وشە و پیتەکانیان جێگیرن، بەڵام مانا و واتاکانیان هەمیشە لە گۆڕاندان". ئەمانە نالێن "دەقەکە لابە و بەکەڵك نایەت"، بەڵکو دەڵێن: "دایننێ، ئەم دەقە پیرۆزە، بەڵام ئێمە خوێندنەوەی خۆمانی بۆ دەکەین". ئا بەم شێوەیە خۆی قوتار دەکات لە بەشی یەکەم و نالێت: "من باوەڕم بە بوونی خودا نییە وەك دروستکەرێك و بەوەی پەیامبەرێکی هەبێت و پەیامی هەبێت بۆ مرۆڤ"، بەڵکو دەڵێت: "خودا هەیە و پەیامبەری هەیە و پەیامی هەیە بۆ مرۆڤ، بەڵام لەبەرئەوەی لە هەل و مەرجێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری و شارستانی تایبەتدا لە ڕابردوودا هاتووەتە خوارەوە، کەواتە ئەو تێگەیشتنەی بۆ ئەو دەقە لە ڕابردووەوە بۆمان ماوەتەوە شتێکی پیرۆز نییە، وە شتێکی خودایی نییە و دەکرێت خوێندنەوەیەکی

سـەردەمییانەی بـۆ بکرێـت کـە لەسـەدا سـەد جیـاواز بێـت لـە خوێندنـەوەی ئـەوان". کەواتـە ئەمـەش سـەر دەکێشـێت بـۆ ئـەو یاسایەی خۆیان کە دەڵێن: "دەقە پیرۆزەکان دەقی مرۆڤن"، واتە لەبەرئــەوەی بــۆ مــرۆڤ هــاتوون و مــرۆڤ دەیانخوێنێتــەوە و دەیانگەیەنێت، کەواتە لە دەقێکی خودایی دەردەچن.

پێنجەم: (النسبیة)، واتە: (هەموو مانا و ڕاڤەیەك ڕێژەییە)

پێیـان وایـە کـە تێگەیشـتن لـە هـەموو دەقێـك تێگەیشـتنێکی ڕێژەییە. واتە دەکرێت بەڕێژێك ٢٠٪ لەو دەقە تێگەیشتبێت و پێکـابێتی و یـەکێکی تـر ٣٠٪ و ئـەوی تـر ٤٠٪ و کەسـێکی تـر ٥٠٪ و.. کـەس نییـە لەسـەدا سـەد لـە دەقێـك تێبگـات. تەنانـەت دەڵێن: "لەبەرئەوەی قورئان بوو بە موڵکی مرۆڤ و تایبەتمەندییە خوداییەکـەی لەدەسـتدا، ئـیتر لـە دیـدگای سـیکۆلارەوە کـەس ناتوانێـت مانایـەکی تـەواوەتی و یەکلاکـەرەوە بـۆ قورئـان بکـات، چـونکە ئەگـەر کەسـێك مانایـەکی تـەواوەتی بکـات ئـەوە خـۆی لەجێی خودا داناوە" واتە کەس ناتوانێت بڵێت ئەم مانایە مانای ڕاستیی ئەو دەقـە قورئانییەیـە و ئـەوەش بەڵگەکانیـەتی و مانـای

تـر هـەڵناگرێت و بۆیـە پێیـان وایـە هەرکـەس وا بڵێـت ئـەوە خودایـەتی دەکات بەسـەر خەڵکدا. وە زۆرجار ئەو قسـەیەت لـێ بیستوون کە دەڵێن: "ئێمە حوکم نادەین بەسەر کەسدا، خۆ ئێمە خۆمان لە جێی خودا دانانێین". واتە تەنانەت ڕازییان نییە کە تۆ پەیامەکـەی خـودا بگەیـەنیت بـەو شـێوەیەی کـە پـۆلێنی بیروباوەڕەکـانیش بکـەیت. ڕازی نـابن، چونکە دەڵـێن ئەگـەر تـۆ پۆلێن بکەیت، ئەوە تۆ خۆت لە جێی خودا داناوە، بەڵکو دەبێت خـودا خـۆی پـۆلێن بکـات. دەی خـودا خـۆی پـۆلێنی کـردووە. کـاتێکیش تـۆ دەڵێیـت مـن ئـاوا لێـی تێدەگـەم. ئەو دەڵێت مـەرج نییە بە تێگەیشتنی تۆ بێت. هـەروەك چۆن هەندێکجار لە ڕووی ڕامیاریشـەوە سەریکێشـاوە بـۆ ئـەوەی کـە دەڵـێن: "خـودا خـۆی بـەرگری ناکـات لـە ئایینەکـەی، ئـیتر تـۆ چیـت تـا بـەرگری لـێ بکـەیت؟ ئەگـەر خـودا بەرگری دەکات با خـۆی بێـت بـەرگری لـێ بکات. خۆ تۆ وەکیلی خودا نیت؟". ئـیتر ئـەوان حسـاب بـۆ ئـەوە ناکـەن کـە لـەو پەیامـەدا هـاتووە کـە ئـەی مـرۆۆ تـۆ تـاقی دەکرێیتەوە. ئەگەر باوەڕت هەبێت بە پەیامی خودا و پابەند بیت

ئەوا پاداشت دەکرێت و باوەڕت نەبێت و پابەند نەبیت، ئەوا سزا دەدرێیت. حساب بۆ ئەوە ناکەن کە بەشێك لەو باوەڕبوون و پابەندبوونە گەیاندنی ئەو پەیامە و داکۆکیکردنە لەو پەیامە و هەڵوێست وەرگرتنە سەبارەت بەو پەیامە. ئەو پێی وایە ئەمانە بەشێك نین لەوە.

تەنانەت ئەمانە بەم شێوەیە مانای ئەو ڕستەیەی (فریدرك نیچە)ی فەیلەسوفی ئەڵمانی دەکەن کە وتوویەتی: "خودا مرد."، ئەمان پێیان وایە مەبەستی ئەوەیە کە خوێندنەوەی پێش (نیچە) بۆ خودا و ئەو جۆرە خوێندنەوە و قسەکردنە لەسەر خودا مرد. دەکرێت بە شێوەیەکی تازەتر قسە لەسەر خودا بکەین. ئەمانە پێیان وایە ئەو خودایەی پێش سەردەمی (نیچە) قسەی لەسەر دەکرا، خودایەکی درندە و ستەمکار و بێ بەزەیی بووە و خودای تاریکی و نەهامەتی و هەژاری و گەندەڵی بووە. ئێستا لە دوای ئەو سەردەمەوە دەبێت باسی خودای خۆشەویستی و ئاشتی و پێکەوەژیان و ئازادی و هتد بکەین. کەواتە ئەم سیکۆلارانە پێیان وایە کاتێك (نیچە) دەڵێت: "خودا مرد"، مەبەستی پێی

تێگەیشتن و خوێندنەوە بۆ بابەتی خودایە. بەڵام باوەڕ بکەن ئەم قسەیەش خۆی (تەئویل)ە. چونکە (نیچە) لەسەدا سەد هەر ئەو مەبەستەی هەبووە کە خودا مردووە، بەس ئەو ڕاستگۆ و ڕاشکاو بووە لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی خۆیدا و کە باوەڕی بەوە نەبووە کە خودا هەیە، ئیتر ڕاستەوخۆ دەریبڕیوە. بەڵام ئەمان باوەڕیان وەك (نیچە) وایە، بەڵام لەبەرئەوەی ناتوانن ڕاستەوخۆ وەك ئەو دەریببڕن، ئیتر ناچار دەبن دیسان قسەکانی ئەویش پینە و تەئویل بکەن و بە ئاقارێکدا ببیەن کە بڵێن مەبەستی مردنی خودا نەبووە، بەڵکو مەبەستی مردنی ئەو جۆرە خوێندنەوە بووە بۆ خودا.

تەنانەت (موحەممەد ئەرگۆن) دەڵێت: (فمن السُخفِ الحقيقي الذي نأباهُ على انفسنا أن نحدد أخيراً معنى الحقيقي للقرآن)[٩٥]. واتە: "ئەوپەڕی بۆچوونێکی پووچ و بێکەڵکە کە پێمان وانەبێت کە نابێت قورئان مانایەکی دیاریکراو و ڕاشکاوی هەبێت"

[٩٥] الوحي، الحقيقة، التاريخ، محمد اركون، لا: ٣٦

بەمانایەکی سادەتر لە دیدگای ئەوەوە نابێت قورئان مانایەکی ڕاستەقینەی ڕوون بدات. بەداخەوە هەندێك لە مامۆستاکانیش زۆرجار لە مینبەرەکاندا دەڵێن: "قرآن حمالة الأوجهِ" واتە: "قورئان چەند مانایەك هەڵدەگرێت". ئائەمە ڕێ خۆشکەری ئەوەیە کە بانگەشەکارانی وەکو (موحەممەد ئەرگۆن و نەصر حامد ئەبو زێد و عەلی حەرب و طيب تيزيني و حسن حنفي و سيد القمني و محمد عابد الجابري و هتد) بە ئاشکرا بڵێن خۆ ئەمە هەر قسەی ئێمە نییە، ئەوەتا ڕیوایاتیشمان هەیە و ڕەئی زانایانیشمان هەیە کە دەکرێت قورئان چەند مانایەك هەڵبگرێت. دەی خوێنەری بەڕێز بەپێی ئەم قسانە بێت ئەوکاتە هیچ مانایەکی جەوهەری و جێگیر نامێنێت بۆ قورئانی پیرۆز. یەکێکی تریان دەڵێت: (فليس للقرآن معنىً محدد نهائي. إنه يقول كلّ شيئ دون أن يقول شيئاً)[96]. واتە: "قورئان مانایەکی سنووردار و کۆتایی نییە. قورئان هەموو شتێك دەڵێت بەبێ

[96] النص القرآني، طيب تيزيني، ل:٢٤٣

ئەوەی هیچ شتێك بڵێت". واتە تۆ ناتتوانیت لەسەر یەكێك لە تێگەیشتنە دیاریكراوەكان داكۆكی بكەیت و هەمیشە هەر مانایەك بكەیت، ئەوا دەبێت چاوەڕێ بیت و زۆر بەلاتەوە ئاسایی بێت كە مانایەكی دژ و پێچەوانەی ئەو مانایە بدات كە بۆی دەكەیت. بەڕێزان ئەمەش وا دەكات كەس نەتوانێت دڵی خۆش بێت بەو باوەڕەی كە هەیەتی، وە كەسیش نەتوانێت و نەزانێت كە لەسەدا سەد دەبێت پابەند بێت بە چییەوە. ئەوكاتە وای لێدێت كە پەیامێكی خودامان هەیە و هەركەس بە خوێندنەوە و دیدگای خۆی دەكرێت باوەڕی بە چەندی هەبێت و بە چەندییەوە پابەند بێت. كەواتە ئەو كاتە ئایینەكە دەبێت بە ئایینێكی تاكە كەسی و لەوە دەردەچێت كە ئایینی كۆمەڵگا و دەوڵەت و دەسەلات بێت. بەڕاستی ئەمەش گەورەترین ڕێ خۆشكردنە بۆ ئەوەی كە ڕۆژئاواییەكان مەبەستیانە لە ڕۆژهەلاتناس و بانگەشەكارانی سیكۆلار و لائیك و ناسیۆنالیستەكان كە چەندین جار لێتان بیستوون كە دەڵێن: "ئایین تەنها پەیوەندی نێوان عەبد و مەعبودە". یان لە پەندی

کوردیدا بیستووتانە کە دەڵێت: "عیسا بە دینی خۆی، موسا بە دینی خۆی" یان "کەس ناچێتە قەبری کەس" یان "دەست بگرە بە کڵاوی خۆتەوە با با نەیبات" یان دەڵێن: "بەینی خۆت و خودا خۆشکە و حەقت بە خەڵکی ترەوە نەبێت"، ئەوکاتە وای لێدەکەن کە هەرکەسێك بە تەنیا خۆی پەیوەندی بە خوداوە هەبێت و چۆن لە پەیامی خودا تێدەگات ئیتر هەر وا تێبگات، بەڵکو ئیتر ئەو شێوازی کۆمەڵکاری و جێبەجێکردن و پابەندبوونی گشتی و باوەڕی گشتی و ئەوشتانە نامێنێت، چونکە هەرکەس خۆی بەتەنیا ڕاستەوخۆ پەیوەندی هەیە و الله بەدیهێنەرە و و تۆیش بەدیهێنراو و ئەو پەرستراوە و تۆیش بەندە و قورئان هی خودایە و تۆیش خوێنەری قورئانیت و دەکرێت بە جۆرێك لە قورئان تێبگەیت کە یەك موسڵمان لەسەر زەویدا بەو شێوەیە لێی تێنەگات.

شەشەم: (لانهائیة المعنی)، واتە: (مانا جیاوازەکان بێ کۆتایین) دەڵێن: "مانای جیاواز کۆتایی نایەت". واتە ئەو مانایەی کە ئێستا دەیکەیت، دەکرێت نەك تا سبەینێ، بەڵکو کاتژمێرێك

دوای ئـەوە مانایـەکی تـری بکـەیت و مانایـەکی تـری بکـەیت و هەروەها بەو جۆرە. وەکو ژمارە وایە، چونکە ژمارە لـە یەکەوە دەستپێبکە و بژمێرە و هـەر بڕۆ و کۆتـایی نایـەت، ئەمیش پێـی وایە دەکرێت مانـا بۆ دەقێك کۆتـایی نەیـەت. نـەك ئـەوەی ئەگـەر حەوت ملیار کەس لەسەر زەویدا هەبێت، تۆ پێت وابێت دەکرێت حەوت ملیار مانا هەبێت، بەڵکو بەپێی قسـەکەی ئـەمان دەکرێت لە یەك کاتدا حەفتا ملیار مانای هەبێت، وە دەکرێت هـەر بـەیانی حەفتا ملیارەکە ببێت بە حەوسەد ملیـار مانـا. بیری لـێ بکـەرەوە بزانـە چ فەوزایـەك دروسـت دەبێـت کـە خوێنـەوار و گـەنج و ڕۆشـنبیرانی کۆمەڵگەیـەك مەشـغولّ بکـەیت بـەوەوە کـە کـەس نازانێت مانای ڕاستی ئەم دەقە چییە.

ئەمە سەردەکێشێت بۆ دوو شت، یا ئەوەیە تۆش لـە زۆنگـاوی مانا دژبەیەك و ناکۆکەکاندا وێڵ و سـەرگەردان ببیت، یا ئەوەیـە کە بە یەکجاری هەمووی سفر بکەیتەوە و بڵێیت من بۆ خۆم داوە لـەم هـەموو مانـدووبوون و ناڕەحـەتی و سەرئێشـە و دەمەقاڵـە و چـەلەحانێ و کێشمەکێشـە و هـەمووی وازلێبێنـە و تـۆش وەکـو

مرۆڤە سادەکانی تر دەخۆیت و دەخەویت و وەرزش دەکەیت و خەریکی هونەر دەبیت و ئیتر ڕابوویرە و چیتداوە لەم هەموو کێشە و گرفتە فیکری و مەعریفییانە؟! واتە یا بە یەکجاری دەستی لێ بەردەدەیت و وازی لێدەهێنیت یا هەتا دەمریت ناگەیت بە ڕاستەقینە و هەر ناگەیت بەوەی کە بزانیت ئەم دەقە داوای چ جۆرە باوەڕێک دەکات. وە داوای چ جۆرە ئاکار و گوفتارێك دەکات و هەر بۆت ساغ نابێتەوە. ئیتر بەڕاستی لەو پەڕی گومڕایی و سەرگەردانیدا ژیان بەسەر دەبەیت و مەگەر تام لە سەرگەردانی خۆت بکەیت و وەك چۆن مردوو ئازاری پێناگات، ئیتر تۆش لە هەموو باوەڕ و پابەندبوونێك قوتار بوویت، ئەوکاتە بەلاتەوە ئاساییە کە ڕۆژانە دەیان جۆر بۆچوونی دژبەیەك پێکەوە کۆبکەیتەوە لە فیکری خۆتدا.

تەنانەت دەڵێن: (ولذلك فلا يحق لأيّ تفسيرٍ ان يغلق القرآن. لأن النصوص تنتج دائماً دلالات جديدة مفتوحة مطردة)[٩٧]

---

[٩٧] النص القرآني، طيب تيزيني، لا: ٥٤

(والركون الى التفسير الحرفي موت للنص)[98] (ولذلك يجب أن يكون التأويل بلاحدود)[99]. واتە: "لەبەرئەمەیە کەوا بە هیچ شێوەیەك مافی هیچ جۆرە ڕاڤەیەك نییە کە بازنەی تێگەیشتن و ڕاڤەی قورئان دابخات و بڵێت مانای تر هەڵناگرێت. چونکە دەقەکان بەردەوام مانای نوێ بەرهەم دێنن و کراوەن بەڕووی مانا جیاوازەکانی تردا، وە تەنها پابەندبوون بە مانایەکی دیاریکراوی دەقەکەوە بریتییە لە کوشتنی دەقەکە. کەواتە لەبەرئەمە دەبێت تەئویلکردن بێسنوور بێت". ئەمە ئەوە دەگەیەنێت مادام دەقێك جۆرەها مانا هەڵبگرێت، کەواتە تەئویل چارەسەرە و ئەمڕۆ بەچی ئاسوودەیت وا مانای بکە و دوو بەیانی ئاستی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و زانستی و تەمەن و هەموو بوارەکانی تۆ دەگۆڕێت، ئەوا ئەو کاتە دەکرێت مانایەکی تری بکەیت. واتە ئەم دەقە لە خودای تۆوە بۆ تۆ هاتووە و چۆنت پێ خۆشە، بەو شێوەیە لێی تێبگە و ئیتر ئەمە دەقێك

---

[98] قراءة النص، حسن حنفي، لا: ١٧

[99] سلطة النص، عبدالهادي عبدالرحمن، لا: ٢٠٢ – ٢٠٣

نییە کە باوەڕ و بڕیارەکانی دیاریکرابێت، بەڵکو دەکرێت بۆ هەر کەسێك مانایەکی جیاواز هەڵبکرێت. وە یەکێکی تریان دەڵێت: (نحن لانثق بالنصوص كلَّ الثقة، ليس لأنها تتصف بالضعف والركاكة، بل بالعكس بسبب من قوّتها بالذات)[100]. واتە: "ئێمە بەتەواوی متمانەمان بەهیچ دەقێك نییە، لەبەرئەوە نییە کە ئەم دەقــە لاوازە و ماناکــەی لــە ئاســتێکی نزمدایــە، بــەڵکو بــە پێچــەوانەوە لەبەرئــەوەی زۆر بــەهێزە لــە خــودی خۆیــدا " سەرنجبدە لە بەشی دووەمی قسەکەی کە چۆن وا دەکات تۆ تورە نەبیت و وەك بڵێی پێت بڵێت ئاگات لەخۆت بێت قسەی هەڵە مەکە و تەکفیرمان مەکە. من مەبەستم ئەوە نییە و مەبەستم ئەمەیە کە ئێستا دەیڵێم. ئاوا خۆی دەدزێتەوە لە باوەڕدارێتی و پابەندبوون بە قورئانەوە. لەناو کۆڕ و سیمینار و مێزگرد و دیبەیتەکاندا کە لەم وڵاتەدا دەکرێن، زۆرێك ئەم قسانە دەکەن و خۆیان بە ڕۆشنبیر و ڕووناکبیر دەزانن و ئا بەم شێوەیە قسە

[100] نقد النص، علي حرب، لا: ٢٧٦

دەکەن. دەڵێن: "قورئان لەوە گەورەترە کە یەك مانای هەبێت" یان "قورئان لەوە پیرۆزترە کە بەس تۆ مانای بکەیت" یان "قورئان لەوە گەورەترە کە بی جوغزێنی لە بازنەی زمانی عەرەبیدا و دەکرێت مانای تر هەڵبکرێت". ئاوا خۆی دەدزێتەوەو تۆیش وا دەزانیت سووکایەتی و بێ ڕێزی بە خوا و پێغەمبەر و قورئان نەکردووە، بەڵام بڕوا بکەن ئەوە ئەو پەڕی سووکایەتی و بێ ڕێزییە بە خودا و بە قورئان کە پێی وابێت خودایەك کە دروستکەر و بەدیهێنەری بوونەوەر و ژیان و ئادەمیزادە و خودایەکی زانا و دانا و بەتوانا و خاوەن خواست و ویستە و مرۆڤ تاقی دەکاتەوە، کەچی پەیامێکی بۆ ناردووە کە پەیامێکی ناڕوون و ئاڵۆز و بێمانایە. بزانن کە ئەمە ئەو پەڕی سووکایەتییە بە خودا کە پێت وابێت ئەو خودایە نەیتوانیوە پەیامی خۆی بە ڕوونی و ڕۆشنی بگەیەنێت بە ئێمە و پێغەمبەریش(ﷺ) نەیتوانیوە بە ڕوونی و ڕۆشنی بیگەیەنێت بە ئێمە، وە لوتکەی سووکایەتییە کە پێت وابێت قورئان ڕوون نییەو ماناکانی لێڵن لەکاتێکدا زیاتر لە شەست سیفەت هەن لە

خودی قورئاندا کە داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەن ئەم قورئانە پەیامێکی ڕوون و ڕۆشن و ئاشکرایە. لای ئەو قورئان کۆکەرەوەی دژە زاراوە و مانا ناکۆکەکانە و ڕوون نییە و مەفهومەکانی هەموو گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. تۆ سەرنجبدە بزانە چۆن دێت سووکایەتی و بێ ڕێزی بە خوا و پێغەمبەر و قورئان دەکات. ڕاستەوخۆ نایەت وەکو (نیتچە) و (ستیڤن هاوکینگ) و (ڕیچارد داوکینز) و ئەوانە نالێت "من باوەڕم بە خودا نییە و باوەڕم بەوە نییە کە خودایەك هەبێت و پەیامبەرێکی هەبێت ناوی موحەممەد بێت و قورئانیش پەیامی ئەو بێت". وەکو ئەوان ڕاستگۆ و ڕاشکاو نین لەگەڵ باوەڕەکانی خۆیاندا، بەڵکو لە ڕێگەیەکی ترەوە هاتوون و دەیانەوێت بڵێن: "ئەو قورئانە مانای نییە و مانا ناگەیەنێت، نەك لەبەرئەوەی شتێکی پووچە، بەڵکو لەبەرئەوەی زۆر بەهێزە و تۆ ناتوانیت مانای بکەیت و لەوە مەزنترە بتوانرێت لە چوارچێوەی زمانی کۆمەڵگەیەکدا قەتیسی بکەیت". ئەمەش بۆ ئەوەیە کە خۆی بدزێتەوە لە باوەڕبوون و پابەندبوون، وە واش بکات لە تۆ کە

هەم باوەڕت نەبێت و هەم پابەند نەبیت، وە واش بکات کە ئەو حاڵەتە گشتگیرییە نەمێت و ئەو کاتە هەرکەسە و بۆ خۆی و خودای خۆی و تێگەیشتنی خۆی بۆ ئەو دەقەی کە لەلایەن خوداوە بۆی هاتووە. ئیتر ئەو کاتە حەقیقەتی سیکۆلاریزم بەو شێوەیە دێتەدی کە ئیتر ئایین پەیوەندی بە ڕەوتی کۆمەڵگا و دەسەلات و کایە زانستییەکانەوە نامێنێت، چونکە جۆرەها مانا و شتی دژبەیەك هەڵدەگرێت. تەنانەت لە بازنەی زانستیشدا نامێنێت، چونکە زانست ئەزموون و داتا و ڕاپرسی و لێکۆڵینەوەیە و یاسا و بنەڕەت و بەڵگەی هەیە و ئەمیش هیچی لەوانەی نییە و دەکرێت هەر کەسێك بۆ خۆی مانایەکی لێوە وەربگرێت و دەبێتە شتێکی تاکە کەسی و دەکرێت باوەڕت هەبێت و دەکرێت نەتبێت، دەکرێت پابەند ببیت و دەکرێت پابەند نەبیت و ئیتر هیچ پەیوەندییەکی بە کۆمەڵگا و دەوڵەتەوە نامێنێت.

حەوتەم: (الفراغات أو مابین السطور)، واتە: (لەناو دەق دا نەوتراوەکان زۆرترن و دەکرێت جیاوازبن).

دەڵێن ئەو دەقەی کە هەیە، ماناگەلێك هەڵدەگرێت کە ئەو دەقە بە هیچ شێوەیەك ئاماژەی بۆ نەکردووە. وەك ئەوەی تۆ شتێك بخوێنیتەوە کە لە نێوان دوو کەوانەدا ڕستەیەك نووسرابێت و پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە دێڕەکەوە نەبێت، بەڵام بە پێویست زانرابێت بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر. ئەمانیش دەڵێن: "قورئانیش وەکو دەقێك دەکرێت ئەو مانایانەی کە ڕاستەوخۆ دەقەکە ڕاشکاوانە نایگەیەنێت زۆر زیاتر و بەجێتر و پێویستترین لەوەی کە ڕاستەوخۆ لە دەقەکەدا هاتووە". واتە شتە ناڕاستەوخۆ و نەوتراوەکان زۆر پێویستترن لە وتراوەکان! ناڕاستەوخۆکان گونجاوترن لە ڕاستەوخۆکان! دەکرێت خوێنەر شتانێك بخوێنێتەوە لە مانای ئەو دەقەوە کە لە خودی دەقەکەدا هەر باسوخواسی نەبێت!

لەڕاستیدا بنەڕەتی ئەم جۆرە خوێندنەوانە لە کلتووری ڕابردووی ئوممەتی ئیسلامیدا هەیە. ئەوەی کە ئەهلی فەلسەفەو تەصەوف کاتێك خوێندنەوەیان بۆ دەقێکی ئایینی کردووە، چ ئایەتێك بێت یان فەرموودەیەك بێت، شتانێکی لێوە

هەڵدەهێنجێنن و دەردەهێنن کە بە هیچ شێوەیەك ڕاستەوخۆ بەلای دەقەکەدا ناڕوات، ئەوە ئەو (باتینیگەرایی(الباطنية))ـەیە کە دروستبووە و دواتر سەریکێشاوە بۆ بیرۆکەی (وحدة الوجود) و (حلول) و (اتحاد) و (کشف الروحي) و (تجليات الإلهي)، کە هیچ شتێکیان بوونی نییە لە ڕووانگەی قورئانی پیرۆزەوە. مانایەك هەڵدەگرن کە وەك ئەوە وایە کە لە بارەی شیعرەوە دەوترێت: "المعنى في قلب الشاعر" واتە بەڵێ مانای ئەم شیعرە وایە، بەڵام مانا ڕاستەقینەکەی لەلای خودی شاعیرەکەیە. ئەمانیش بە شێوەیەك مانای دەقەکە دەکەن کە مانایەکی باتینی لێ دەگرن. هەر ئەوەشە کە زەمینەی ئەوەی سازکردووە کە زۆرێك لەو فیرەق و تائیفە و مەزاهیبانەی کە لایانداوە لە ڕێگای گشتی موسڵمانان، لە دەرگای ئەم تەئویلاتانەوە بچنە ژوورەوە. جاری واهەیە بە شانازییەوە تەفسیری گەورە نووسراوە وەك تەفسیری ئیشارییە و تەفسیری باتینییە و زۆرجاریش ناوی تەفسیرەکە نراوە کە ئەم تەفسیرە تەئویلە. جیاوزای تەفسیر لەگەڵ تەئویل ئەوەیە کە (تفسیر) واتە

ڕوونکردنەوەی ماناکە، بەڵام (تأويل) واتە لادانی ماناکە لە مانا ڕاستەوخۆکەی بۆ کۆمەڵێك مانای ناڕاستەوخۆ کە بە زیهنی هەموو خوێنەرێکدا نایەت. لەبەرئەوە ئەو مەزاهیبە باتینییانەی کە دوایی زۆربەشیان لە بازنەی گشتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە دەرچوو و لادەر ئەژمارکراون، لە دەروازەی ئەم تەئویلە باتینییەوە چوونەتە ژوورەوە. کە پێیان وایە ئەو دەقە دەکرێت کۆمەڵە مانایەك هەڵبگرێت کە بە هیچ شێوەیەك بەلای ئەو مانایانەدا نەڕوات کە خەڵکێکی شارەزا لەو زمانە و خەڵکێك لە ژینگەیەکی سادە و ساکاردا لەو زمانە تێبگات.

تەنانەت یەکێك لەم سیکۆلارانە دەڵێت: (يجب أن نبحث في النص عمّا لم يقله المؤلف فنجد فيه عكس ما يصرح به)[١٠١]. واتە: "پێویستە ئێمە لەناو دەقەکەدا بگەڕێین بۆ شتێك کە نووسەرەکەی-بێژەرەکەی- نەیوتووە، وە پێچەوانەی ئەوەش بدۆزینەوە کە نووسەرەکەی-بێژەرەکەی- مەبەستییەتی". بۆ

---

[١٠١] نقد النص، علي حرب، لا: ١٥

نمونە واتە دەیەوێت بڵێت کە ئەگەر قورئان بەڵگە بێت لەسەر بوونی خودا، ئەوا دەکرێت بە جۆرێك خوێندنەوەی بۆ بکەین کە بەڵگە بێت لەسەر نەبوونی خودا. یان ئەگەر قورئان بەڵگە بێت لەسەر ڕوونی و ڕۆشنی خۆی، ئەوا دەکرێت جۆرێك بخوێنرێتەوە کە بەڵگەبێت لەسەر ناڕوونی و لێڵی خۆی. واتە دەکرێت دەروون نەخۆشانە لە بەرامبەر قورئانەوە مامەڵە بکەین.

زۆرێك لەم کەسانە پاسا و بۆ قسەکانیان بە ئایەتی حەوتی سورەتی (آل عمران) دەهێننەوە و دەڵێن: "ئێمە ڕێگەمان پێدراوە کە تەئویل بکەین و ئەوە نییە خودا خۆی دەفەرموێت:﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ .." دەڵێن: "ئەوەتا قورئان موحکەمی هەیە و موتەشابیهیشی هەیە. (محكم) واتە (واضح الدلالة)، وە (متشابه)یش واتە (غير واضح الدلالة) و ماناکە ڕۆشن و ڕوون نییە و هەموو کەسێکیش نایزانێت". دەی دوای ئەوە دەفەرموێت: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ﴾ واتە: "ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایە(بەو مانایەی کە باوەڕیان

پێی نییە، بەڵام بەشوێن بیانوویەکدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی خۆیان قوتار بکەن لە پەیامی خودا) شوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون کە موتەشابیهن". بۆچی؟ لەبەر دوو هۆکار، یەکەمیان ﴿ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ ﴾ واتە: "دەیانەوێت خەڵکی پێ تووشی فیتنەی دڵەڕاوکێ و گومان بکەن". مەگەر لە هەندێك مەجلیسدا نەتبینیوە کە جاری وا هەیە کەسێك قسەکانی وا دەردەکەوێت کە بەرگری دەکات لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بەڵام ڕێك لە قووڵایی ئیسلام دەدات بۆ ئەوەی گومان دروست بکات. بۆ نمونە لە مەجلیسی پرسەی کوژراوێك دانیشتووە دەڵێت: "بابە خەتای فلانەکەس نەبوو کە کوشتی، بەڵکو هەر خوا نووسیبووی" بۆ ئەوەی ئەو پرسیارە بۆ کەسێك دروست بکات کە "چۆن دەبێت خودا شتی وا بنووسێت؟!". لەوانەیە وا هەست بکەیت ئەم قسە سەرزارەکییانە بەرگرییە لە مەزنی و گەورەیی خودا، بەڵام ئەوە جۆرێکە لە توانج. دووەمیان ﴿ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ﴾ واتە: "دەیانەوێت تەئویلی بکەن". دەی لە دواتریدا خودا دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾. واتە: "هیچ کەسێك تەئویلی ئەم موتەشابیهانە نازانێت جگە لە

خودا"، وە ئــەوانەیشی کــە لـە زانستدا قوڵبوونــەتەوە دەڵـێن: ﴿ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ ۝ ﴾.

لـە ڕاستیدا ئـەوان بـەو جـۆرە مانـای (تـەئویل) دەکـەن کـە پێشتر باسمکرد، بـەڵام زۆر بـە کـورتی ئاماژەی پێبکـەم ئەوەیـە کـە لـە ڕووانگەی قورئانی پیرۆزەوە مەبەست لە (مُحكَم) هەموو قورئانـە، بـەڵام (مُتَشـابِه) ئـەو ئایەتانەیـە کـە پەیوەسـتە بـە (بەهەشـت) و (دۆزەخ)ـەوە. بۆچی؟ چونکە سـەبارەت بـە (بەهەشـت) و (دۆزەخ) تۆ ئەوەندە تێدەگەیت کە خودای گەورە دەفەرموویێت (بەهەشت) شـــوێنێکی خـــۆش و باشـــە و بـــۆ پاداشـــتە، وە (دۆزەخ)یـــش شوێنێکی ناخۆشە و بۆ سزایە. بـەڵام تۆ حەقیقـەتی ئـەم کەلامـە دەرك ناکەیت هەتا نەچیتە ئەویّ، چونکە (تأويل) واتـە "ما يَؤول إليـه الكـلام في الحقيقـة"واتـە: "ئـەوە کـە دواجـار کەلامەکـە لـە حەقیقەتدا پێی دەگات" بەو مانایەی کە دواجار مانـای شتەکە بێتەدی. بۆ نمونە من دەڵێم: "ئاو دەخۆم"، ئەم کەلامـە لای ئێوە مەفهومە، ئەی تەئویل و تەتبیقی ئەم کەلامە کامەیە؟ ئـەو کاتەیـە کە من ئاوەکەم خوارد بە بەرچاوتەوە. کەواتە لەلای تـۆ مـەفهومی

"ئـاو دەخـۆم" ڕوونـە و دەزانیـت ئـاو چییە و دەشـزانیت ئـەو کـارەی کـە مـن دەیکـەم چییە، بـەڵام حەقیقـەت و تـەئویلی ئـەم کەلامە(تـەئویل بـەو مانایـەی ئـەوان نـا، بـەڵکو لـە ڕووانگـەی قورئانی پیرۆزەوە) کاتێکە کە ئاوەکە بخورێتەوە. دەی خـەڵکی موشریك لە کۆمەڵگای پێغەمبەر(ﷺ)دا ئەوەی کە زۆر بەلایانەوە نامـەنتیقی و نامـەعقول بـووە، بـریتی بـووە لـە بابەتـەکانی (بەهەشت) و (دۆزەخ) و (زیندووبوونەوە). ویستوویانە گومـان و دوودڵـی بـۆ خـەڵکی دروست بکـەن و بڵـێن: "ئێمـە کـە ئێسـك و پروسـکمان ڕزی و بووینـەوە بـە خـاك، ئـیتر چـۆن زینـدوو دەبینەوە؟!". خۆ مانای ئەوەی کە "تۆ خودا دروستی کردوویت و ئێسـتا زینـدوویت و دوایـی دەمریـت، پاشـان زینـدوو دەکرێیتـەوە و لەسـەر کـردەوە و باوەڕەکانـت یـان پاداشـت دەکرێیـت یـان سـزا دەدرێیـت" مـەعلوم و ڕۆشـن و ڕوون بـووە لەلای موشریکەکان، بەڵام لەو ڕووەوە موتەشابیهە کە ئەو خەڵکە لێیـان تێکدەچـێت و تەعـەقول و تەصـەوری ناکـەن کـە حەقیقەتەکەیان دەرك نەکردووە. دەی تـەئویل و حەقیقـەتی ئـەم

کەلامە کاتێك تەتبیق دەبێت کە بچیتە قیامەت. ئەی ئەوانە بۆچی ئەم گومانانە دروست دەکەن؟! یان دەیانەوێت خەڵکی تووشی گومان و دڵەڕاوکێ بکەن و بڵێن هیچ قیامەتێك لە ئارادا نییە و مرۆڤ چۆن کە بوو بە خاك زیندوو دەبێتەوە؟ یان تەئویلەکەیان دەوێت و دەڵێن: "ئەی خودایە ئەگەر ڕاستە تۆ خودایت و توانات هەیە، دەی پیشانمان بدە" پەلەیانە بۆ دەرکەوتنی سزای خودا. یان دەیانوت بە پێغەمبەر(ﷺ) بڵێن:"ئەگەر ڕاست دەکەیت تۆ پێغەمبەریت، دەی بڵێ بە خوداکەت با سزامان بدات" هەروەك چۆن بە (عیسا)یان وت: "ئەگەر ڕاستە تۆ پێغەمبەریت، دەی بڵێ با سفرەیەکمان بۆ بێتە خوارەوە لە ئاسمانەوە". واتە گرفتی موشریکەکان لەسەر پاداشت و سزاکەیە و دەرکی حەقیقەتی پاداشت و سزاکە ناکەن. دەی نابێت لێرە دەرکی پاداشت و سزاکە بکەیت، چونکە تاقیکردنەوەکە لەسەر ئەوە بونیادنراوە. حەقیقەتی تەئویلی ئەم کەلامە لە دوای مەرگدایە و دوایش لەو کاتەدا فریای ئەوە ناکەویت بچیت بڵێیت: "خودایە داوای لێبوردن دەکەم و

بمگێڕەوە بۆ دنیا با کردەوەی باش ئەنجام بدەم"، تازە هیچ سوودێکی نییە. تەئویلەکە ئائەوەیە، چونکە مانای ئایەتەکان ڕوون و ڕۆشنە، بەڵام حەقیقەتی تەتبیقی ئەو ئایەتانەی کە سەبارەت بە (بەهەشت) و (دۆزەخ)ـە لە کوێیە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە لە قیامەتدایە.

هەشتەم: (التأويل انتاج للنص)، واتە: (تەئویلکردن دەق بەرهەمدار دەکات)

پێیان وایە کە تەئویلی دەق(بەو مانایە نا کە من لە ڕووانگەی قورئانی پیرۆزەوە کردم، بەڵکو بە ماناکەی خۆیان) بریتییە لە "صرف اللفظ من المعنى الراجح الى المعنى المرجوح". واتە: "ئەوەیە کە وشەیەك لە مانا ڕاستەوخۆکەی لابدەیت و بیبەیت بۆ مانایەك ناڕاستەوخۆ کە گریمانەی ئەوەی هەبێت". پێیان وایە کە ئەم جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ دەقدا مامەڵەیەکی بەرهەمدارە. چونکە پێیانوایە کە جۆرەها مانای تر دێتە ئاراوە و جۆرەها کتێبی تر دەنووسرێت. کەچی بە بۆچوونی ئەو ئەگەر یەك مانای بکەیت، ئەوە شتێکی نەزۆکە و کورت و دیاریکراوە و ئیتر

بەرهەمێکی نوێی نییە. لەلای ئەو کاتێك دەقێك بەرهەمی هەیە کە هەر ڕۆژەی مانایەك هەڵبگرێت، بەڵام بیر لەوە ناکاتەوە کە سەرگەردانی و سەرلێشێواوی و دڵەڕاوکێ و گومان و دوودڵی بۆ سەدان و هەزارەها دروست دەبێت. بەوەی کە نازانێت ئەو خودایە چۆن بناسێت و باوەڕی پێ بکات؟! وە پابەندبێت بە چییەوە و بە چییەوە پابەند نەبێت؟! پێیان وایە ئەگەر یەك مانای دیاریکراوی هەبێت، ئیتر ئەوە سنووردار و دیاریکراو و نەزۆکە و بەرهەمدار نییە. پێی وایە کە یەك شێوە ڕاڤەکردن بۆ قورئان بریتییە لە فێڵکردن لە قورئان و تۆ ناهێڵیت مانای تر بگەیەنێت و بێ بەرهەم و نەزۆکی دەکەیت. ئەو پێت ناڵێت کە قورئان بەکەڵك نایەت، بەڵکو دەڵێت مانای تر هەڵدەگرێت. ئەگەر تۆ بڵێیت ئەو مانایەی هەیە، هەرچەند بە بەڵگەشەوە قسە بکەیت، ئەوا ڕەخنەت لێ دەگرێت بەوەی کە دەڵێت تۆ قورئانت نەزۆك و سنووردار کردووە و سووکایەتی بە قورئان دەکەیت کە یەك مانای بۆ دەکەیت، چونکە دەکرێت مانای تری هەبێت بۆ ئەوەی بەرهەمدار بێت.

لەبەرئەوە، ئەمە سەرێکێشاوە بۆ ئەوەی کە بە خراپ کەڵك لەو بابەتە وەربگرن کە بڵێن قورئان قیرائاتی جیاوازی هەیە. لەوێوە ئەو قسەیەیان هێناوە دەڵێن: "ئەوە نییە لەناو ڕیوایاتدا هەیە کە قورئان بە چەند شێوەیەك دەخوێنرێتەوە"، بەڵام دڵنیاتان دەکەم کە قورئانی پیرۆز بە لەهجەی (قورەیش) هاتووە، وە ئەمەی کە لەبەردەستماندایە شێوەزاری قورەیشە، وە ئێمە بەمەیش موکەللەفین.

بۆ دڵنیایی، لەم بوارەدا خودای گەورە دەفەرموویێت:﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ۝ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ۝ ﴾ یوسف.

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝ ﴾ إبراهيم.

﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝ ﴾ الحجر.

یەکێك لەو بانگەشەکارانەی سیکۆلاریزم دەڵێت: (فلا سبيل الى إيجاد قراءة موضوعية لأي نصٍ، ويتظل القراءة تجربة شخصية، ويظل انتاج الدلالة فعلاً مشتركاً بين القارئ والنص، ويظل النص متجدداً بتعدد القراء من جهة، وبإختلاف الظروف من جهة

اخـرى)[١٠٢]. واتـە: "هـیچ ڕێگایـەك نییـە بـۆ خوێندنەوەیـەكی بابەتییانە بۆ هیچ دەقێك، وە بەردەوام خوێندنـەوە ئەزموونێكی كەسێتییە، وە بەردەوام بەرهەمهێنانی ماناكان كارێكی هاوبەشی نێوان خوێنەر و دەقە، وە هەروەها بەردەوام دەق نویێ دەبێتەوە بەپێی ژمارەی خوێنەرەكانی لە لایەكەوە و، جیاوازی بارودۆخ و ژینگەكان لە لایەكی ترەوە"

نۆیـەم: (الرمزیـة في القـراۃء)، واتـە: (هێماگـەرایی لـە خوێندنەوەدا)

ئەمە گرفتێكی گەورەیە تەنانەت لەلای بەناو ڕۆشنبیران و نوێخوازەكانی ئوممەتی ئیسلامیش كە لێرەدا نامەوێت ناوی كەسیان ببەم. واتە بە شێوەیەكی هێمایی و ئاماژانە تێبگەیت لە دەقەكان و وابزانیت كە هیچ شتێك مانای ڕاستەقینەی خۆی ناگەیەنێت و بریتییە لە هێماكاریی. بەمەش دەكرێت ئەو ڕەمزە تۆ جۆرێك لێی تێبگەیت و منیش بە جۆرێكی تر تێی بگەم.

---

[١٠٢] مفهوم النص، نصر حامد ابو زید، لا: ٢٠٠ – ٢٠١

لەبەرئەوە یەکێکیان دەڵێت: (الإنسان يحيا بالرمز وفي الرمز وللرمز)[١٠٣]. واتە: "مرۆڤ بەهۆی هێماوە دەژی، وە لەناو هێمادا دەژی، وە بۆ هێما دەژی". ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە بەلای ئەمانەوە هیچ شتێکی مرۆڤ، نە خۆی و نە کارەکانی مانای کۆنکرێتی و سنووردار و ڕاستەوخۆی نییە، بەڵکو دەکرێت مانای جیاواز هەڵبگرێت.

لەبەرئەوە پێیان وایە کە گوتاری قورئانی گوتارێکە پێکهاتووە لە کۆمەڵێك خوازە و وێکچواندن و هێما و ئامارەکاری کە مانای حەقیقی خۆیان نادەن بەدەستەوە. بۆیە دەبینیت کە (عرش) و (كرسي) و (جنّة) و (جحيم) و (روح) و (ملائكة) و (جنّ) و (شياطين) و هەموو ئەم شتانە تەئویل دەکەن و دەڵێن ئەمانە هیچیان لەسەر مانای حەقیقی خۆیان نین و هەموویان ئامارە و هێمان بۆ ئەوەی کە تۆ لە دەقەکە تێبگەیت. بۆ نمونە دەڵێت: "عەرشی خودا لەوەوە هاتووە کە مادەم لە کۆمەڵگای

[١٠٣] التأويل والحقيقة، علي حرب، لا: ١٩

مرۆڤایەتیدا دەژیت و پاشات بینیوە کە شوێنی دەسەلآت و تەختی پاشایەتی هەیە، بۆ ئەوەی تۆیش لە بابەتی خودا تێبگەیت بۆیە عەرشی بۆ بڕیاردراوە ئەگەرنا عەرشێك لە ئارادا نییە" یان "پاشا لەناو دەسەلآتەکەیدا ئەگەر کەسێك پابەندبێت بە بۆچوونەکانییەوە، پاداشتی دەکات و کەسێکیش گوێڕایەڵ نەبێت، سزای دەدات. کەواتە دەقە قورئانییەکەش هەر بەو جۆرە هاتووە کە باسی پاداشت و سزایەکی بەرجەستە دەکات، ئەوە بۆ ئەوەیە کە تۆ لێی تێبگەیت، ئەگەرنا نە خواردن و خۆراك لە بەهشتدا هەیە و نە ئاگر و سزایش لە دۆزەخدا هەیە" ئیتر لەلای ئەمانە هەمووی دەبێت بە ڕەمز و بە مەجاز و تەشبیه و ئیستیعارە و هیچکامیان مانای حەقیقی خۆی نادات. هەروەك چۆن مامەڵەیان لەگەڵ (تەورات) و (ئینجیل)دا کردووە، هەر بەو شێوەیەش مامەڵە لەگەڵ قورئاندا دەکەن و دەڵێن: (لو لم نتّخذ هذا الموقف التعدّدي منهجياً لكنّا طمسنا احدى خصائص القرآن الأساسية الا وهي قابليته لأن يعني أي لأن يعطي معنى

باستمرار ویولد هذا المعنی)[104]. واتە: "ئەگەر ئێمە بەم شێوەیە مامەڵە نەكەین لەگەڵ قورئاندا، ئەوا زیانمان گەیاندووە بەم دەقە و قەتیسمان كردووە لە مانایەكی دیاریكراودا و بچوكمان كردووەتەوە، وە وامان لێكردووە كە بەرهەمدار نەبێت و مانای نوێ نەگەیەنێت". پێیان وایە دەبێت تۆ وا مامەڵە لەگەڵ قورئاندا بكەیت كە هەر ڕۆژەو مانایەك بگەیەنێت و بەپێی بارودۆخ و هەلومەرجە جیاوازەكان لە كۆمەڵگا و كەسەكاندا بتوانیت سوودی لێ وەربگریت. واتە نەك حەوت دەرمانە بكرێت بە حەوسەد دەرمانە و بۆ هەر كۆمەڵگایەك بە جۆرێك شتێكی لێ دروست بكەن و تەشبیهات نەبێت وەكو قوری سەناعە چ نمونەیەكیان بەلاوە جوان بێت ئەوەی لێ دروست بكەن و خۆی لە حەقیقەتا مانایەكی دیاریكراوی نەبێت.

دەیەم: خوێنەری سیكۆلار پێی وایە: (دەقی قورئان لە دەقە پیرۆزەكان و كەلتوور و ئەفسانەی نەتەوەكانی پێش ئیسلام وەرگیراوە)

---

[104] الفكر الإسلامي قراءة علمية، محمد اركون، لا: ٢٧٤

كە هەندێكجار لە نووسەرانی كوردستانیشدا ئەمە دەبینرێت، ئەویش ئەوەیە كە پێیان وایە ئەو شتانەی لە قورئاندا هەیە هی قورئان خۆی نییە، بەڵكو زۆربەی وەرگیراوە چ لە بیروباوەڕدا و چ لە ئەحكامەكاندا و وەریگرتووە لە تەورات و لە ئینجیل و لە زەبوور و لە ئاوێستا و لە كتێبی ئەم و ئەو و موقەددەساتی گەلانی پێشوو. پێیان وایە كە موحەممەد(ﷺ) بە زیرەكی و بلیمەتی خۆی توانیویەتی سوودوەربگرێت لە كتێبی پیرۆزی ئایین و كۆمەڵگە جیاوازەكان و ئەم قورئانە دروست بكات و بۆ نمونە هەندێكی لە تەورات وەرگرتووە و هەندێكی تری لە ئینجیل و زەبوور و ئاوێستا و هتد وەرگرتووە. بە بەڵگەی ئەوەی كە لەلای ئەوانیش یاسا و دەستووراتی هاوشێوەی ئەوەی ئیسلام هەیە و باسی نوێژ و ڕۆژوو و حەج و چی و چی هەیە. ئیتر عەقڵی بۆ ئەوە ناچێت یان عەقڵی بۆی دەڕوات و –لەگەڵ ڕێزمدا– خۆی لێ گێل دەكات كە ئێمە مادەم باوەڕمان وابێت خودایەك بوونەوەر و ژیان و ئادەمیزادی دروستكردووە، وە هەرچیشی لەسەر ئەم زەوییەدا داناوە سنووردار و كاتییە،

وە مرۆڤیشی کە لەسەر زەویدا داناوە تاقی دەکاتەوە، وە مرۆڤیش لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکانەوە هەتا ئێستە بەردەوام بووە و بۆ هەر کۆمەڵگایەك پێغەمبەرێکی ناردووە، دەی مادام یەك سەرچاوە هەیە کە خودایە و یەك سەر زەویش هەیە، کەواتە دەکرێت پەیاممان چ لە بیروباوەڕدا و چ لە خواپەرستی و خوڕەوشت و ئەحکامدا هاوبەش بێت، چونکە لە یەك سەرچاوەوە هەڵقوڵاوە. خودای گەورە خۆی لە قورئاندا لە سورەتی (البقرة: ١٨٣)دا دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ ﴾. باشە بۆچی من پێم وابێت کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژووی لە عیسا و ئینجیلی وەرگرتووە؟! ئەی بۆ پێم وانەبێت کە لە خودای عیسای وەرگرتووە؟! مادەم ئێمە پێمان وابێت کە یەك خودا هەبێت دروستکەری هەموو بوونەوەر و ژیان و ئادەمیزاد بێت و مرۆڤیش لە یەك خێزانەوە سەرچاوەی گرتبێت و بڕیاریش وابێت کە خاڵی هاوبەشمان زۆربێت، دەی کەواتە ئەو خودایە پەیامێکمان بۆ دەنێرێت کە خاڵی هاوبەشمان زۆربێت. جا ئەوە

لــە ڕووی بیروبــاوەڕ و خواپەرسـتی و خوڕەوشـتەوە هــەموومان وەکــو یــەکین. لــە ڕووی شەریعەتیشــەوە بــەپێی بــارودۆخ و هەلومەرجـە ڕامیـاری و ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و ڕۆشـنبیری و شارســتانییەکان وا دەخوازێــت کــە هەنــدێکجار شــەریعەت و ئەحکامەکـە بگۆڕێـت. هــەروەك خــودا خــۆی دەفــەرمووێت لــە سورەتی (المائدة: ٥)دا: ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴾.

دەکرێـت بـۆ هــەموو گـەل و هـۆز و نەتـەوە و کۆمەڵگەیـەك لەوانەی پێشوو شەریعەت و مەنهەجێکی تایبـەتی دانابێـت. نـەك لەبەرئـەوەی دژی یـەکن، بـەڵکو لەبەرئـەوەی لـەو هەلومەرجـەدا وا دەخوازێت و هەلومەرجەکەی تریش ئەوی تریان دەخوازێت. لـەو قۆناغەیانــدا خــودا بــە جۆرێــك مــرۆڤ تــاقی دەکاتــەوە و لــە قۆناغەکەی تریاندا بە جۆرێکی تـر تـاقی دەکاتـەوە. ئەمـە نابێتـە بەڵگـەی ئـەوەی کـە تـۆ پێـت وابێـت لەبەرئـەوەی فـلان شـت لـە ئاوێسـتادا هەیـە و ئاوێسـتاش پـێش ئیسـلام هـاتووە، کەواتـە ئیسلام لەوی وەرگرتووە.

یان لەبەرئەوەی لە ئینجیل و تەوراتدا هەیە و ئەوانیش لە پێش ئیسلامدا هاتوون، کەواتە ئیسلام لەوانی وەرگرتووە. جا ئەمە چ عەیبێکی هەیە؟! مادەم ئێمە پێمان وابێت یەك خودا هەیە و یەك بوونەوەر و سەر زەوی و یەك کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەیە، کەواتە دەکرێت لەوانەی گەلانی پێشوو بچێت.

پێیان وایە لەبەرئەوەی ئەو دەقانە لەیەکتری دەچن، کەواتە لە یەکترییەوە وەرگیراون. ئەمەش بۆ ئەوەیە کە گومان بۆ تە دروست ببێتە کە وابزانیت پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر بە منداڵی جارێك یان دوو جار بۆ سەفەری بازرگانی چووبێت بۆ (شام)، ئەوە لەوێ لە ڕاهیبێکی مەسیحییەوە هەموو ئەم شتانە فێربووە! بەڵام تا تەمەنی چل ساڵی ئارام بگرێت و زەمینەسازی بۆ بکات و دواتر لەپڕ بڵێت: "من پێغەمبەری خودام"!!!

ان شاء الله لە دەرفەتێکدا لەسەر ئەوە دەدوێم کە بە چ بەڵگەگەلێك بیسەلمێنین قورئان پەیامی خودایە و پێغەمبەر(ﷺ)یش پێغەمبەری خودایە. ئەگەر قورئان پەیامی خودا نەبووایە ئەوا

ئەو هەڵە و کەم و کوڕییانەی کە لە قورئاندا لە پێغەمبەر(ﷺ) گیراوە، دانەیەکیان باس نەدەکرا، چونکە ئەگەر هی خودی خۆی بووایە ئەوا پێی خۆشبوو کە تێیدا نەبێت.[١٠٥]

[١٠٥] سوود لە کتێبی (العلمانیون والقرآن الکریم، د. احمد إدریس الطعان) وەرگیراوە لە وەرگرتنی وتەکانی بانگەشەکارانی سیکۆلاریزم سەبارەت بە خوێندنەوەیان بۆ دەقی قورئانی پیرۆز.

پێش ئەوەی بچمە ناو بابەتەکەوە دەمەوێت ئەوە بڵێم هەتا بۆ ڕەخساندنی دەرفەت و قسەکردن لەسەر دۆخە هەستیارەکانی پەیوەست بە کۆمەڵگەوە دیسان بۆشاییەکی تر دروست کراوە لەنێوان کۆمەڵگەو عەلمانیەتدا! بەوەی هەندێك کەس دەکەن بە پاڵەوان و پسپۆڕی بواری عەلمانیەت و لەبەرانبەردا زۆر دەنگی تر دەخنکێنرێت و کپ دەکرێتەوە، هەر لە ڕاگەیاندنەکانەوە بیگرە تا دەگاتە هۆڵ و جێگە جیاوازەکان.

بۆشایی ئەو دوو چەمکە لە کوێدایە؟ هۆکاری ئەو جیاکاریە بۆ؟ هاتنی ئەم بیرۆکانە بۆ؟ چ سودێکمان لەم بیرۆکانە وەرگرتووە؟ بۆ ئەم بیرۆکانە سەرکەوتوو نەبووە؟ بەردەوامی و شەڕکردن لەسەر ئەم بیرۆکانە بۆ؟

پێش هەموو شت دەبێت ئەوەمان لەبیر بێت دین پێداویستیەکی تاکەو بۆشاییەکە لە ناخی مرۆڤدا هەیەو هەر بە دین خۆی نەبێت پڕ نابێتەوە، زۆرجار دەبینین پەنا بۆ دینی دەستکردیش دەبرێت بۆ ئەم پڕکردنەوە.

وەك چۆن حەزو پێداویستی خواردن و خواردنەوەو جنس و ئەمانە لەناخی گشت تاکێکی تەندروستدا هەیە دینیش بەهەمان شێوەیە، وەك چۆن برسێتی توینێتی ناشکێنێت ئەواش لادان لە دین و مانەوە نایشکێنێت، ئەوە تەنها لە ڕووی پەرستشەوە، هەروەك چۆن کەسێك کە برسی بوو دەبێت ئیتر نان بخوات، وە بۆ ئەوەی جەستە تەندروست بێت دەبێت لەو خواردنانە بخوات کە سودی بۆ جەستە هەیە، بەڵام خۆ ئەگەر ئەو خواردنانەشی دەست نەکەوێت ئەوا هەر دەبێت هەر خواردنێك بێت بیخوات، گەرچی دواتر توشی نەخۆشیشی بکات و هەمان نەخۆشیشی بیکوژێت ئاواش لادان لە دین و نەبوونی دینێکی ڕاستی مرۆڤەکان لە ناخەوە دەکوژن و زۆرجار وا لە مرۆڤەکان دەکات خۆشی بە دەستی خۆی خۆی بکوژێت، عەلمانیەت کراوە بە بەدیلی دین لەم وڵاتەدا.

لە دونیای کۆن و نوێدا وە بە گەواهی مێژوو ئەو سەرکردانە سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە کە حسابیان بۆ بیروباوەڕی کۆمەڵگەکەی خۆیان کردبێت، گەرچی باوەڕەکەشیان ساختەو نا لۆژیکی بوو بێت، تەنها تاکە سەرکردەیەك نەبێت لە ناو

هەموویاندا جیاوازبووە ئەویش پێغەمبەر بووە محمد دروودی خوای لەسەر بێت، هۆکاری سەرکەوتنەکەی ئەویش بۆ ئەو هێزە بەهێزە ئاسمانیە بووە کە مەبەستی بووە ئەو پەیامە بگات بە گشت مرۆڤایەتی و ڕەحمەتەکەی کەس لێی بێ بەش نەبێت، بۆیە دەبینین تا ئێستە تاکە دینە دوای نەمانی سەرکردەکەی زۆرترین تەشەنەی بە دونیادا کردبێت.

غاندی و جیڤاراو زۆرێك لەو سەرکردانەی کە ناونیشانی کاریزمایی و پاڵەوانێتی بواری سیاسەت و سەرکەوتنیان پێ دەدرێت پشتیان لە باوەڕی کۆمەڵگەکەیان نەکرد، بە جیا لەو سەرکردە کارتۆنیانەی ئەمڕۆ کە بەردەوام چاویان لە ڕۆژئاوایەو بەبێ ئەوان خۆیان خاوەنی بڕیاری سیاسی نین، لە کاتێکدا زۆرینەی چاودێران و سیاسیەکان نەقدیان بۆ ئەم جۆرە پاشکۆیی و دەستەمۆییە هەیە.

ئەو وڵاتانەش کە وەك پاشکۆیەکی ڕۆژئاواو لەژێر ناوی تازەگەری و عەلمانیەت و زۆر ناوی بریقەدارو خەڵەتێنەردا دەرکەوتن بینیمان و دەبینین چۆن شۆڕش دوای شۆڕ بەرپا دەکرێت بەسەریاندا، هۆکاری ئەو شۆڕش و بەهارو ناوە

جیاوازانەش فەشەلی عەلمانیەتە لە شەرقداو ئەو پێڵاوەی کە بەزۆر ویستوویانە لەپێی میللەتی بکەن تەنگ بووەو بەپێی نەکردوون! هەروەك شاعیرێك دەڵێ:

پێی پەتی باشە تا پێڵاوی تەنگ

لانەی چۆڵ خۆشە تا لانەی وە جەنگ

بەڵام ئەو سەرکردە ساختانە ویستوویانە یان بە زۆر ئەو پێڵاوە لەپێی میللەتەکە بکەن یان دەبێت جەنگ هەڵبژێرن، هەربۆیە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەبەردەوامی شەڕو جەنگی لێ نەبڕاوە! دەستە چەورەکەش بە ئیسلامدا سڕاوە، کەسێکی وەك سەدام، قەزافی، موبارك کێ و کێ کە ڕوونە بەچ ئاراستەو چۆن ئاراستە کراوە کەچی دوای شکستیان بە نوێژێکی مونافیقانە یان سەفەرێکی سعودیەو لەبەرکردنی بەرگێکی خیانەت بەناوی عەمرەوە شکستەکان دەدەنە پاڵ ئیسلام!.

گەر لە مێژووی سەردەمی خەلافەتیشدا ناکۆکی و شەڕێك بوو بێت هەر لە چوارچێوەی ئەو چاکسازیانەدا بووە کە دینی

ڕاستی ئیسلام خۆی ئالیەتەکانی پێیەو قبوڵی نەکردووە بەناوی دینەوە قۆرخکاری و پاوانخوازی بکرێت، ئەوەی ئەمڕۆ وەك تانە لـە ئیسـلامی دەدەن و بـە دینێکـی ئـاژاوەگێڕی وێنـا دەکـەن، گریمـان دیـن هـەر بـە شمشـێریش سـەرکەوتبێت جا خـۆ هـیچ میللـەتێك وەك کورد پێویستی بە شمشێر نەبووە! دەبوو کورد ئـەو شمشـێرە مـاچ بکـات کـە ببێتـە مایـەی سەرخسـتنی و بەدەسـتهێنانی مافـەکانی، چـما میللـەتانی تـر سـودیان لـەو شمشـێرە بینـووەو کـورد سـودی لـێ نـەبینێت، ئێسـتە کـورد پێویسـتی بـە چـەك و تەقەمـەنی هـەر وڵاتێـك هەیە کـە یارمـەتی دەری بێـت و مافـەکانی بۆ بسـەنێتەوە، بۆ؟ تـەنها شمشـێرەکەی ئیسلام جێگەی قسە لەسەر کردنە! بۆ تـۆپ و تـەیارەی نـەیارانی کورد بە سوپاسەوەو بە ناڕاستەوخۆش قبولْ بکرێت بەڵام هێـزی ئیسـلام بەلەکـەداری بـاس بکرێـت، بـۆ چـەکی وڵاتـانی دوژمـن بەکارهاتووە بۆ دژی کوردو جێگەی قسەش نی یە.

عەلمانیەتی کوردی بەسەردیواردا خۆی سەرخستبێت و بەبێ حسـابکردن بـۆ کۆمەڵگـەو ڕاوەرگرتنیـان بـەزۆر هـەوڵی خـۆ

سەپاندنی داوەو قاچاخانە خۆی خزاندووەتە ناو کۆمەڵگەی کوردەواری، ئەوەی کە ئەمڕۆ بەناوی عەلمانیەت و لەژێر بیرۆکەی ئیلحادیدا بەردەوام گومان بڵاو دەکاتەوەو ئیسلام بەوە ناشرین دەکات و دەڵێ باشە ئەگەر ئێمە ئیسلامیشمان قبوڵ بێت چ جۆرە ئیسلامێك بێت؟ سعودی بێت! ئەفغانی بێت! یان عەرەبی و فارسی بێت! گەرچی دەکرێت هەمان پرسیاریش ڕووبەڕووی عەلمانیەکان بکرێتەوەو بە هەمان لۆژێك هەمان پرسیاری خۆیان ئاراستە بکرێتەوە ئایا ئەی ئەگەر عەلمانیەتمان قبوڵ کرد چ جۆرە عەلمانیەك بێت؟ ئەمریکی بێت! بەریتانی بێت! ئیسپانی بێت! یان..

هەروەك چۆن لە ڕۆژئاوا شۆڕشکرا بەسەر دینی مەسیحیەتدا دەکرێت ئەمڕۆش ئەو وڵاتانەی کە ناوی خۆیان ناوە ئیسلامی شۆڕشیان بەسەردا بکرێت بەڵام نەك بە هزرێکی دەرەکی چونکە خودی ئیسلام ئەوەندە بەشی ئەو شۆڕشگێڕیەیی تێدایەو لە چوارچێوەی دەقە شەرعیەکاندا دەتوانێت مافەکانی خۆی بەدەست بهێنێت، بەجیا لە دەقە دەستکاری کراوەکانی

مەسیحیەت کە گەر کێشەیەکیان بهاتایەتە بەردەست نەیان دەزانی چۆن حوکمی بکەن و پرسیاریان لە پیاوە پیرەکان دەکرد کە جاران ئەو کێشەی چۆن چارەسەر کراوە.

ئەوەی کە پێی دەوترێت عەلمانیەت لە کوردستاندا یان لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا بە گشتی وێنایەکی بێ دینی و ئیلحادیان لە مێشکی تاکی کوردا دروست کردووە، لە کاتێکدا هەر بە پێوەرە عەلمانیەتەکە ئەوەی لێرە دەگوزەرێت جیاوازی هەیە لەوەی لە ڕۆژئاوا کاری لەسەر دەکرێت، چەند نموونەیەك و وەك بەڵگەی ڕاستێتی لە ڕۆژئاوا بوار بە مومارەسەی دین دەدەن و حسابی تایبەتی بۆ دەکەن گەرچی سیاسەتی ئەو وڵاتانە بە پێچەوانەی لای خۆمان لە ناوخۆدا سیاسەتێکی نەرمەو بۆ دەرەوە ڕەقە بەڵام لە کوردستاندا لە ناوخۆدا بۆخۆمان خراپین و بۆ دەرەوە نەرمین! ئەوانەی لە قۆناغێکی ژیانیاندا بە حەرامی شیری ئیسلامیان خواردووە بەڵام ئێستا بوونەتە تەتەری عەلمانیەتی کوردیی!

لێرە بۆ دروستبوونی کێشە مەعبەدی زەردەشتی حکوومەت بودجەی زۆری بۆ سەرف دەکات دروستی بکاتەوە وە مزگەوت

لەسەر ئەرکی خێرخوازیش ڕێگری لێ دەکرێت و سنوردار دەکرێت.

ئەو بۆشاییانەی کە لەنێوان خەڵك و عەلمانیەتدا دروست بووە یەکجار زۆرن لەم کۆمەڵگەیەداو هەمووشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئەقڵیەتە پارەنخوازەی کە پێش کۆمەڵگە خودی عەلمانیەتی ناشرین کردووەو خستووەتە ژێر پرسیارەوە! بەجۆرێك وێنەی عەلمانیەت لە زەهنی تاکی کوردیدا دروست بووە واتە دژە دین و دژ بە بەها کۆمەڵایەتیەکان، لە کاتێکدا ئەکرێت عەلمانیەت لەسەردەمێکدا وەك دژە دین و بەرانبەر مەسیحیەت ئەو مانایەی هەڵگرتبێت کە بەرانبەر ئەو دەسەڵاتداریەتی و ستەم و قۆرخکاریەی پیاوانی مەسیحیەت، بەڵام لە بنەڕەتدا وا نەبووە عەلمانیەت دژی ستەمێکی پاوانخوازی کاری کردووەو بۆ دەربازبوون لەو قەیرانانە هاتن و دینیان لە سیاسەت جیاکردەوە بە شۆڕشکردن بەسەر ئاینی مەسیحیەتدا.

بە بڕوای من وەك چۆن هێزێك یان لایەنێك لێرەو لەوێ دروست دەبێت بەناوی ئیسلامەوە کارانێك دەکات و زانا

ئیسلامیەکان لێی بەدەنگ دێن و دەیکەن بە هەرا لەسەری و بەڵگەی بۆ دەهێننەوە کە کارەکانیان لە چوارچێوەی شەرعدا جێگەی نابێتەوە یان لایداوە دەبوو ڕۆشنبیرانیش لە ئاست ئەو کەسانە بەدەنگ بهاتایەن کە عەلمانیەتیان تاپۆکردووە بۆ خۆیان! وە لەبەرانبەردا دەنگێکی وا نی یە یان نابیسترێت بەم کۆمەڵگە بڵێت ئەم وێناکردنە پێچەوانەی ئەو سستمە عەلمانیەتەیە کە هەیە، عەلمانیەت بریتی نی یە لەبەراز خواردن و ڕابواردن و مەساج خانەو دیسکۆو ئەو جۆرە شتانە!.
نەهامەتیەکانی گەلی کوردیشی خستە پاڵ ئەم جۆرە هزرو بیرکردنەوانە بە شاهیدی مێژوو ئێمە گەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ئەم حیزبە کوردستانیانەی کە ئێستە لەسەر عەلمانیەت پۆلێن دەکرێت و لە خەباتی شاخیانەوە تا ئەم کاتە بەبێ هیچ دوو دڵی و گومانێك دەتوانین بڵێین خواستەکانی گەلی کوردیان کردووەتە قوربانی ئایدۆلۆژی عەلمانیەت، ئەویش بە هەڵە واتە بەشێوەیەك وێنای عەلمانیەتیان لە ناخی تاکی کوردا کێشاوە کە واتە بێ دینی لە کاتێکدا ئەم بێ دینیە بەرانبەر بە مەسیحیەت بووە نەك

ئیسلام! هەربۆیە لە شاخەوە تا ئێستە ئەو بۆشاییە لەنێواندا دروست بووە!

هۆکاری هەرە سەرەکی دروستبوونی ئەحزابی ئیسلامی لە کوردستاندا هەر ئەمە بووە، چونکە گەر تۆزێك لۆژکیانە بیربکەینەوە شتێکی زۆر نالۆژیکیە ئەحزابی ئیسلامی لە وڵاتی ئیسلامیدا هەبێت! یانی چی میللەتێك خۆی مسوڵمان بێت و حیزبی ئیسلامی تێدا بێت! دەکرێت ڕێکخراوی جۆربەجۆری ئیسلامی هەبێت بەڵام حیزب و جیاکردنەوەی خۆت لە خەڵکی بەناوی ئیسلامەوە جێگەی پرسیارە! بەڵام ئەو بۆشاییەی ئەحزابە عەلمانیەکان دروستیان کرد ئەویش بە دژایەتی کردن و حساب بۆ نەکردنی دین تا ئێستە ئەم فەوزا لە کوردستاندا دروست بووەو خەڵکی دابەش بێت بەسەر ئیسلامی و عەلمانیدا وە لەسەردەمێکیشدا شەڕ بەناوی ئیسلام و کافرەوە لەنێوانیاندا ڕوویداوە، دواتر دابەش بێت بەسەر چەندین بەناو فکرو ئایدۆلۆژیایی جیاوازدا، لە هیچ شتێکدا لە عەلمانی غەربیش ناچن و هەرکەس کورسیەکەی گرت نموونەیەك نی یە بەخۆشی

وەك ئـەوەی لـە ڕۆژئـاوا هەیـە بـەری بـدات، هـەردەبێت لەسـەر کورسیەکە بمرێت یان بە شەق لایبەریت! ئەو هـەموو بۆشایی و لێـك دووریـە کـە زۆر جێگـەی پرسـیارو سروشـتی نـی یـە بـۆ هـەرێمکی چـکۆلانەی قـەیراناوی و باوەڕپێنـەکراو، کـە دەبـوو هەمووی پێکەوە کاریان بۆ ئەوە بکردایە ئینتیمای خەڵکیان بۆ خـاك و نەتـەوەو دینەکـەیان هـەبێت و بۆشـاییەکە بـەجۆرێك لـێ نەکـەن کەسـێکی دینـدار خـۆی بـەجیاواز ببینێـت و هەسـتی غوربەت و بێ کەسی و میوانی لەم وڵاتەدا هەبێت.

ئەگەر کێشەی ئەم بۆشاییە نەبوایە بۆ کۆمەڵێك مامۆستای ئاینی کە هەمووی دژی بەعس بوو نەیانتوانی لەگەڵ ئەم هێزە ئەگـەر فعلـەن نیشـتمانیە بتـوانن کـار بکـەن، ئـەوەی دواتـر بزووتنەوەی ئیسلامی لێ دروست بوو.

لـە کـەلار کابرایـەکیان گرتبـوو تـا بردبوویانـە ئاسایش بـە نوکـە تفەنگ و شەق و چەپۆکە بەبێ ئەوەی بزانێت لەسەر چی گیراوەو بـەبێ ئـەوەی قسـەی بـۆ بکـەن، لـەوێ وتبـووی تـەنها پـێم بڵـێن لەسەرچی منتان گرتووە ئەویش وتبووی تۆ ئیسلامیت! ئەویش

وتبووی کورە بەرم دەن با هەزار کفر نەکەم لە داخی ئێوە! هەرکە وای وتبووی ووتبویان بەریدەن بەخوا ئەوە ئیسلامی بوایە ئاوا بە ئاسانی کفری نەدەکرد، دواتر دەرکەوتبوو بەهەڵە بووەو ناوەکەی لێکچووە لەگەڵ کەسێکی تردا! هەر باش بوو نەیانکوشتبوو چونکە کوشتنی بەهەڵەی لەم شێوەش بەداخەوە هەبووەو گرتنگی کەسێکیش لەبری کەسێکیتردا! ئەمەیە عەلمانیەت! عەمەیە عەدالەت؟!

عەلمانیەت هێزی خۆی وەك کاسپی نیشانی خەڵك داوە، کابرایەك دەیگوت ئەم چەکدارانە چەکەکانیانم وەك خاکەنازو قوڵنگەو ئالیەتی ئیشکردن دێتە پێش چاو.

بەڵام لەم وڵاتەدا هەرچی دژایەتی لەگەڵ دیندا هەبێت لە زەمینەی واقعیدا ئاسانکاری بۆ دەکرێت، ڕاقیسەیەك موچەکەی بەرانبەر سێ مەلایە، جێگەی گشتی دەدرێت بە شەخس بۆ کردنەوەی مەشروبخانەو پێوەرەکان زۆر فشۆڵن و بە منداڵ مەشروب دەفرۆشرێت و گوێ بە خەڵکی ناوچەکە نادرێت گەر

لەگەڵ ئەو کارەدا نەبێت، لە ئەورروپا ئیمزا کاری پێ دەکرێت و تەنها یەك دراوسێ قسەکانی جێگەی ئیعتبارە بەڵام لێرە!

بۆیە ئەوەی خۆی کردووە بە نوماینـدەی عەلمانیەت لـەم وڵاتەدا میزاجی شەخسی خۆی و حەزو ئارەزووەکانی کردووە بـە پێـوەر نـەك هـیچ دەقێـك کـە لەچوارچـێوەی بـەها کۆمەڵایەتیەکانـدا جێگـەی ببێتـەوە کـە لـەدەرەوە زۆر بـەرز دەنرخێنرێت و لێرە نرخی سەلکە تورێکی نی یە.

لە دەرەوە فکر ئازادە دەتوانیت باسی فکرەکەی خۆت بکەیت هەتا هەندێك جار خودی فکرەکە یان دینەکە جیاواز بێت لەگەڵ بەرانبەرو پێچەوانەی یەکتریش بن، لە مزگەوت باسی یەکتا پەرستی بۆ خەڵکی دەکەن، بەڵام لە کەنیسە عیسا سەلامی خوای لەسەر بێت بە خوا وەسف دەکەن، لە مەعبەدی بووزیەکان خواکەیان لەبەردەم بیناکەیان داناوە، لە مەعبەدی سیخەکان مشك و مانگا، بەڵام مادام نەگاتە ئاست ئەکشنێکی نەخوازراوە هەموو ئەوانە ئاساییە، بەڵام لێرە لەسەر ووتارێك ڕۆژنامەنووس

کوژراوە، لەسەر قسەیەك دەمی خەڵك هەڕاوە، لەسەر قسەیەك فەسڵ کراوە، لەسەر قسەیەك گواستراوەتەوە.

هەربۆیە دیمەنەکانی کوردستان لەماوەی ٢٤ ساڵی ڕابردوودا بهێنەرە بەرچاوی خۆت وەك چۆن لە تیڤیەکانەوە دەڵێن وێنەکان دەدوێن ئیتر پێویست بە قسەکردن ناکات.

بەڵام ئەمانە لەبری ڕۆشنبری کاریان بۆ گەوجاندنی خەڵك کردووە، وەك دەوترێت ماسی لە ئاوی لێڵدا زووتر ڕاو دەکرێت. کابرایەك هەبوو جاش بوو سەردەمی بەعس و هەمووی دەزانێت موچەی جاش ٨٠ دیار بوو مانگانە، کە ڕاپەڕینەکە بوو دواتر بوو بە پێشمەرکە زۆرجار پرسیاریان لیّ دەکرد کە موچەکەت چەندە؟ ئەویش دەیگوت بەخوا هەر ٨٠ دینارەکەیەو زیادی نەکردووە.

یەکەکە دوای ساڵانێکی تولانی و خەباتی شاخ ئێستە دەگاتە ئەو قەناعەتە کە بۆشاییان لە نێوان خۆیان و خەڵکدا دروستکردووەو کۆنگرەی ئیسلام و دیموکراسی لە ئامادە

(دیاریـەکی) دەبەسـتێت تێیـدا بـە هـەموو ئیعترافاتێکـەوە لـە کـۆنگرەدا دەوترێـت ئـەزموونی مەدینـەوەو پێکـەوە ژیـانی دەسـتەڵاتدارێتی محمـد درودی خـوای لەسـەر بێـت چارەسـەرو لێکچووە لەگـەڵ ئـەزموونی ئێمـەو ئێسـتەدا، دەمیرتـاش بـە یـەك وتـەو پشـتگیری هاوڕەگـەزبازەکان بالانسـی دەنگـەکان دەگۆڕێـت ئاخر هـەقی ئـەوە نـی یـە تـەمبێ بکرێـت کـە مـاقی ئـەو نـی یـە ئـەو قسەیە بکات و هەڵەی ئەو دواتر میللەتێك باجی دەدات.

ئەگەر ماوەی حوکمڕانیەتی ئەم هەرێمە حوکمێکی ئیسلامی بوایە! پەلەیەکی ڕەشی گەورە دەبوو لە مێژووی ئیسلامیدا.

ئەوانەی کە لە سەرەتاوە بە عەلمانی هێناوییانە و هەشیانە عەلمانیەکی بەعسی بووەو دواتر بووەتە عەلمانی کوردیی! ئەو تاك و تەرا خوێنەوارەی کە نیازیان خراپ نیە بەڵام بەخۆیان بزانن یان نا لە بواری کارو فیکری ئیسلامییدا کەوتوونەتە ژێر فشەو فشاری عەلمانیەتەوە.

## ئەو ئیسلامیەی کە عەلمانیەت دەیەوێت:

ئیسلامێکی کەم ئەندام و پەل و پۆ بڕاو، ئیسلامێك بە عەرەبانە بڕوات بەڕێوە!

دەکرێت خواستەکانی گەلی کورد لەم جۆرە فکرو ئایدۆلۆژیە جیابکرێتەوە بەڵام بەداخەوە ئەوان سودیان هەر لەم تێکەڵی و پێکەڵیە وەرگرتووە هەربۆیە تا ئێستەش نەتوانراوە حیزب لە حکومەت جیا بکرێتەوە هەر باسی باسی ئەوەیە دین لە دەستەڵات جیابکرێتەوە، ئاخر دین کەی دەستەڵاتی هەبووە تا جیا بکرێتەوە، لەوەتەی کوردستان هەیە یەك نموونەم پیێ بڵێن دەستی دزێك بڕا بێت، جەڵد لەکەسێکی زیناکەر درابێت، کەسێك هەڵواسرابێت لەسەر تاوانی ڕێگە گرتن و تاڵانی کردن، زۆر بەداخەوە ئەزموونی ئێمە لەگەڵ وڵاتانی دەرەوەدا بەردەوام تێکەڵ دەکرێت و تا ئێستە نەمانتوانیووە خۆمان بین.

جێگەی خۆیەتی بووترێت کەسایەتیە ئیسلامیەکان لە ماوەی ڕابردووداو تا ئێستە چەندین کۆڕیان سازکردووە وەك دیبەت و

بــە هاوبەشــی ئەوانــەی کــە کاریگــەرن بــە فکــرو ئایــدۆلۆژی عەلمانیـەت و ڕۆژئـاوایی بـەڵام عەلمانیـەکان خۆیـان لـەو جـۆرە کــۆڕو کۆبوونەوانــە دەبــورێنن و هــەوڵی جیاکــاری دەدەن و بۆشــاییەکە دیســان قــوڵتر دەکەنــەوە، خــاوەن فکــریش نابێــت بترسێت لە ڕووبەڕووبوونـەوەو بوار بۆ ڕەخسـاندن، دواتـر ئـەوان لە فەزایەك دەبن و کۆمەڵگە لە فەزایەکی تر، جگـە لـەوەی مـاوەی حوکمڕانیـەتی ئـەم هەرێمـەو لـە ژێـر نـاوی عەلمانیـەت و فکـری غەربیبدا هۆکارێکی گەورە بووە بۆ بە کافر زانینمان و ڕەوایـەتی دان بـەو گروپانـەی کـار لەسـەر ئـەو دەسـتەواژانە دەکەنـەوە، هەربۆیـە دەبێـت عەلمانیەت بەبـەرگێتی تـرو حسـاب بـۆ کۆمەلگـە بێتـەوە مەیـدان و قـەرەبوونی ڕابـردووی بـە تەوبەیـەکی کـرداری بکاتەوە.

لە دینی ئیسلامدا شتگەلێکی جێگیر هەیە(الثوابت) نابێـت هـیچ کـات دەسـتی بـۆ ببرێـت و بڕاوەتـەوەو لـە ڕاسـتیدا ئـەرکی پەرلەمان سوککراوە لە ئاستیدا نەك بە پێچەوانەوە.

ئەگەر بە وردی سەیری ئەو جێگیرو نەگۆڕانە بکەین هیچ کات بە گۆڕینیان هیچ بەرهەمێکی پێشکەوتنی دونیای بەدوادا نایەت، بەڵکو زۆر بە پێچەوانەوە هەرکات ئەو شتانە گۆڕان شتی قیزەون و خراپ جێگەی دەگرێتەوە.

بۆ نموونە لە دینی ئیسلامدا یەکتا پەرستی هەیەو بڕاوەتەوەو هەرئەوەش لە بەرژەوەندی و سودی گشتیدایە، ئەگەر تۆ بێیت و وازت لەوە هێنا ئەوا بت و ئارەزووکان جێگەی دەگرێتەوە.

دزی بڕاوەتەوەو هەرشتێك بچێتە چوارچێوەیەوە، کە تۆ بێیت و وازت لەوە هێنا ئەوا سەدان یاسای داتاشراو دزیەکان سپی دەکاتەوەو یاساکە جێگەی قورئانی پیَ دەگرێتەوەو خۆی بۆ خۆی دەبێتە دین و پیرۆز دەکرێت لە بەرژەوەندی کۆمەڵێك کەسدا نەك گشتی.

زینا بڕاوەتەوە کە واز لەوە دەهێنێت ئەو سەرگەردانیە دروست دەبێت ناڵێم لە وڵاتانی خۆمان لە وڵاتانی غەرب خۆی

پێوەی دەناڵێنن بە دەستی منداڵی بێ دایك و بێ باوك و شەڕو کێشەو نا ئارامی.

خواردی مادەی سەرخۆشکەر بڕاوەوە، کە واز لەو یاسا بڕاوە خواییە دەهێنرێت ئەوا کێشەو کوشت و بڕو پێکدادانی ئوتومبێل بەرهەم دەهێنێت.

ڕیبا بڕاوەتەوە کە واز لە ڕیبا دەهێنرێت ئەوا قەرزارو سودمەند بوونی دەوڵەمەندەکانی لێ دەکەوێتەوە، کەسێك قەرز دەکات لە کێ قەرز دەکات خۆ هەژار پارەی نی یە بیدات بە قەرز دەبێت لە دەوڵەمەندی بکەیت! دواتر ئەویش بە زیادەوە وەری دەگرێتەوەو بەردەوام لە قازانجدایە.

هەموو ئەو شتانەی پێویستی بە گۆڕانکاریە لە دینی ڕاستی ئیسلامدا نەك ڕێگری لێ ناکات بەڵکو ئەرکە دەبێت ئیجتهادی تێدا بکرێت، هەتا لە ئوموری عیبادات و زۆر شتیشدا، ئەوەتا موجتەهیدێك هەر کە هەوڵ دەدات خێرێکی بۆ دەنوسێت ئەگەر نەشی پێکێت، خۆگەر پێکای دوو خێری بۆ دەنووسێت.

بیناسازی و تەکنەلۆژیاو هاتوچۆو هەرچی ئەو شتانە هەیە کە پەیوەستە بە پێشکەوتنەوە هیچی دەقێکی ڕێگری لەسەر نی یە، بەڵکو هەندێك شتیش هەیە کە لێکدانەوەی هەڵەی بۆ دەکرێت سەرەنجامی جەهلە بەرانبەر دین، بۆ نموونە پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت کە ووتاری بۆ خەڵکی دەداو خەڵکی زۆر بوو بوون و لە دواوە نەیان دەبینی، کابرایەك وتی ئەی پێغەمبەری خوا بۆ شتێك دروست نەکەین بچیتە سەری و تا خەڵکی بتان بینن، ئەویش فەرمووی دروستی بکەن، دواتر دارتاشێك میحرابێکی بۆ دروست کرد کە بە ٣ قادرمە دەچووە سەری، ئیتر پێویستی ئەو کاتە هەر ئەوەندە بووەو ڕێگری لێ نەکراوە، ئێستە کەسێك دێت دەڵێ بیدعەیە لە ٣ قادرمە زیاتر چونکە ئەوەی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت هەر ٣ قادرمە بووە ئەوە جەهلە، خۆ دارتاش ئەوەی دروست کردووە نەك موجتەهیدی شەرعی.

ئێمە گەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای سەرهەڵدانی عەلمانیەت دژی پیاوانی کەنیسە هەوڵی ئەوان بۆ لابردنی ستەم بوو بەناوی

دینەوە، گەرنا بە ئێستەشەوە نەیان توانیووە دینەکە بسڕنەوەو لەگەڵ ئەوەی دینی مەسیحیەت بە کەڵکی حکومەتداری نایەت هەر پێویستیشیان پێیەتی و ناسنامەیان هەر بە مەسیحیە ناسراوە.

کێشە ئەو سیاسیانەی کە ئێستە دین هەمووی وەك یەك سەیر دەکەن نە شارەزاییانە بەرانبەر ئیسلام و یاساکانی وەیان فێلزانیانە.

لە ئیسلامدا حوکم هەیە کە لە کتێبە شەرعیەکاندا دەرهێنراون و بەناوی ئایات الأحکام، ئەو ئایەتانەی کە حوکمی تێدایە.

هەروەها لە فەرموودەکانیشدا هەیە.

عەدالەت بنچینەی حوکمڕانیەتەو یاساکانی لە قورئاندا بۆ کێشراوە کە چ عەدالەتەوە چ نا عەدالەتە.

پێویستە چیتر ئیسلام نامۆ نەکرێت لە کۆمەڵگەداو ڕێزی لێ بگیرێت وەك هەڵبژاردەیەکی زۆرینە گەر حوکمی گەلیش بۆگەل بێت وەك بنچینەکانی دیموکراتی دەبێت ئەوەشت قبوڵ بێت ئەوان چی هەڵ دەبژێرن.

پێویستە سنورێك بۆ ئەو کەسانە دابنرێت کە خواستەکانی کورد بە قوربانی قسەی باق و بریق دەکات و بە کردەوە فەشەلیمان لە بواری دەستەڵاتداریدا بینووەو کردەوەکانی بۆمان دەدوێت.

ئیمڕۆ وڵاتێکی تەکنۆکراتمان دروست کرد بە ژێرخانێکی پتەوەوە تەنها ئەوە ماوە تەبەنی دنیابینی سیکۆلاریتی بکەین، ئەویش لە سەر دەستی کێ ؟

ئەوانەی ئێستا بانگەشەی سیکۆلاریزم دەکەن بەشێکی زۆریان نەیانتوانیوە ئەپدەیتی زانیارییەکانیشیان بکەنەوە یان تەنها تووتین و نەقڵی ئەفکارن هەتا ناتوانن ناقڵ فکریش بن، بۆ نموونە عەلمانیەتی ( کەللە شەقی عەرەبی ) تەواوی فکری سیاسی و دروشمی خۆی لەسەر پێناسەیەك بونیاد ناوە کە پێناسەیەکی چەقبەستووی ناو قاموسەکانە هی نیوەی سەدەی نۆزدەیەمە، ئەمە لە کاتێکدا وتراوە کە دەوڵەت کیانێکی بچووك بووە و بازنە هەژموونی ئەوەندە فراوان نەبوو بتوانێ تەحەکوم بەسەر ژیانی تایبەتییەوە بکات، کەچی ئەم بە ناو ڕۆشنبیریانەش بە کارەبا و تەسجیلی ئێرە و بە قەوانی ئەوان دەیلێنەوە هەتا ئێستا لە ئادۆنیسا تێنەپەڕاند تا پەیدابوونی تیۆرەکەی ( ئەلفرێد ستیڤان توینس تولەررانس ) کە پێی وابوو

دینیش دەبێ ڕۆڵی هەبێت لەگەڵ سیکۆلاریزم لێرە و لەوێ بوو بە هەراو ۆرك شۆپ و مێزگرد ( خولاصەی کەلام ئەم خزمانە لەوەی بانگەشەی بۆ دەکەن ناتوانن ئیجتهادییان تێدا بێت خەڵك لە بری ئەوان بیر دەکاتەوە، سەیر لەوەدایە ئێمە بە چەقبەستوو ناو دەبەن پێمان دەڵێن کۆنە پەرست چونکە هەر قورئان دووبارە دەکەنەوە دوا جار ئێمە شەرم لە وتنەوەی قسەی خوا ناکەین و شانازی پێوە دەکەین بەڵام ئێوە چی ؟ وەك ووتم خەریکی گواستنەوەی بیر و ئاڕاستەی خەڵکن، ئادەی بزانم کراوەیی ئێوە لە چیدایە ؟ ئەگەر ( ئەلفرێد ستیفان ) نەبوایە هەر دەتان ووت دین لە دەوڵەت جیا هەر چەند هەندێکیان ئێستاش هەر دەیڵێنەوە، وە ناشتوانن زانستی و بابەتی بن چونکە کۆمەڵە خەڵکێکی حاقید و پەرگیرن.

## عەلمانییەت بۆ کێ ؟

سیکۆلاریزم ئاشکرایە لە کوێ و بۆچی سەری هەڵداوە، ئێمە ئەوە دەزانین ڕەفتاری کڵێسا لە سەدەکانی ناوەڕاست چۆن بووە

لە هەمبەر ژیانی تایبەت و گشتی، وە مامەڵەی چۆن بووە لەگەڵ زانست و زانیاری، کەواتە سیکۆلاریزم ئەنجامی کاردانەوەی کاریگەر و حەزێکی سەرکەشانەیە بۆ ڕزگار بوون لە دەسەڵاتی کڵێسا، ڕۆژ ئاوا هەر لە سەرەتاوە بیرۆکەی ڕەش و سپیان لا گەڵاڵە بووە بە تایبەتی بیری سیاسی ئاینیان هەڵبژاردووە لە نێوان مەلەکوتی ئاسمان یان مەلەکووتی زەوی ئەم هۆکارانە هیچیان نادۆزییەوە لە منداڵدانی ئیسلامدا بە واتایەکی تر ئێمە چینی پیاوانی ئاینیمان نییە پیۆکراتیەت بە تەواوی ڕەتکراوەتەوە لە ئیسلامدا دەسەڵاتدار پیرۆز نییە نموونە عومەری کوڕی خەتاب ( ڕەزای خوای لێبێت )، ئەم مامانە داماو و بێ نیشانە بنێرنەوە ماڵەوە کۆمەڵگای ئێمە نە حەملی بە عەلمانییەتەوە هەیە نە بە تەماشە.

وەك وتمان ئێستا عەلمانییەت ئەوەی تێپەڕاندووە کە تەنها جیا کردنەوەی دین بێت لە دەوڵەت بەڵکو جیا کردنەوەی بەهاکانە لە خودی ژیانی مرۆڤ، ئێستا بازاڕ بەهاکان دیاری

دەکات ئەم ڕستەیە لەوانەیە شۆکێك بێت لای هەندێك خەڵك سەیر بێت، لە ئەنتۆلۆجیای ئەخلاقدا واتە چاکە بۆ چاکە ستادارت چییە ؟ تەنها بەشێوەیەك بابەتی دەبێت کە ڕەها دەبێت کە شەرعییەتەکەی لە میتافیزیکەوە گرتبێ چونکە لە دەرەوەی دین شتێك نییە بە ناوی موحەڕەمات و چاکە و خراپەی موتڵەق

کاتێ عەلمانیەت دەڵێت دین لە دەوڵەت جیا لە دوا جار جیاکردنەوەی مرۆڤە لە بەها ڕەهاکان چونکە لای ئەوان بەهاکان ڕێژەین و دەگۆڕێن و جیهانی ماددی هەموو ڕاستەقینەکان لە خۆ دەگرێت، ئەوان سەیری مرۆڤ دەکەن وەك بەشێك لە ئەنزیمەی ماددی بەڵام ئێمە پێمان وایە ماددە بەشێکە لە پێکهاتەی مرۆڤ، وەك چۆن جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە دەبێت مرۆڤ مرۆڤ بوونی خۆی لە بیر چێتەوە تا بتوانێ لەگەڵ ئەنزیمە مادییەکەی ژینگەکەیدا یەك بگرێت، وە لە دەستدانی مەرکەزی بوونی مرۆی خۆی، لێرەدا مرۆڤ لە بیرۆکەی ئاینی خودا دادەبڕێت هەوڵنادات بگات بە خوا بەڵکو نزمترە لەوەی لەگەڵ ژینگە ماددییەکەیدا

تێکەڵ بێت خۆی بە ڕەهای بە بەشێك لەو بزانێت، هەموو بەهاكانیش بە شێوەیەكی ڕەها ڕێژەیی بن ( مەقولەكە خودی خۆی هەڵەیە ئەوان پێیان وایە هەموو شتێك ڕێژەییە لە كاتێكدا هەمووەكە موتڵەقە ) لای ئەوان بەهاكان خودین وە ئەگەر هەموو شتەكان ماددەش بن كەواتە جگە لە هێز هیچی تر نییە ئەمە هەوڵە بۆ سەپاندنی تێڕوانینی ئەخلاقی خودی، ئەوە لای من جوانە بەڵام ئەوە جوان نییە یان ئەوە چاكەو ئەوەیان چاك نییە، نابێت ئەوەمان لە بیر بچێت لە واقعی ماددی بەها ناداتە مرۆڤ بەڵكو حەقائیقی عیلمیت دەداتێ لێرەدا دابڕانێك لە نێوان ڕاستییە زانستییەكان و بەهاكان ڕوو دەدات بۆ نموونە ئەگەر كەسێك بڵێت منداڵ بە گەرم كردن دەكشێت قسەكەی زانستییە ئەخلاقی نییە، عەلمانییەكان یەكەم جار مامەڵەی عیلمیان لەگەڵ مرۆڤ كرد، یەكەم جار ئەوان بوون مرۆڤیان بردە تاقیگە، نازییەكان منداڵێكیان تەعزیب دەدا و منداڵەكەی تریان دێنایە دیاری تا بزانن كاریگەری چەندە ، دواتر پرۆسەیەكی عیلمی

خاڵی لە بەهاپەیدا دەبوو، چەکی کیمیاییان بەرهەمهێنا شەڕی خوێناوییە جەنگە جیهانییەکانیان پێکرد، دواتر بردنی سامانی خەڵك و دابەشکردنی لە نێوان خۆیاندا بە شێوەیەکی داد گەرانە مەگەر ئەمانە بەرهەی عەلمانیەت نەبوون ؟ بۆ لە بیرتان چووەتەوە ئەمریکای لیبڕاڵی کەپیتاڵیست چۆن دروست بوو ؟ مەگەر بناغەکەی بە قڕ کردنی زیاتر لە یەك ملیۆن هیندە سورەکان دەستی پێ نەکرد ؟ چونکە لای ئەوان ئەخلاق ڕێژەییە، با ورد بینەوە لەم وتەیەی نیتچە دەڵێت: گەر جیهان ماددە بێت هەمووی ماددە جوڵاوە کەواتە جێگیری لە جیهانا نییە وە هەموو شتێك ڕێژەییە وە ئەگەر هەموو شتێك ڕێژەیی بوو کەواتە نە مانا هەیە و نە ئەخلاق هەموو قسەیەك لە بارەی ئەخلاق و ماناوە وەهمن و مرۆڤ دایهێناون، داستان زۆر شتمان پێدەڵێت کە مەشروعی ڕۆژئاوایە کە مرۆڤ لە بەها دادەبڕێت، لێرەدا پرسیار لە سیکۆلاریستەکان دەکەین، کە ئایا بەهاکان دەگۆڕێت ؟

کە دەگۆڕێت ئەو فاکتەرانە چین دەبێتە هۆی گۆڕانیان ؟

لای ئـەوان بـەهاکان دەگـۆڕێن، چـاکە و خراپـەش بـە مـان ئەسڵییەکەی ( بابەتی ) بوونی نییە کەواتە پەستانی کۆمەڵایەتی تەحەکوم بەگۆڕانەکانەوە دەکات، ئایا هەر شتێك زۆرینـە پێـی وا بـیٚ باشـە باشـە ؟ ئایـا لـە نـاو بردنـی جولەکـەکان لـە لایـەن هیتلـەرەوە بـاش بـوو ؟ خـۆ زۆرینـەی کۆمـەڵگای ئـەڵمانیای قەناعـەت پێکرد بوو، ئایا چونکە خەڵك پێی باش بوو باشـە ؟ ئەمـە تـەنها فکرەی ڕەهـای بەهاکان دەتـوانیٚ مسۆگەری خراپـی ئەمە بکات.

مەشـروعی مۆدێرنـە تـەنها خـوای ڕەت نەکردووەتـەوە بـەڵکو خـــودی حەقیقــەتی ڕەهاشـــی ڕەت کـــردووە بـــەڵام نـــازانم عەلمانییەکانی ئێرە لەمە تێدەگەن یان نا ؟

ئایا عەلمانیەت بەهاکان لە کوێوە دێنیٚ ؟ وەك ووتمان مانای ئـەنتۆلۆجی چـاکە و خراپـە تـەواو بەسـتراوەتەوە بـە بیرۆکـەی خـوا و ئایینەوە جەنابیشیان دەڵێن دین جیا کەینەوە لە فەزای گشتی !!!!!

یەکێك لە ئارگیۆمێنتە بەهێزەکانی سیکیولاریزم ئەوەیە کە فرەدینـی لـە کۆمـەلگادا یـان بـوونی دینـی جیـاواز لەهـەر

كۆمەلگایەكدا پێویستی بە سیستەمێكی سیكیۆلار هەیە چونكە دەتوانێت بێلایەن بێت لە نێوان دینەكاندا و ڕێز لە ئازادی هەریەكەیان بگرێت بۆنموونە لە وولاتێكی وەك كوردستاندا زیاتر لە دینێكمان هەیە ئەم دینانەیش هەریەك لەوان خاوەنی تایبەتمەندی و خالی جیاكەرەوەی خۆیانن ناكرێت یەكێك لە دینەكان بسەپێنین بەسەر ئەوانی تردا وە ئازادی تاكەكەسی ئەوانی تر فەرامۆش بكەیت.

وەلام/ ئێمە دەزانین جیاوازیەكانی بەرەی مرۆیی تەنها لە دیندا قەتیس نامێنن و دین یەكێكە لە جیاوازییەكانە ئەگینا جیاوازییە سیاسیی و ئابوری و كۆمەلایەتیەكانی زۆر بەهێزترن لە جیاوازییە دینیەكان بۆنمونە شەڕی ئەمڕۆی جیهان لای هەمووان ڕوونە شەڕی ئابوورییە پەیوەندی وولاتانیش هەر ئابوری بنەمای بۆ دادەنێت ڕوونە كە ئێمە لە تێروانینەكانماندا سەبارەت بە شێواز و سیاسەتی ئابووری لێك جیاوازین هەندێكمان پێمان وایە ئیشتراكیەت -سۆشیالیزم- ڕێگەیەكی باشە بۆ گەیشتن بە ئابووریەكی گونجاو و دادپەروەری

کۆمەلایـەتی ، هەنـدێکی تـر پێیـان وایـە کـە سـەرمایەداری سیستەمێکی بەهێزی ئابوورییە و دەبێتە مایەی گەشەسەندنی کۆمەڵگا ، هەندێکی تر پێیان وایە سیستەمی ئابووری ئیسلامی باشترین سیستەمی ئابوورییە بۆ هێنانە کایەوەی ئابوورییەك لە خزمەت مرۆڤدا و..هتد، پرسیاری ئێمە ئەوەیە ئەوە بۆ بیر لە نیزامێکـی ئـابوری بێلایـەن ناکەنـەوە بۆنمونـە مـەرج نییـە کـۆی خـەڵکی ئـەوروپا لەگـەڵ ئـەوەبێت کـە سیسـتەمی ئـابوری سەرمایەداری بێت ، یان مەرج نییە خەڵکی کۆریای باکور گشتی لەگـەڵ سیسـتەمی ئـابوری ئیشـتراکی بێـت، یـان جیاوازییـە سیاسـییەکان دەربـارەی سیسـتەمی حکـومڕانی و بـەڕێوەبردنی وڵات کـە هەنـدێك لەگـەڵ سیسـتەمی کۆمـارین هەیـە سیسـتەمی دیمـوکراتی یـان پاشـایەتی یـان پەڕلـەمانی دیکۆکراسـی یـان سەرۆکایەتی بێت..هتد ، کەسانی پەرۆشی سیکیۆلاری با بیر لە سیستەمێکی بێلایەن بکەنەوە بۆ کوردستان.



# عەلمانیەت

# چەمك و سەرهەڵدان وگەشەسەندنی و هاتنی بۆ ڕۆژهەڵات

نووسینی: مونا موحەممەد بەهیەدینی شافعی
وەرگێڕانی: نهاد جلال حبیب الله



( چەمکی عەلمانیەت ):

لەم ساتانەی دواییدا عەلمانیەت لە جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبوونەوەیەکی بەرفراوانی بەخۆیەوە دی تا ئەوەی چەمکی عەلمانیەت بوو بە یەکێ لە گرنگترین ئەو چەمکانەی کە لە کۆڕوکۆنگرەو نوسینەکاندا مشتومڕی لەسەر دەکرێت.

سەرەڕای بەربڵاوی چەمکی عەلمانیەت لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بەڵام تا ئێستا واتا و لایەن و سنوور دیاری نەکراوە، ئەمەش لەبەر ئەم هۆکارانە:

١-بەرفراوانی دەرفەت و مۆڵەتی واتابەخشی وشەکە.

٢-ڕاجیاوازی خودی هەڵگرەکانی ئەو بیرە لەسەر پێناسە و دیاری کردنی سنوور و واتای ئەو ووشە.

٣-هەواداری ژمارەیەکی زۆری بیریاران و فەیلەسوف و زانایان و تەنانەت هەندێك لە پیاوانی ئاینی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا. بۆ ئەو بیرە، ئەمە وایکردووە ڕاجیاوازیەکی زۆر هەبێت لە نێوان مەزهەبە هزری و ئابوریەکیانیدا، سەرەڕای بوونی سنورێکی

هاوبەشـی نێوانیـان کـە ئـەویش بریتییـە لـە دوور گـرتن لـە هەرشتێك کە ئاینییە.

٤-کوێر نوێنی فرە لایەنەکە عەلمانیەکان بۆ شاردنەوەی هەر لایەنێکی عەلمانیەت کە دەبێتە مایەی ڕاوەدوونانی موسڵمانان لـە عەلمانیـەت و نـەمانی جـەماوەری بـوونی دەیگرنـە بـەر، لـە خستنە ڕووی هزری عەلمانیدا تەم و مژ و ئاڵۆزی بەکار دەهێنن لەبەر ئەوی عەلمانیەت چەمکێکە بنەڕەت و ڕیشە و سەرهەڵدانی لە ڕۆژئاوا بووە بۆیە دەبێت لە بنەڕەتی زمانەوانی ئینگلیزیەوە دەسـت پـێ بکـەین، وشـەکە بـە ئینگلیـزی ئـەم واتایـەی هەیـە (secularism) (سیکۆلاریزم).

ئەم وشە پێکهاتووە لە وشەی لاتینی (saeculum) بە واتای جیهانیان یان دونیا کە لە بەرامبەر کڵێسادا دانراوە، چەمکی سـیکۆلار (secular) بـۆ یەکـەمجار لەگـەڵ واژوو کردنـی ڕێککەوتنی وستفالیا (١٦٤٨ن) بەکار هێنا.

ئەو ڕێکەوتنە کۆتایی هێنا بەشەڕی هەڵگیرساوی ئایینی نێو ئەورووپا و سەرەتای دەرکەوتنی دەوڵەتی نوێی نەتەوەیی (واتا دەوڵەتی عەلمانیەت) ئاماژەی کرد بە عەلمانیەتی شمەکی کڵێسا. واتا گواستنەوەی بۆ دەسەڵاتگەلێکی نائایینی واتا بۆ دەسەڵاتی دەوڵەتی مەدەنی واتای ئەم وشەیە لەسەردەستی جۆن هۆلیوگ ۱۸۱۷ – ۱۹۰٦ز بەرفراوانی بەخۆیەوە دی، چونکە ئەو بەم جۆرە پێناسەی عەلمانیەتی کرد کە بریتییە لە (بڕوا بوون بە توانای چاك کردنی باری مرۆڤ لە ڕێگا مادیەکانەوە بە بێ وەستان لەبەردەم پرسی ئیمان دا ئایا بە ڕەزامەندی بێت یان بە بەرپەرچدانەوەی بێت).

**واتای عەلمانیەت لە فەرهەنگە بیانیەکان دا:**

١. لە فەرهەنگی (المورد)دا بە واتای دنیای یان مەزهەبی دنیای دێت.

٢. لە دائیرەتولمەعاریفی بەریتانیدا هاتووە: سیکۆلاریزم بزاڤێکی کۆمەڵایەتیە بەونیازەی خەڵکی لابدات و لە

گرنگيدانيانەوە بەرەو ڕۆژی دوايی ئاڕاستەيان بكات بەرەو گرنگيدان بە دونيا بە تەنها، چونكە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا خەڵكی حەزو ويستێكی زۆريان هەبووە بۆ دووركرتن لە دونيا و رامان لە خواو ڕۆژی دوايی،بەرامبەر بەم ويستە سيكۆلاريزم خۆی نواند لە ڕوانگەی گەشەدان بە حەزەمرۆييەكانەوە،ئيدی لەسەردەمی ڕێنيسانسدا خەڵكی پەيوەستی تەواويان دەنواند بۆ دەستكەوتە ڕۆشنبيری و مرۆييەكان و بوونی توانای بەديهێنانی و ويستەكانيان لەم دنيا نزيكەدا، ئەم ئاڕاستەش بە درێژای هەموو مێژووی نویْ لە گەشەسەندندا بووە وەك بزاڤێكی دژ بە ئاين و مەسيحيەت).

٣. لە فەرهەنگی ئۆكسفۆردا هاتووە:عەلمانيەت واتە:

ا-دنيای يان ماددی نەوەك ئاينی و ڕۆحی وەك پەروەردەی نائاينی هونەر.،موسيقای نائاينی،دەستەڵاتی نائاينی يان حكومەتی نەگونجاو جيا لە كڵێسا.

ب-ئەو ڕايەی دەڵێت:شياو گونجاو نيە ئاين بنەڕەت بێت بۆ ئەخلاق و پەروەردە.

**لە فەرهەنگی عەرەبیدا عەلمانیەت بەم واتایە هاتووە:**

(عەلمانیەت پێکهاتووە لە (العلم) بەواتای دنیا یان جیهان، عەلمانیش پێچەوانەی ئایینی یان کە هەنووتیە).

لێرەوە دەردەکەوێت وشە عەلمانیەت بە فەتحەی سەر (عین)هاتووە و چاوگەکەی لە (العلم) هوەیە،ئەمەش لەگەڵ ڕەچاوی پێکهاتە ڕۆژئاواییەکەی وشەکە.

لێرەوە دەردەکەوێت وتنی (عیلمانیەت)لە دوو ڕوانگەوە هەڵەیە:

١- عیلمانیەت ئەگەر بکرێت بە ئینگلیزی واتە (SCIENTISM) ئەمەش واتە مەزهەبی زانستی.

زۆرجار ئەم هەڵە بەمەبەست دەکرێ تا خوێنەر لەبەردەم ڕاستیدا کوێربین بێت و وا بزانێت ئەو مەزهەبە زانستییەیە کە شانو شکۆی زانست بەرزدەکاتەوە تا نرخ و بەهای پێبدات و لای ڕۆشنبیران قبول بکرێت، ئەمەش دروست نیە.ئەم تێکەڵکردنە وای کردووە خەڵکانێ لەدژی بن و خەڵکانێکیش پاڵپشتی بن.

پوختەکەی: لەو پێناسەی پێشووەوە بۆ عەلمانیەت و بەڕوانینە چەند سەرچاوەیەکی دیکە دەردەکەوێت عەلمانیەت ناوی مەزهەبێکی هزری بیروباوەڕی کۆمەڵایەتیە بەو ئامانجەی خەڵکی وا لێبکات لە ژیانیاندا لە ئایین دووربکەونەوە، عەلمانیەتیش لە چەند بوارو لایەنێکەوە کاردەکات، لەوانە:

بەرەی سیاسی و ئابووری: کاردەکات تا یاسا دانراوە مرۆییەکان ببنە بنەڕەتی سیاسەت و ئابوری و نرخ و بایەخ بۆ ئایین دانەنرێ.

بەرەی کۆمەڵایەتی:تا نیزامێکی کۆمەڵایەتی وا دروست بکات کە بەهاکەی لە فەلسەفە مرۆییەکان و بنەڕەتەکانی تەزامونی کۆمەڵایەتیەوە وەربگرێ و ئایین لەبەر چاو نەگیرێت و خەڵکی چاو لەسەر ڕۆژی دوای لابەن و تەنها گرنگی بدەن بە خۆشییەکانی دونیا.

بەرەی پەروەردەی و ئەخلاقی:ڕێنماییە ئایینیەکان لە بوارەکانی هونەر و پەروەردەوە و ئەخلاقدا دوور بخرێنەوە، و لە نیزامە هارچەرخەکانی ژیانەوە ڕێنمایی وەربگرن.

بەرەی بیروباوەڕی:بڕوابوون بە ماددەی هەست پێکراو و بەرپەرچدانەوەی بڕوابوون بە شتێ کە بە پێنج هەستەکە هەستی پێناکرێت.

( سەرهەڵدانی عەلمانیەت و هۆکارەکانی دەرکەوتنی لە ڕۆژئاوادا )

١-سەرهەڵدانی عەلمانیەت:

عەلمانیەت لە ئەوروپا لەسەدەی حەڤدەوە دەرکەوت و بە درێژای مێژووی نوێی ڕۆژئاوا چەند واتایەکی لە خۆگرت. لەسەدەی حەڤدەو هەژدەدا بەو واتا دەهات (جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت)،لە سەدەی نۆزدەدا واتاکەی گۆڕا بۆ (دورخستنەوەی ئایین لە دەوڵەت) لە سەدەی بیستەمدا هەڵوێستی دەوڵەت و تاکەکان بەرامبەر ئایین کەمێ هێواش بوویەوە،ئەم گۆڕانەش خۆی دەنوێنێ لە گەڕانەوەی دەستەڵاتی زەمەنیدا بۆ کڵێسای کاپۆلیکی لە ساڵی (١٩٢٩ز)دا ئەمەش بە بنیادنانەوەی دەوڵەتی ڤاتیکان وەك یەکەیەکی سیاسی دوای ئەوەی ویلایەتە پاپەویەکان لە مەملەکەتی ئیتالیا هەر لە ساڵی (١٨٧٠ز)ەوە

تێکەڵاوبوون. هەروەها ئەو گۆڕانە خۆی دەنوێنێ لە ڕێگەدان بە بەرپاکردنی ئامانجە سیاسیەکانی مەسیحیەت لە چەند دەوڵەتێکی ڕۆژئاوادا.

پێش لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی دەرکەوتنی عەلمانیەت گرنگ ئەوەیە ڕوونکردنەوە بدەین لەسەر عەلمانیەت کە مەزهەبێکی دژە ئایینیە وەك پێشوتر وتمان لە نێو کۆمەڵگەیەکدا دەرکەوت کە ئایینی مەسیحیەت تیایدا زاڵ بووە، هەروەها دژایەتی عەلمانیەت عەلمانیەت بۆ مەسیحیەت بەڵگەو بیانووی خۆی هەیە،چونکە هەر ئایینێك دوولایەنی سەرەکی و بنەڕەتی هەیە، یەکەمیان پەیوەستە بە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و مرۆڤەوە (واتە نێوان خودی مرۆڤەکان) کە پێی دەوترێ (موعامەلات) (پێکەوەجوڵانەوەکان).

ئەگەر بمانەوێت مەسیحیەت وەك ئایینێك و توانای کارگێڕی بۆ کاروباری ژیان بخەینە ڕوو دەبینین مەسیحیەت بۆ لایەنی یەکەم ڕێکخستنێکی ڕوونی هەیە سەرەڕای هەندێ

ئاماژەی جیاجیا لەملا و لەولێوە، بەڵام مەسیحیەت بەرنامەیەکی تەواو و پڕاوپڕی نیە بۆ کارگێڕی و کاروباری ژیان، بۆیە دانانی مەسیحیەت وەك بەرنامەیەکی ژیان لە سروشت و توانا و سەلاحیاتی ئەو ئایینە نیە.

دەی ئەمە لە ڕۆژئاوادا ڕویدا، واتە پیاوانی ئاینی هەوڵیاندا مەسیحیەت وەك ڕێبازی پەیڕەو بکەن کە سەرکردایەتی دەوڵەتان و جوڵەو بزاوتی دنیای بەدەست بێ، لەبەر نەبوونی پێکهاتەی لەباری بۆ هەستان بەو ڕۆڵە،جۆرێ لە دەستەڵات و فەرمانڕەوای بەرپابوو کە پێی دەوترێ فەرمانڕەوایی (ثیوقراتی) بە پێیە پیاوانێکی ئاینی فەرمانڕەوای دەوڵەت دەکەن کە بانگەشەی ئەوە دەکەن لەسەر بنەمای فەرمان و ڕێگری خوای گەورە فەرمانڕەوای دەکەن و پەیوەندییان بە ئاسمانەوە هەیە و زانستی تەواو تەنها لای ئەوانە، ئەوان خاوەن و پەیڕەوکەری زانستی خودایین. پیاوانی ئایینی بۆ چەندسەدەیەك (سەدەکانی ناوەڕاست) بەو جۆرە فەرمانڕەوای

ئـەوروپایان کـرد و لـەوماوەدا تـاریکی و نـەزانی و داخـران و دواکەوتووی هەموو بەشەکانی ئەوروپای گرتبووەوە.

لەگـەڵ سـەرەتای بێداربوونـەوە و ڕاچـڵەکانی عـەقڵی ئەوروپیدا بۆی دەرکەوت ڕێی ڕاپەڕین وهەستانەوە پەیوەستە بە کەنار خستنی ئەو ئایینەو پیاوەکانی لە فەرمانڕەوایی دنیا و سەرکردایەتی بزاڤی وڵاتیان.بۆیە لەسەدەکانی پانزەو و شانزەدا دەستیانکرد بە بەهێزکردنی بیروباوەڕی توانا و بەهای عەقڵ لەبەرامبەر دەستەڵاتی (نەقڵ) زانستی ئایینیدا کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا زاڵ بووە.مێژووی ئەو عەقڵەی کەلە سەدەی حەڤدەدا دەستی پێکرد لەگەڵ گەیشتنی بەو بڵاوی و باڵاو دڵێریە — لە جیاکردنەوەی ئەو ئایینە و پیاوەکانی لە دنیاو کۆمەڵگەکانی خەڵك تا یەك لە دوای یەك پێوەرو یاسا دابنێ بۆ ڕێکخستنی ژیانی خەڵك، بارەکە لەسەدەی هەژدەدا بەو جۆرە بەردەوام بوو،بەڵام دوای بەهێزبوونی شانو شکۆی ئەو عەقڵە زاڵبوو بە سەر پێوەرەکانی ڕێکخستنی ژیانـدا، سەدەی نـۆزدە

دروخستنەوەی ئەو ئایینەی لە دەوڵەت بە خۆوە دی و پیاوانی ئایینی مەسیحی لە کۆڵگە دورخستەوە و بۆ چەند ئەرکێکی ڕەسمی ناردنی بۆ دەوڵەتانی دیکەو و چەند ناوێکی بۆ ئەو ئەرکانە دانا، موژدەبەری ڕۆژهەڵاتناسی، بۆیە سەدەی نۆزدە لە ئەورووپادا بە سەردەمی ملهوڕی ناسراوە.

ب:هۆکارەکانی دەرکەوتنی عەلمانیەت:چەندین هۆکار بوونە هۆی دەرکەوتنی عەلمانیەت، دەکرێ هەموو ئەو هۆکارانە بگێڕنەوە بۆ سێ هۆکاری سەرەکی:

یەکەم: کڵێسا وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی مەعریفەو دەستەڵاتی ئاراستەو ڕێنمایی بەخشین متمانەی لەدەستدا.

دووەم: گەشەسەندنی لێکۆڵینەوەی زانستی دژ بە هزری ئایینی کڵێساو دڵخۆشی خەڵك بەو ئەنجامەی کە لە تێگەیشتن و درکیانەوە نزیك بوو.

سێیەم: ئەورووپاییەکان هەڵوێستی دژایەتییان بەرامبەر ئایین و پیاوانی ئایینی گرتەبەر.

یەکـــەم: کلێســـا وەك سەرچـــاوەیەکی مەعریفـــە متمانـــەی لەدەستدابوو.

چەندین زانای مەسیحی و ڕەخنەگری مەوزوعی کە خاوەن بیری ئازاد بوون کەوتنە ڕەخنە گرتن لە بیری کلێسایی، ئەو ڕەخنـەش کە ئاڕاستەیان دەکرد ئەمانەی دەگرتەوە:

١. سەرچـاوەو دەقـە پیرۆزەکـانی مەسـیحیەت: سەرچـاوەکانی مەسیحیەت بریتین لە چوار ئینجیلەکە، چواردە نامەکەی پـۆڵس، کارەکـانی پێغەمبـەرو نێـردراوان ئـەو سـیانە پێیـان دەوتـرێ سـەردەمی نوێ(العهـد الجدیـد)، بەویژدانـە مەسـیحیەکان پـاش لێکۆڵینەوەی مێژوویی و بەراوردی ئینجیلەکان یەکدەنگن لەسەر ئـەوەی شـتێکی نـەگونجاوە ئینجیلـەکان سروشـتی خـوایی بـن، ئەمەش لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

ا-نەزانینی ئەومێژووەی کە ئینجیلەکانی تێدا نوسراوە.

ب:نەزانینی یەکەم زمان کە ئینجیلەکانی پێنوسراوە.

ج-نەزانینی ئەو کەسانەی ئینجیلەکانیان نووسیون ئایا حەواری مەسیح بوون یان کەسانێکی دیکە بوون کە ناوەکانیان ؟

د-نەزانینی ئەو سەرچاوەی کە لێوەی وەرگیراون ئایا لە خودی مەسیحەوە (علیەالسلام) بووە؟ یان نوسخەی ون بوون ؟ یان تۆماری گێڕانەوەی زارەکین؟

٢. ئەو بیروباوەڕەی کڵێسا پێیگەشتبوو و هەوڵیدەدا بیسەپێنێت بەسەر خەڵکدا وەك خوایەتی مەسیح و تاوانی بۆ بەجێماو.

٣. نهێنییە کڵێساییەکان و ڕێوڕەسمەکانی پەرستش: لەوانە کردنی سێ خوا بەیەك.

٤. پایەی پیاوانی ئایینی (ئیکلیروس) لە بنیادی کڵێساییدا: وەك مافی بێبەشکردن لە ڕەحمی خوایی و پاککردنەوە لە تاوان بە داننان بە تاواندا لەبەردەمی پیاوانی ئایینیدا و بیروباوەڕی ڕزگاربوون لە ڕێی پێشکەشکردنی قوربانی و نێوەند بوونی پیاوانی ئایینی و مافی دەرکردنی نەفرینە خوداییەکان بۆ کەسانێ ئامادە نەبن دەیەکی سامانیان بدەن بە کڵێساو بێتوانایی هەرکەس بۆ نووسینی وەسیەتی و جێبەجێکردنی

مەگەر بە ئامادەبوونی قەشەیەك تا لە میراتدا پشك و بەشداری هەبێت.

٥. بەکەمڕوانینە عەقڵی خەڵك لەلایەن کڵێساوە وەك لەگاڵتەجاڕی فرۆشتنی پسوولەی لێخۆشبوون و بانگەشەی گۆڕانی عەشای خوایی بۆ گۆشت و خوێنی مەسیح ڕوویدا.

٦. ڕاڤە نامۆکانی بۆ ڕاستی شتەکان.

دووەم:گەشەسەندنی لێکۆڵینەوەی زانستی دژ بە بیری کڵێسایی:

لەوهۆکارانەی بوونە تاقیکردنەوەی سەخت بۆ کڵێسا، ئەو لێکۆڵینەوە زانستیانەبوون کە چەند ڕاستیەکی گەردوونی زۆرگرنگیان لێکەوتەوە و لە ڕاستیدا پشکیان هەبوو.

لە پێشەوەی ئەو بیردۆزانەدا بیردۆزەی گەردوونی (کۆپەرنیل ١٥٤٣ز) دێت کە لە کتێبەکەیدا (حركة الاجرام السماوية) بڵاوی کردەوە و دەیوت گەردوون مەڵبەندی گەردوونە و زەویش بەدەوری زەویدا دەسوڕێتەوە، هەسارەکانی دیکەش بەدەوری

خۆردا دەسوڕێنەوە، ئەم بیردۆزەیە وەك موشەكێك وابوو كە لە نێو پەیكەری پەیكەری كڵێسادا بتەقێتەوە و كڵێسای خستە بەردەم ئاڵۆزترین كێشە لە مێژووی ناوەڕاستیدا.كڵێساش خێرا كۆپەرنیكی گرت و خستیە بەردەستی دادگاكانی پشكنین لە كاتێكدا لە تەمەنی پیریدا بوو. پاش كەمێك خوا كەسێكی دیكەی هێنایە ڕێیان كە سەرلەنوێ بیردۆزەكەی كۆپەری دەخستە ڕوو ئەویش بریتی بوو لە (جردانوبرونو) ئەویشیان بە هەمان دەردی ئەوی پێشو برد.

پاشان زانای گەردونناس (گالیلۆ) بیردۆزەی گەردوونی پێشووی گرتە بەرو هەنگاوێ فراوانتر بەرەو پێشەوەی برد، گالیلۆ ئامێرە مەترسیدارەكەی داهێنا (تلسكۆب) و بە شێوەی كرداری و ئەزموونی پشكیری بانەگەوازەكەی پێشووی كۆپەرو برۆنۆی كرد. خێرا كڵێسا ئەویشی گرت و خستیە بەردەستی دادگا، گالیلۆ لە ساڵی (١٦٤٢ز) مرد. لە هەمان ساڵدا (ئیسحاق نیوتن) لەدایك بوو تا لە دۆزینەوەی چەند ڕاستیەكی نوێدا كە

خوا لە نهێنی گەردوونی فراوانیدا دایناوبوو درێژە بەو ڕەوتە بدات. لەسەر دەستی نیوتن یاسای ڕاکێشان ناسێنرا کە دەنگدانەوەی خۆی هەبوو و ڕوداوێکێکی گەورەی وابوو کە پیاوانی ئایینی و کەسانی دیکەی خاوەن پشکی ڕۆشنبیری لە چینەکانی دیکەش لەبەردەمیدا سەرسام وەستان. لەوکاتەی کە نیوتن بیردۆزەی ڕاگەیاند، لێکۆڵینەوەکان گەیشتبوون بە بیردۆزەکەی کۆپەرنیك و برۆنۆ و گالیلۆ و لێی دڵنیاو بێ گومان بوون. بۆیە سەرکەوتنەکەی نیوتن بڕوای دوو بەرامبەر بوو،متمانەی خەڵك بۆ دۆزینەوەکانی زانایان زیادی کرد و دارمانی کڵێسایش زیادی کرد و یەك لەدوای یەك پێناسەکانی لە پەلوپۆ دەکەوتن. لەگەڵ ئەوەی نیوتن بڕوای بە خوا هەبوو بەڵام کڵێسا لەگەڵی جەنگان و چەوساندنیانەوە و وتیان (بیردۆزەکەی دەبێتە هۆی نکوڵی لە یارمەتی خوا) کڵێسا لەو پێشبینییەیدا ڕاستی کرد بەڵام ئەو ڕاستکردنەی بەرامبەر بە کەمتەرخەمی ملەجیرێی لەوبوارەدا دادی نەدا.

ئەگەر کڵێسا ئەو دۆزینەوانەی لە بواری بانگەواز کردن بۆ ئیمانـدا بقۆسـتایەتەوەو بیتوانیایـە پەیوەنـدی نێـوان ئـەو یاسـایانەو نێـوان توانـا و دانـایی و خـودایی بخاتـە ڕوو بـە دڵنیاییەوە ڕێرەوی مێژووی ئایینی لە ئەوروپا دەگۆڕدرا. بەڵام کڵێسا پەنای بردە بەر دەستبەسەراگرتنی بیرو هزرەکەو ئەوەش لەبەردەم ڕاستی دۆزینەوەکان و دەرکەوتنی شوێنەوارەکانیاندا هیچی دەست نەکەوت.

لێرەدا کڵێسا متمانەی خۆی تا ئاستێکی بەرچاو لە دەستدا و خـەڵکی بە گشتی و ڕۆشنبیران بە تایبـەتی پـەنایان بردەبـەر چەند سەرچاوەیەکی نویێ بۆ وەرگرتنـی مەعریفە و ڕوویـان لـە کڵێسا وەرچەرخاند و خۆری کڵێسا بەرەو ئاوابوون چوو.

لەسەدەی حەڤدەدا بیردۆزەی زانستی دژ بە کڵێسا تەواو بوو و بـە هـەموو نێوەندەکانـدا بڵاوبوویـەوە و چـەند ئـەنجام و ئاڕاستـەیەکی زۆر گـرنگ و مەترسـی لێکەوتـەوە. برترانـد راسـل لەم ڕاستیانەی خوارەوە پوختی کردوونەتەوە:

١-دانپێدانانی ڕاستیەکان پێویستە لەسەر تێبینی و ئەزموون بێت نەك لەسەر گێڕانەوەی بێ پاڵپشت(واتە دەقە ئایینیەکان).

٢-جیهانی نازیندەوەری - بەستووەکان بۆ خۆی کارلێك وپێشخەرە، هەموو ئەو گۆڕانانەش کە تیایدان لەگەڵ یاساکانی سروشت جێبەجێ دەبن.

٣-زەوی مەڵبەندی بوون نیە و مرۆڤیش لەوانەیە ئامانج لە بوونی زەوی نەبێت ئەگەر بوونی هەر ئامانجێکی هەبێت، لەسەرو ئەمەشەوە بیرۆکەی ئامانج لە ڕووی زانستیەوە هیچ سوودێکی نیە.

سێیەم:ئەوروپیەکان بەرامبەر ئاین و پیاوانی ئایینی هەڵوێستی دژایەتیان گرتەبەر:

پەرچەکرداری کڵێسا بەرامبەر دۆزینەوە زانستیە نوێکان گەورەترین هۆکاری ئەو دژایەتیە بوو، بەڵام چەند هەڵەیەکی دیکەی کڵێسا بوونە هۆکاری بێزاری هەستی ئەوروپیەکان بەرامبەر کڵێسا و پیاوانی کڵێسا، لەوانە:

١-هاوپەیمانی کڵێسا لەگەڵ ئەوانەی کە ستەمیان دەکرد لەگەڵی.

٢-دادگاکانی پشکنین و بەندینخانەکان و بڕیارەکانە بێبەشکردنی تاکە کەسی و بە کۆمەڵ لە ڕەحمەتی خوایی کە کلێسا دەریدەکردن. هەروەها گاڵتەجاری پسوڵەی لێخۆشبوون.

٣-چەوساندنەوەی کەمینەکان لە خۆی دەنواند لە شەڕی پرۆتستانت و کاپۆلیك و چەوساندنەوەی جولەکەکاندا.

سەبارەت بە پەرچەکرداری کلێسا بەرامبەر عاقڵان و خاوەنانی داهێنانی زانستی ئەوەبوو کە لە بەردەم ئەو گۆڕانکاریە مەترسیدارانەدا دەستەوەستان نەوەستا، بەڵکو لە دوو بەرەوە بەرنگاریان بوویەوە.

یەکەم: بۆ یەکەمجار ئەو لیستە پاپەویانە دەرکەوتن کە تیایاندا ناوی ئەوکتێبانە هاتبوو کە خوێندنەوەو گرنگی پێدانیان حەرام بوو، ئەوانەش ئەو کتێبانە بوون کە تۆمارو شیکاری بیردۆزە زانستیە نوێکانیان لە خۆ دەگرت وەك

بیروڕاکانی گالیلۆ و نیوتن و کتێبی دیکەی زانایان، هەرکەس یەکێ لەو کتێبانەی پێ بگیرایە بەبێ ڕەحم پێکردن دەدرا بە دادگاکانی پشکنین.

دووەم: بە دواکەوتنی زانایان و زۆرچوون لە سزادان و چەوساندنەوەیاندا بە هەمووشێوازێك. ئەمانەش چەند ئەنجامێکیان لێکەوتەوە کە لە بەرژەوەندی کڵێسادا نەبوون. بەڵکو توندی نێوانیان و نێوان خەڵکیان زیاتر کردو لە هەموو لایەکەوە دەنگی ناڕەزای سەرکەشی کڵێسا بەرزبوویەوە.

دۆزینەوە زانستیەکان بەشدارییان کرد لە داهێنانی بیرێکی نائایینیدا کە سەرەتا لاواز بوو دواتر ڕۆژبەڕۆژ بەهێز دەبوو تا لە ئەنجامدا دوو ئاراستەی گەورە دەرکەوتن کە هەریەکەیان بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئەو تاکە سەرچاوەی مەعریفەیە لە دوای ڕووخانی کڵێسا لەو بوارەدا. دوو ئاراستە نوێکەش بریتیبوون لە:

یەکەم: ئاراستەی عەقڵی یان دەسەڵاتداری عەقڵ.

دووەم: ئاراستەی وەچعی یان دەسەڵاتداری هەست.

ئـەو دووو ئاڕاسـتەش ڕیشـەو تـوێی بـوون بـۆ داری پیسـی عەلمانیەت.

### * ئاڕاستەی عەقلی:

دەرکـەوتنی ئـەو ئاڕاسـتەیە پەرچـەکردارێکی ڕاسـتەوخۆ بـوو بەرامبەر لەدەستدای متمانە لەلایەن کڵێساوە بەو پێیەی خۆی بە تاکە سەرچاوەی مەعریفـە دادەنا، ئـەو مـاوەی کـە ئـەم ئاڕاسـتە عەقڵیـەی تیـا دەرکـەوت لـە مێـژووی فەلسـەفەی ئەوروپیـدا پێـی دەوترێ سـەردەمی ڕۆشـنگەری، ماوەکەشـی بریتیبـوو لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی هـەژدە. لـەوماوەدا دژایـەتی ئـایین بەسـەر بیری عەقڵیـدا زاڵبـوو دوای ئـەو شکسـتە توندەی تووشـی کڵێسـا بـوو لەبەردەم ئــەو گۆڕانکاریــە کتوپڕانــەدا کەلــە مەیــدانی هــزری ئــەو کاتــەدا دەرکەوتن.ئـەو دیـدەی کـە فەلسـەفەی عـەقڵی یـان وەك نـاوی لێنـرا فەلسـەفەی میپالی لەسـەر دەوەستا. تـەنها عـەقڵ تاکە سەرچاوەی دڵنیاو دروسـتی مەعریفەیـەو مـافی هەیـە سەرپەرشـتی هـەموو ئاڕاسـتەکانی

ژیـان بکـات لەوانـەش سیاسـەت و یاسـاو ئاکـارو ڕەوشـت و ئـایین، مرۆڤایەتیش ئامانجی ژیانە بۆ هەموان، خوا یان کۆمەڵگەی تایبەت یان دەوڵەت ئامانج نیە.

ئـەم ملهوڕییـە چـەند بانگـەوازکارو پشـتیوانێکی هـەبوو لەوانـە: ڤـۆلتێر لـە فەڕەنسـا(١٦٩٤ز-١٧٧٨ز) ڕۆسـۆ(١٧١٢ز-١٧٧٨ز)بیلی و لامتری، بارکلی وولف لە ئەڵمانیا، لسنج ولوك لە ئینگلتەرا، دیکارت(١٥٩٦ز-١٦٥٠ز)و هۆبز.

جێـی باسـە بڵاوبوونـەوەی دیـدی عـەقڵی و هـەڵگران و بـانگخوازانی و دوژمنایـەتییان بـۆ کڵێسـاو دەسـتەڵاتی کڵێسـا هاودەم بوو بە هاوڕایی دروشمەکانی شۆڕشی فەڕەنسیدا، ئەمـە بوویـە هـۆی لـەدایکبوونی یەکـەم حکومـەتی نائـاییینی فەڕەنسـی لەسـاڵی(١٧٨٩ز)دا. ئەمـە جـەخت لەوەدەکاتـەوە کـە سـەرکردەو فەیلەسـوف و وتاربێـژانی شـۆڕی فەڕەنسـی بانگەشـەکەرانی عەقڵانیەتیش بوون، بۆ نموونە جان جاك ڕۆسۆ کتێبی پـەیمانی کۆمەڵایـەتی هەیـە کـە بـە ئینجیلـی شـۆڕش دادەنـرا، میرابـۆ بـە وتاربێژو سـەرکردەو فەیلەسوفی شـۆڕش سـەیر دەکرا، ڤۆلتێرو

جگە لەوانیش،(١٦)، دوروشمی شۆڕشی فەرەنسی ئەوەبوو (کۆتا پاشا بە ملیوانی کۆتا قەشە لەسێدارە بدەن) بەمە شۆڕش هەڵەی بەهەڵەیەکی دیکە چارەسەر دەکرد.

* ئاراستەی وەزعی:

به کۆتایی هاتنی سەدەی هەژدە پاش نزیکەی نیوە سەدە سەردەمی ڕۆشنگەری عەقڵی کۆتایی پێ هات، هەڵوێستی بەرامبەر بە ئایین (مەسیحیەتی کاپۆلیك) دوو فاقە بوو، هەیانبوو لەدژایەتی بوو لەگەڵیدا وەك دیکارت، هەیانبوو زیاتر دەچوو وەك ڤۆلتێر، بەهەر حاڵ سەردەمی ڕۆشنگەری عەقڵی سەرکردایەتی و ئاراستەی لەدەست ئایین سەند و بانگەشەی ئەوەی کرد کە تەنها عەقڵ سەرچاوەی ڕاستی مەعریفە و جگە لەوە هیچی دی نیە.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە لەمەیدانەکەدا ڕکەبەرێکی مەترسیداری ئایین وعەقڵیش دەرکەوت کە لە پێش سەدەی نۆزدەشدا بوونی هەبوو بەڵام لە مەزهەبێکی خاوەن فەلسەفەی

تایبەت لە نێو مەزهەبە فەلسەفیەکانی ئەوروپادا دەرنەکەوتبوو تا لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا دەرکەوت، ئەویش بریتیبوو لە ( دەسەڵاتداری هەست) یان(وەچعی بوون) وە ئەو ناوەی لێی نراوە و بەوە ناسراوە.

هەڵگرانی ئەم مەزهەبە دەڵێن ئایین و عەقڵیش لەڕێی هیچکامیانەوە ناتوانین بگەین بە مەعریفەی دڵنیایی بەڵکو تاکە سەرچاوەی مەعریفە بریتیە لە ئەو تێبینی و ئەزموونەی کە مادده بابەتی و تایبەتمەندیە جیاجیاکانیەتی و ڕێگە یان پێناوەکانیشی پێنج هەستەکەن، هەرچیەك لە پێنج هەستەکە هەستی پێبکەن ئەوە بوونی هەیە، هەرچیەك هەستی پێنەکەن بوونی نیە و تەنها هەڵخەڵتاندن و خەیاڵ وناڕاستیە.

* بانگەوازانی وەضعیەتی ماددی:

ئەم مەزهەبە دەدرێتەوە پاڵ فەیلەسوفی فەڕەنسی ئۆگست کۆنت لەسەدەی نۆزدەدا (١٧٩٨ز-١٨٥٧ز) پێش کۆنت ئەم مەزهەبە لەسەر فەیلەسوف فرانسیس بیکۆن (١٥٦١ز-١٦٢٦ز)

فەیلەســـوفی ســـکۆتلەندی هیـــوم(۱۷۱۱ز-۱۷۱٦ن)وســـان ســـیمۆن(۱۸۱۳ن) بنـــەماو تـــۆیی خـــۆی چـاندبوو، بـــەڵام لەســـەر دەســـتی کۆنـــت چەســـپا، پـــێش خـــۆی بـــە مەزهـــەبی ئـــەزموونی ناسرابوو، بەڵام لەسەردەمی ئەودا بە مەزهەبی وەضعی ناسراو ئەو دیدە ماددیانەی کە دواتر دێن وەك ماددیەتی مشتومڕی یان ماددیەتی شیوعی دەگەڕێنەوە بۆ ئەو.

ئەو بنەڕەتەی کە کۆنت ئەو مەزهەبەی لەسەردانابوو ئەوە بوو کە وەك (فندلبند) لە لێدوانیدا لەسەر فەلسەفەی کۆنت وتوویەتی ڕوانیویەتیـــە مێـــژووی مەعریفـــەی مرۆیـــی و لـــەوەوە بـــۆی دەرکەوتووە کە بە سێ قۆناغدا تێپەڕبووە:

یەکەم:تیایدا سەرچاوەی معریفە ئایین یان سروشتی خوایی بووە.

دووەم: سەرچاوەی مەعریفە تیایدا میتافیزیقا یان عەقڵ یان فەلسەفەی میپالی بووە.

سێیەم: سەرچاوەی معریفە تیایدا واقعیەتە.

ئەم سیانەیەش کۆنت داینا تا ببێتە یاسایەك بۆ پشگیری ئەو مەزهەبە وەضعیەی کە دەڵێت ماددەی سروشت و کاری تێبینی وئەزموون تیایدا بە تەنها دەتوانن بتگەیەننە مەعریفەی دروست، نەك ئایین و عەقڵ.

مارکس دوای کۆنت فەرزە گەشەسەندووییەی گرتەبەرو لە مەیدانی ئابووریدا جێبەجێیکرد وەك چۆن کۆنت لە مەیدانی مەعریفەدا جێبەجێیکرد.

وەضعیەکان چەند هۆکارو بیانوویەك دێننە بەرباس بۆ سەپاندنی مەزهەبی وەضعي وەك تاکە سەرچاوەی مەعریفە.لەو هۆکارو بیانوانەش بریتین لە:

١. شکستخواردنی کڵێسا لە پێشکەشکردنی ڕاڤەیەکی دروست بۆ مەعریفە و داکەوتنی ئەو مەعریفەی کە بە درێژای ماوەی دەستەڵاتی گرتبوویە بەر.

٢. شکستخواردنی فەلسەفەی عەقڵی میپالی و مایە پوچ بوونی لەوەیدا کە بانگەشەی بۆ دەکرد،چونکە فەلسەفەی عەقڵی میپالی

هــــەوڵی دەدا ئـــایین- كڵێســـا- لــە ئاڕاســـتەكردنی مرۆیــــی دووربخاتــەوە، بـەڵام سـەرلەنوێ لەسـەر دەسـتی چـەند كەسـێكی دیاری وەك (هیگل)گەڕایەوە بۆ پاڵپشتی سروش و ئایین.

دواجـار فەلسـەفەی وەچـەی گەیشـتە چـەند ئـەنجامێكی تـەواو مەترسـیدار، ئـەوە نكـوڵی كـرد لــە بـوونی خوا(دروسـتكەر)، بانگەوازی كرد بۆ ئەوەی زانستی وەچەی هەستی شوێنی لاهوت بگرێتـەوە، ئامـانجی مـرۆڤ لەبری (خـودا) مرۆڤایـەتی بێت، ئـەوە عەلمانیــەت بــوو لــە كۆتــا شــێوەیدا. پــاش ئــەوەی پێشــتر (جیاكردنــەوەی ئــایین بــوو لــە دەوڵــەت و سیاســەت )بووبــە (جیاكردنەوەی ئایین لە ژیـان) دواجاریش بوو بـە (لـەناوبردن و دژایەتی كردنی ئایین).

**( گواستنەوەی بیری عەلمانی بۆ ڕۆژهەڵات و گەشەسەندنی ئەو بیرە )**

ئەوعەلمانیەتـە لەسـەرەتای سـەدەی نـۆزدەدا گوازرایـەوە بـۆ ڕۆژهەڵات و بە شێوەیەكی بنەڕەتی گوازرایەوە بۆ میسرو توركیا و ئێران و سوریا و تـونس و لـە كۆتاییـەكانی سـەدەی نۆزدەشـدا

عێراقی گرتەوە، سەبارەت بە دەوڵەتانی دیکەی عەرەبیش ئەو عەلمانیەتە لەسەدەی بیستەمدا گوازرایەوە بۆ ئەو وولاتانە.

ئەگەر لەکارخستنی حوکم کردن بە شەریعەتی ئیسلامی بکەین بە پێوەر بۆ بەرزکردنەوەی دروشمی ئاشکرای عەلمانی و زاڵبوونی هێزی عەلمانی بە سەرگەورە کاربەدەستانی دەوڵەتاندا،ئەوا دەکرێ ئەم مێژووانە بگرینە بەرچاو:

١-لە ساڵی ١٨٣٠زدا جەزائیر حوکم کردن بە شەریعەتی ئیسلامی لەکارخست.

٢-لەساڵی ١٨٨٣زدا خدێوی ئیسماعیل یاسای فەڕەنسی هێنایە ناو میسر.

٣-لەساڵی ١٩٠٦زدا یاسای فەڕەنسی چوویە ناو توونس.

٤-لە ساڵی ١٩١٣زدا مەغریبیش بەدەردی ئەوان برا.

٥-سەبارەت بە تورکیا و سوریاو لوبنانیش پاش هەڵوەشاندنەوەی خیلافەت لەساڵی ١٩٢٤زدا بەرگی عەلمانییان پۆشی.

ئەمە لەگەڵ لەبارچاوگرتنی ئەوەی پێش ئەوەی عەلمانیەت دەست بگرێت بەسەر وڵاتدا ماوەیەك بوون و بڵاوبوونەوە و گەشەسەندنی هزری عەلمانی لە سەدەی نۆزدەدا هەبوو، هەندێ لە بیریارانیش ئەو گواستنەوەیە بەوە ڕاڤە دەکەن کە عەرەب لە هەموو شتێکدا ڕێنسانسی عەرەبی و ڕێنسانسی ئەورووپییان پێکەوە پەیوەست دەکرد. بۆیە بەو شێوەیە داهاتووشیان پەیوەست کرد بە ئەورووپاوە و لە پێناو ڕێنسانسی عەرەبیدا بەرەو تێڕوانینی ڕۆژئاوایی عەلمانی چوون لەسەر هەردوو ئاستی هزری و سیاسی.

عەلمانیەتی هاوردەی ئەوکات لە دوو ئاڕاستەی سەرەکیدا خۆی دەنواند ئاڕاستەی ڕۆشنگەری عەلمانی و بزوتنەوەی چاکسازی ئایینی، تەیاری ڕۆشنگەری چەمکی چالاکی(ئەورەبە) ی گرتبوویە بەر بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و هۆشیاری کۆمەڵایەتی لە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی ئەو کاتدا میسرو سوریاو لوبنان.

جالە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا بوترس بوستانی و فارسشدیاق و فرنسیس مراش(١٨٣٨-١٨٣٧)و نەجیب مەدداد(١٨٦٧-١٨٩٩) بانگەوازیان کرد بۆ فێرکردن وئازادی ئافرەت و کاریگەربوون بە باری ئافرەت لە ئەورووپا و ڕۆڵی لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی ئەوێدا. لەساڵی ١٨٦٣زدا بوترس بوستانی و نامیف یازەجی(١٨٠٠-١٨٧١ز) یەکەم خوێندنگەی عەرەبییان لەسەر بنەمای نەتەوەیی نائایینی دامەزراند. لە نیوەی پەنجاکانیشدا بیرۆکەی عەربگەریی لای ڕۆشنگەرەخوازە سووریەکان دەرکەوت لە بانگخوازانی ئەو کاتە بریتی بوون لە ساتع حوسەری بوترس بوستانی و سەلیم بوستانی ئەدیب ئیسحاق و چەندێکی دی.

هەروەك لەو ماوەدا دیدو ڕوانینە ناوچەییە نیشتمانییەکان ورووژان. ئەوانەی کە خۆیان دەنواد لە (نیشتمانیەتی لوبنانی ) لای ئەحمەد فارس شدیاق لە گێڕانەوەو چیرۆکەکەیدا (الساق علی الساق فیما هو الفاریاق) هەروەها (نیشتمانیەتی سوری)لای

بـوترس بوسـتانی لـە ڕێـی بانگـەوازکردنی لـە گۆڤارەکەیـدا (البستان) و ڕۆژنامەی(نفیرسوریە).

سەبارەت بە بزوتنـەوەی چاکسازی ئایینی ئاڕاستەیەکی ئەقڵانی بوو لە ڕوانینی بۆ ئیسلام، ئەم ئاڕاستە لە کرۆکیدا چەند دیدێکی بەر گومـانی کـارابوون، ئـەو بزوتنـەوە گرنگـی دەدا بـە نیشـاندانی توانـای ئیسلام بۆ بە خششی خواستەکانی سەردەمی نوێ.

سـەرەڕای ئـەوەی چاکسـازی ئیسـلامی تێکـەڵ ببـوو لەگـەڵ ڕەگەزو لایەنـەکانی ڕۆشـنگەریدا، بـەڵام چاکسـازی و ڕۆشـنگەری هەمان شت نەبوو، چونکە چاکسازی وایان دەبینی ئایین لـەدوای چاکسـازی دەتـوانێ گەشەسـەندنی پێشـکەوتنخوازی کۆمەڵگـە دەستەبەر بکـات، لـە کاتێکـدا ڕۆشـنگەراکان پێیـان وانـەبوو ئـەو گۆڕانـە ڕووبـدات مەگـەر لەسـەر بنـەماکانی عـەقڵ بـە هاریکـاری مەعریفەکان و ڕۆشنگەری.

شـیاوی باسـە ئاڕاسـتەی پـوختی عـەلمانی ڕۆشـنگەری لەبنەڕەتـدا وەك ئاڕاسـتەیەکی مەسـیحی دەرکـەوت. بـە جـۆرێ هەموو ئەو پشتیوانانەی کە پێشتر باسمان کردن بە شێوەیەکی

بنــەڕەتی لــە مەسـیحییەکان بـوون و دەکـرێ بـە نوێنــەری بـیری مەسیحی سەدەی نۆزدەو بیستەمی دابنێین.

سەبارەت بە پشـتیوانانە بزوتنـەوەی چاکسازی ئایینی کە نیشـینگەی بنــەڕەتی لـە میسـر بـوو و بـە شـێوەیەکی بنـەڕەتی هــەموو پشــتیوانەکانی لـــە موســڵمانان بـــوون، ئەمــە لەگــەڵ (طهطـاوی)دا دەسـتی پێکـرد، ئـەم کەسـە لـە ماستاوچـیەتی و پیاهەڵدانیدا بۆ بیری نەتـەوەیی خۆی نواند و مێـژووی میسـری عەرەبی پێش ئیسلامی پەیوەست کرد بە مێژووی نوێوە و کەوتە بەرزڕاگرتنی مێـژووی فرعـەونی میسـر، بێگومـان پێشـەنگخوازی لە مێـژووی فرعەونییـەوە لـە هـزری ئیسـلامی ئەوکاتـدا شـتێکی نـوێ بـوو، ئەمـەش کاریگـەری گرنگـی دانـی زانایـانی میسـری شـوێنەوارناس بـوو کـە لـە فەڕەنسـا بـوون و گرنگییـان دەدا بـە مێژووی میسری کۆن. دیـارە تـەهتاوی داوای دەکـرد سـەرلەنوێ ئـەو شـوێنەوارانە بگەڕێنرێنـەوە بـۆ میسـر. هـەروەك سەرسـامی خـۆی نیشـاندا بـۆ یاسـای فەڕەنسـا و لـە کتێبەکەیـدا (تغلـیص

الابریز فی تلغیص باریز)هەندێ لەو یاسایەی وەرگێراوە، هاوکات پێی وایە ئەو شارستانییەتە نوێیەی ئەوروپا کە لە سەر عەقڵ وەستاوە هەمان ئەو ئەنجامانە بەدی دەهێنێ کە شارستانیەتی ئایین ڕێنموونی بۆ دەکات. هەروەك لە ڕێی زانین یان بێئاگاییەوە بارسازی کرد بۆ قبوڵکردنی یاسادانانی مرۆیی کە پشتی دەبەست بە عەقڵ. پاشان بە سەرسامیەوە قسەی کردووە لەسەر هەندێ نەریتی کۆمەڵایەتی ڕۆژئاوایی، واتە لەبری ڕەخنە لێگرتنی پێی سەرسام بوو.

بەو جۆرە بۆ یەکەم جار لە جیهانی ئیسلامیماندا وروژاندنی چەندسەر بابەتێ دەستی پێکرد کە پێشتر نەبوون. ئەمەش لە کاتی تەهتاویەوە تا ئەمڕۆ بیرو هۆشەکان دەورووژێنن، ئەو بیرانەش وەك بەدیلێك بۆ دیدو ڕوانینی ئایین لە کۆمەڵگە و مرۆڤ خۆدەنوێنن، یان وەك چەند هزرێك کە دەکرێ بگەن بەوەی کە ڕوانینەکانی ئایین پێی دەگەن و زیان لەوەدا نیە کە خودایی نین و مرۆیین مادەم هەمان ئەنجامیان هەیە،دواتر ئەو بابەتە

هزریە ڕۆژئاواییانە لە هزرێکەوە گۆڕان بۆ بەدیل و داخوازی بەرامبەرەکی و ویستی بەدیهێنەری هەمان ئەو ئەنجامانەی کە ئایین بەدییان دەهێنێ. بەڵام لە ڕێگەیەکی مرۆییەوە نەك خودایی، ئەو دیدە یەککگونجاندنە دوای تەهتاویش زاڵ بوو، عەلی موبارەك(١٨٢٤-١٨٩٣)و عەلی یوسف(١٨٣٦-١٩١٣) و عەبدوڵانەدیم (١٨٤٥-١٨٩٦) و جەمالەدینی ئەفغانیش (١٨٣٨-١٨٩٧) کاتێ لە میسر بوو ئەمانە گەشەیان پێدا تا لای موحەمەد عەبدە (١٨٤٩-١٩٠٥) گەیشتە لوتکە.ئیمام موحەمەد عەبدە لەنێو هزریدا بانگەوازی بۆ شتێ دەکرد کە ڕیشەی نەخۆشی نەبووی. وەك بەرتەسکردنەوەی بواری غەیب لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا تا لەگەڵ دەستکەوت)ە زانستیە ڕۆژئاواییەکاندا ڕێ ببڕێ وەك بەرپەرچدانەوەی موعجیزەکانی پێغەمبەران وەك ئەوەی موسا(علیه السلام) لە چیرۆکی مانگاکەدا مرۆڤی زیندوکردبێتەوە وە یان عیسا (علیه السلام) ئەوەی کردبێ یان لەتکردنی مانگ لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) یان

ڕاڤەی جنۆکە بە میکرۆب و باڵندەی ئەبابیل بە مێشوولەو بەردی (سجیل) بە میکرۆبی پێستی و چەند لێکدانەوەیەکی دیکەی دوو ڕۆژئاوایی.

هـزری ئیسـلامی یەکگونجانـدن لای موحەمـەد عەبـدە لـەو وتەیدا دەردەکـەوێ (ژیـاری نـوێ لەگـەڵ ئیسـلامدا دەگـونجێ و لەگـەڵ ڕەوتـی دواتـردا گەیشـتووە بـەو دیـدە یەککگونجاندنـە کـە لەگـەڵ لـوتفی سـەید(١٨٧٢-١٩٦٣) دەسـت پێدەکات و لەگـەڵ تـەها حوسـەین و ئیسـماعیل مەزهـەرو سـەعد زەغلـول و عـەلی عەبـدوڕەزاق و جگـە لەوانیشـدا بەردەوامـدەبێت تـا دەگاتـە جەرگـەی ئـەو هاوکێشـەی کـە دەبێتـە ووتـەی بنـەڕەتی بـۆی: ئیسـلام لەگـەڵ هـەموو هـاوردەی ژیـاری نوێـدا دەگـونجێ، بـەو واتایەی ئیسلام لەوەوە کە پێوەرێ بێ بۆ پێوانی ئاستی ڕەوایـی ئەو هزرە نوێیانەی لە ژیاری نوێوە بۆمان دێت (لای موحەمـەد عەبـدە) و دەبێتـە بەڵگەیـەك بـۆ ئـەو ڕاوبۆچـوونانەی کـە ئـەو دەستەی بیریارانە حەزدەکەن لە ژیاری ڕۆژئاواوە بیانهێنن لەگەڵ

ئەو نەوەو دەستەیەدا بزاڤی قبوڵکردنی نیمچە تەواوی هزری عەلمانی ڕۆژئاوایی دەستی پێکرد.بەو جۆرە ڕاپەڕینی عەرەبی لەسەدەی دووەمیدا (سەدەی بیستەم) گەیشتە عەلمانییەتی نیمچە تەواو بۆ ڕەوتە چاکسازیەکەی. ئەمە دوای ئەوەی پێشتر عەلمانیەت بەشێوەیەکی گشتی لەڕەوتە ڕۆشنگەرییەکەی دیکەیدا هەبوو، ئەمە دەنگۆی ڕەسمی خۆی هەبوو کە لە دەستووری ١٩٢٣زدا خۆی نواند، ئەو دەستوورەی کە زاڵبوونی یاسایی بۆ ئاڕاستەی عەلمانی لە میسرو کۆتایی هێنان بە خیلافەتی ئیسلامی لە ساڵی (١٩٢٤)زدا نواند. ئەمەش جەختکردنەوە بوو لەسەر زاڵبوونی عەلمانی بەسەر وڵاتانی ئیسلامیدا.

لە ئەنجامی ئەوەشدا ڕەشاباو گەردەلوول نێودەوڵەتی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی بە سەختی پەکخست ئەوە بوو دوای ئەوەی جەنگی جیهانی یەکەم لە نێو دەوڵەتانی ئیسلامیدا یەك دەوڵەت نەما کە خاوەن بڕیاری خۆی بێت.

بەڵکو هەموو کەوتنە ژێر دەسەڵاتی دەوڵاتانی ڕۆژئاوا، تورکیایش لە ئیسلامی بوونی شۆڕایەوە و بە هەموو هێزێ دژایەتی ئیسلام کرا.

حەز دەکەم ئەوە ڕوون بکەمەوە ئەو زانایانەی کە پێشتر باسمان کرد هەرگیز مەبەستمان ئەوە نەبوو زیان بگەیەنن بە کۆمەڵگەکانیان، بەڵکو بە پێچەوانەوە مەبەستیان بوو چاکسازی تێدا بکەن و سەر پێی بخەنەوە.بەلام ڕێگەیەکیان هەڵبژارد کە نەیانزانی تا چەندە ڕەنگدانەوەی پێچەوانەی دەبێ لەسەر ولاتیان بە تایبەت ئەو کاریگەریە دوای چەند دەیەیەك دوای مردنیان ئینجا دەرکەوت، چونکە پلە بە پلە سەرکەوت و بلاوبوویەوە، ئەمەش لەئەنجامی پەراگەندەیی ڕۆشنبیری هزری ڕۆژئاواییدا ئایا بە خراپە بێت یان بە چاکە. واتە لە ڕووی هەوڵی بە جێگەیاندنی یان سەلماندنی هیچیەکەی تائەوەی دوای ئەو ماوە مێژوویە بوو بە بنەڕەتێ بۆ جەختکردنەوەی هۆشی عەرەبی و ئیسلامیش، ئیدی ئەو هزرە زالْ و

دەستەڵاتداربوو و هێزی ئیسلامیش بوو بە تۆمەتبارو بەرگری کارو لە نیشتمانی خۆیدا نامۆ کەوت. ئەمە ئەو هەڵەیە بوو کە بەبێ مەبەست ئەو زانایانە تێیکەوتن، جا لە بری ئەوەی تێڕوانینی ژیاری ئیسلامی بۆ مرۆڤ کۆمەڵگە دیاری بکەن کەوتنە وەرگرتنی بەڵگەی ئیسلامی بۆ بەرگری کردن لە چەند گومانێکی ناو بنەڕەتی ڕێنیسانسی هێزی و زانستی ڕۆژئاوا، بۆیەنەوینە بەڵگەی ئیسلامی هەوڵێ نبوو بۆ دانانی بنەڕەتەکانی بنیادی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان بە پێی ڕێرەوی ژیاری ئیسلامی، بەڵکو لە پێناو بەرگری کردن لێی بوو، ئەوەش شاراوە نیە کە هەڵوێستی بەرگریکار لایەکی نەك بە گشتی هەستکردنە بە کەمی. تەنانەت ئەگەر هەستەکەش شاراوە بێتهۆکاری دیاریش ئەو چەقبەستوویيە ژیارییە بوو کە ئەو کات لەسەری بووین، ئەمەش لەچاو ئەو پێشکەوتنە ژیارییەی کە ئەوکات ڕۆژاوای تێدا بوو، بۆیە هەمیشە کەسی شکستخواردوو لەڕووی ژیاریەوە سەرمەستە بەخۆچواندن بە لایەنی زاڵبوو، بەو جۆرە هێزی

ڕۆژاوایی لەوماوەدا بە چاکە یان بە خراپە مەڵبەندی بزاڤی بیریارانی نیشتمانی بوو. بۆیە هەموویان بیانویان هەیە، بەڵام بەبێ ویست دەروازەیەکیان کردەوە بۆ ئەو هزرە ڕۆژئاواییە کە خێرا بڵاوبوویەوە تا ئاستێ هەموو مەنهەجە هزریەکانی دی لەخۆگرت و بارەکە لەهەوڵی هاتنە ژووری عەلمانیەت و و مۆرکی هزری ئەوروپی لەدەستەیەکدا یان لەچواچێوەیەکی ئیسلامی خاوەن مۆرکی ڕۆژئاواییەوە گۆڕا بۆ گواستنەوەی ئاشکرای و دواتر ڕاگەیاندنی وەك نیزامی ڕەسمی دەوڵەت، دواتر بۆ دژایەتی هەرچەمکێکی دیکەی ژیاری، وەك ئێستای زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی.

سەرچاوە: التیار العلمانی الحدیث و موقفه من تفسیر القران الکریم، الطبعة الأولی، دارالبشائر، القاهرة، سنة١٤٢٩، ص٤١-٦٣



# عەلمانیەت و بۆ چون و هەڵوێستی بەرامبەر بە ئیسلام و موسوڵمانان

نووسینی: م. محمد مەلا محمود



لەوەتەی ئیسلام هەیە و پەیامی حەق و دادگەری خوایی دابەزیوەتە سەر زەوی وپێغەمبەران (علیهم السلام) دەستیان بە بانگەواز كردووە، ئیسلام لە هەموو چەرخێكدا و بە درێژایی مێژوو تووشی دەیان و سەدان كۆسپ و لەمپەر هاتووە،پیلانی بێ شوماری بۆ داڕێژراوە و چەندین ڕەوتی بەرهەڵستكاری بۆ دروستكراوە، چەكی كاریگەر و بڕندەی دوژمنان هەمیشە ئامادەباش بووە دژ بە ئیسلام و موسڵمانان، هەموو ئەم پیلانانەش چەندین شێوەیان پێ دراوە و بە دەیان بەرگی ئاڵاو واڵاوە پیشانیان داون. ئەوەی مایەی نیگەرانی و مەترسی زیاترە ئەوەیە زۆرجار بە ناوی قەبەو قەبارە گەورە و بریقەدارەوە هاتوونەتە سەر ڕێگا، زۆر جاریش بۆ چەواشەكاری موسڵمانان پێناسی خۆیان گۆڕیوە، جێی داخە كە ئێمەی موسڵمان هەندێك جار دڵپاكانە یان بێ ئاگایانە دەكەوینە داوی ئەو تەڵەكەبازانە، بەڵام ئەوەی مایەی خۆشحاڵییە و متمانەی لای ئێمەی موسڵمان دروستكردووە ئەوەیە كە پەروەردگاری بەرز و مەزنمان بەڵێنی

پاراستنی ڕێگای ڕاست و ئایینی حەقی داوە و ئیسلام لە دەست فڕوفێڵی دوژمنان ساغ وساف دەبێت.

یەکێك لەو پیلانە جەرگبڕانەی کە بۆ ئیسلام وموسڵمانان دانراوە بریتیە لە (عەلمانیەت)، ئەم ڕوانینە زیانێکی زۆری بە حەقیقەت و کرۆکی تێڕوانین بۆ ئیسلام گەیاندووەو هەردەم لە بۆسەدایە بۆ موسڵمانان. بۆیە پێویستە ڕاستیەکەی بخەینەڕوو، بەڵام ئەوەی گرفتی ئێمەیە ئەوەیە کە ئەوان زۆر جار شوناسی خۆیان دیاری ناکەن و ڕاشکاوانە لەسەر مەسەلەکان نادوێن، هەروەك (دکتۆر قەرەزاوی) دەڵێت: پێویستە عەلمانیەت پێناس خۆی لەبەردەم مەسەلە گرنگەکانی ژیاندا ئاشکرا بکات، ئایا باوەڕیان بە خودا هەیە؟ ئایا بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) هەیە؟ ئایا چۆن بیر لە ڕۆژی دوایی دەکەنەوە؟ بە دەربڕینێکی دی ئایا پێناسی عەقیدەیی ئەوان چیە؟ موسڵمانن یا نا؟ پرسیارەکەش بۆ تەنگەتاو کردن نییە، بەڵکو بۆ یەکتر

ناسین و لەیەك حاڵی بوون و دیاریکردنی مەنهەجی مشتومڕەو وەیچی دی[١٠٦].

ئێمەی موسڵمان _ هەروەك خۆشیان پێناسەی دەکەن_ پێمان وایە ئەگەرچی عەلمانیەت خۆی لە بنەڕەتدا چەسپاوە کە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیەو ئامانجی سەرەکی بایەخدانە بە دنیاو دنیاگەرایی و دوور کەوتنەوە لە گرنگیدان بە ژیانی ڕۆژی دوایی[١٠٧]، و حساب نەکردن بۆ خوا و پێغەمبەر (ﷺ) و شەریعەتی خوا[١٠٨]. بەڵام عەلمانیەکان خۆشیان تا ئێستا پێناس

---

[١٠٦] - الاسلام والعلمانیة وجها لوجه : القرضاوي ، گۆڤاری نمانا ژمارە ٣ هاوینی ١٩٩٩، خوێندنەوەی کتێب : بکر حمه سدیق ل١٣٧.

[١٠٧] - هەروەها دائیرەتولمەعاریفی بەریتانی و فەرهەنگی ئۆکسفۆرد گەلێك لە فەرهەنگەکانی دی بەم شێوەیە اسەیان کردووە بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم چەمکە و بنچ وبنەوانی بگەڕێوە ئەم سەرچاوانە:

* صراع الأفكار فی المجتمع الإسلامي: الدکتور محسن عبدالحمید،ص٩-١٠.
* چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم: عەلی باپیر ، ٦٢-٦٦.
* ئەم ڕێچکانە بناسە : عەلمانیەت ..دانا عثمان حسن ، ل ٤

[١٠٨] - چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم: عەلی باپیر ،٦٦.

و پێناسەیەکی یەکلاکەرەوەیان بۆ خۆیان هەڵنەبژاردووە و بنەمایەکی ڕاشکاویان نییە تا بە ئاسانی مرۆڤ بڕیاریان لەسەر بدات. بۆ نمونە کەسێکی وەك (ئۆگەست کۆنت) کە عەلمانیەکی دنیاییە و ڕاشکاوانە دەڵێت: ئێمە عەلمانین وباوەڕمان بە ئایین نییە و باوەڕمان بەوەیە ئەمڕۆ چەرخی زانستە و دەبێ چەمکی خواناسی وەلا بنرێت، بێگومان گفتوگۆ لەگەڵ عەلمانیەکی ئاوا هیچ گرفتێکی تێدا نییە، چونکە پێناسی دیارو ئاشکرایە، و مەنهەجی گفتوگۆ لەگەڵیدا بە ئاسانی دیاری دەکرێت[١٠٩]، کە بە بێ هیچ گومان ودوودڵیەك ئەم جۆرەیان بێ بڕوا و بێ ئایینە.

دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین ناکرێت هەر کەسێك ناوی عەلمانی لە خۆی نا بڵێین بێ بڕوایە و لە ئایین دەرچووە، چونکە ئەوانەی ناوی عەلمانیەت لە خۆیان دەنێن دوو بەشن، بەشێکیان ئەوانەن کە لە عەلمانیەت گەیشتوون و وەك ڕێباز و ئایدۆلۆژیا لێی نەویون و دەشزانن عەلمانیەت چیە و چی دەڵێ وچی

[١٠٩] - گۆڤاری نمانا ژمارە ٣ ، بکر حمه سدیق ل١٣٧

دەویّ، بۆیە دوای دەکەون، کە دیارە ئەمە لادانە لە ئیسلام و ئەوانە هیچ پەیوەندیەکیان بە ئایینەوە نەماوە، بەشێکی دیکەیان ئەوانەن هەروا بە تەقلیدی و کوێرانە بە بیّ لێکۆڵینەوە و تێگەییشتن دوای عەلمانیەت کەوتون، وەك چۆن تەقلیدانە بەرگەکەی لەبەر دەکات و بە تەقلید نەریتی ئەورووپا پەیڕەو دەکات بیّ ئەوەی لە فەلسەفەکەی تێبگات، هەر بەو شێوەش لە ڕووی فیکریەوە بە تەقلید دەڵێت عەلمانیەت شتێکی باشە، دیارە ئەو جۆرە کەسانە حوکمیان جیاوازە تا کاتیّ بەڵگەیان لەسەر تەواو دەکریّ و بیانووبڕ دەکرێن تا ڕادەیەك چاوپۆشییان بۆ بەکار دەهێنرێت[110]، (محمد عمارە) دەڵێت: دەبێت جیاکاری لە نێوان گروپە عەلمانیەکانیشدا بکرێت، چونکە هەروەك لە ناو ئیسلامیەکاندا ڕەوتی توند و وشك و زبر هەن و بەتەواوی بەرامبەر ڕەت دەکەنەوە، بە هەمان شێوە لە نێو عەلمانیەکانیشدا چەندین گروپ هەن نەك هەر دابڕینی ئایین لە دەوڵەت، بەڵکو

[110] - چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم: عەلی باپیر، ١٠٢-١٠٣.

دەیانەوێت ئایین لە کۆمەڵگە دابڕن، واشدەزانم هەر ئەم تاقمەن هەڵدەستن بە تانە وتەشەردان لە ئەحکامە نەگۆڕە ئایینیەکان، بەلأم عەلمانیە نەتەوەیی ونیشتمان پەروەرەکان لەگەڵ ئیسلامیەکان لە یەك سەنگەردان[111].

سەبارەت بە عەلمانیە میانڕەوەکان، (دکتۆر کەمال ئەبولمەجد) دەڵێت: ئێمە هەست دەکەین هەندێك لەو عەلمانیە میانڕەوانە ڕەوایان مەشروعیان هەیە دەربارەی پەیوەندی ئیسلامیەکان بە دەسەلأتەوە، ئەوانە لەگەڵ ڕەوتی ئیسلامی دادەنیشن و ئاخاوتن ئاڵوگۆڕ دەکەن لەسەر ئەو دڵەڕاوکێ مەشروعە و پێیان دەڵێن پارێزگاری لە ئیسلام و بەها بنەڕەتیەکانی بکەن، هەروەها پێیان دەڵێن: ئازادی خۆتان لەدەست مەدەن، چونکە ئێمە دەترسین لە توندڕەوەکانی ئێوە کە پێشتان بکەون، و دەسەلأت بگرنە دەست و ئێوەش بچنە ڕیزی

[111]- ئیسلامیەکان وحیوار لەگەڵ عەلمانیەکان: مێژگردی نێوان: د. محمد عەمارە، د. طارق البشری، د. کمال ابوالمجد، وەرگێڕانی عمر بێژاوی ١٤-١٥.

ئۆپۆزسیۆنەوە، ئەمە ئەوەیە کە ناوم برد بە دڵە ڕاوکێی مەشروع، ئەمە ئەوەیە کە دەبێت گفتوگۆیەکی بەپێزی لەسەر بکرێت. بەڵام دەستەیەك عەلمانی دی هەن لەژێر پەردەی ترس لە ئیسلامیەکان بازرگانی و موزایەدە وحسابات یەکلا دەکەنەوە، باسەکە لای ئەوان بە شێوەیەك لە شێوەکان بەرهەڵستی کردن نییە لە توندڕەوی، بەڵکو ڕق لێبوونەوەیەکە لە ناخیاندا و وەك نەخۆشیەك وایە لە دڵیاندا، ئەوان ڕقیان لە هەر شتێك دەبێتەوە کە ئیسلامی بێت، من ئەوانە ناو دەنێم بە (مندالآنی هەڵگری بەرد بۆ یاری ماڵەباجێنە)، هەڵوێستی ئەوانە هیچ نرخ و کێشێکیان نییەو نابێ لێشیان دڵنیابین، ئەوان هەروەك وتم حسابات یەکلا دەکەنەوە و جێ بە وتەکان دەگۆڕن، و تۆمەت ئاڵوگۆڕ پێدەکەن و هێزی خۆیان بەسەر لایەنی دیکەدا دەسەپێنن، دیارە ئەمەش ناپاکییەکی گەورەیە و زیانەکەشی هەر گەورەیە.[112]

---

[112] - ئیسلامیەکان وحیوار لەگەڵ عەلمانیەکان: ل ١٥-١٦.

بەلاَم لەولاشەوە كۆمەڵێكی دیكەین بەم شێوەیە بیر ناكەنەوە، كەسی عەلمانی هەیە دەڵێت موسڵمانم، بەلاَم ناچێتە عەقڵمەوە ئیسلام بەرنامەی ژیان بێت، یان دەڵێت ئیسلام یانی كەوا وسەڵتە و ڕیش هێشتنەوە.[113] كەواتە دیاریكردنی چەمكی مەسەلەكان خاڵێكی دیكەی گرنگی گفتوگۆ كردنە لەگەڵ عەلمانیەتدا تا بزانرێت سنوری ئەو دژواریەی لەنێواندا هەیە چیە؟ كەواتە جێی خۆیەتی لێرەوە تیشكێك بخەینە سەر چەمك ومەنهەجیەت و ئامانجەكانی (عەلمانیەت) وبزانین دەیانەوێت چی بكەن وچۆن بن؟ دواتر حوكمیان لەسەر بدەین.

لێرەوە تەوەرەكەمان بە جەختكردنەوە لەسەر كار وپرۆژە و ئامانجەكانی (عەلمانیەت) چڕ دەكەینەوە و ڕوونی دەكەینەوە تا چەندە (عەلمانیەت) خزمەت بە كۆمەڵگە دەكات؟ ئایا لەگەڵ واقیعی موسڵماناندا گونجاوە؟ ئەی ئامانج لەم فیكرەیە چیە؟ هۆكارەكانی دروستبوونی چین؟ پشت بە خوا ئەمانە و گەلێك

[113] - گۆڤاری نمانا ژمارە ٣ ، بكر حمە سدیق ل١٣٨

پرسیاری هاوشێوە لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەخەینە بەر باس و لێدوان.

لەپێشدا کورتەیەکمان دەربارەی چەمکی عەلمانیەت باسکرد، کە بریتیە لە دنیا گەرایی وپشت کردنە لە ئاین، لێرەدا پێویست ناکات بگەڕێینەوە سەر ئەو باسە و دەچینە سەر هۆکارەکانی دروست بوون و سەرهەڵدانی عەلمانیەت.

### سەرهەڵدانی بیری عەلمانیەت

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت دەبێ ئاین لە سیاسەت جیا بێت و ئایین حەقی بەسەر ژینەوە نەبێت، ئەوە شتێکی تازە نییە وبیر و بۆچونێکی زۆر کۆنە و عەلمانیەت وەك ئێستا زاراوە بەکار دەهێنرێت وپەیدا بووە، ئەگینا هەر کات مرۆڤ ئیمانی بە خوا نەبوبێت ئەوا هەوڵی داوە پەیوەندی لەگەڵ خوای خۆیدا بپچڕێنێت و بەرنامەی ژیان بۆ خۆی دابنێت،[114]

[114]- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم: عەلی باپیر ،ل ٦٨.

هەر لەو ڕۆژەوەی خوای پەروەردگار دنیای دروست کرد و مرۆڤی خستە ژێر تاقیکردنەوە، (قابیل وهابیل) ڕۆڵەکانی (ئادەم وحەوا) بە شەڕ هاتن و(قابیل) دەستی چووە خوێنی (هابیل) ی برای و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەی کرد، وگوێی لە شەریعەت نەبوو، بەرژەوەندی خۆی ویست و براکەی خۆی کوشت، ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەو ململانێ و دوو بەرەکیە هەر بەردەوامە و دوو ئاڕاستە هەن، گوێدان بە خوا و دواڕۆژ و لەبەرچاوگرتنی قەبر وقیامەت و لێپرسینەوەی خوایی و لە بەرامبەریشدا گوێ نەدان بە ئەمانە هەیە و بەردەوامە، و ئەم دوو بەرەیە دژ بە یەکن وهەمیشە لە بەربەکانێدان، کە دیارە هەر دوو ئاراستەکەش هەڵقوڵاوی بیر و جوڵەی مرۆڤن، خوای گەورە مرۆڤی وا دروست کردووە کە بتوانێت چاکەکار بێت و خراپەکاریش بێت، بتوانێت بە ڕاستدا بڕوات وبە چەپیشدا، بتوانێت حەق بڵێت وباتڵیش بڵێت [115]. کەواتە عەلمانیەت بە

[115] - چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم: ،ل ٦٦.

مانای نافەرمانیکردنی خوای گەورە ودەرچوون و وەلا نانی شەریعەتەکەی، ناوەرۆکێکی کۆنە و هەبو بووە، بەڵام سەرهەڵدانی وەك بیرێکی سەربەخۆ وتایبەت، ئەوا بێگومان سەرەتای سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی (١٧٨٩ ز)، کە تیایدا شۆڕشی فەرەنسا ڕوویدا، یەکەم شوێنیش ئەم بیرۆکەی تێدا بڵاو بوویەوە (ئەوروپا) بوو، دواتر بە وڵاتانی دیکەی جیهاندا بڵاو بوویەوە[١١٦].

**هۆکارەکانی سەرهەڵدانی بیری (عەلمانیەت) لە ڕۆژئاوا:**

هۆکاری سەرهەڵدانی عەلمانیەت لە وڵاتانی ئەوروپا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی (ئایینی،سیاسی، مێژوویی، واقیعی)، کە هەموویان پەیوەست بوون بە وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەو سەردەمەوە، بەڵام گەورەترین هۆکار لایەنە ئایینیەکە بوو، ئەویش بە هۆی خراپ مامەڵە کردنی پیاوانی کڵێساوە بوو کە

١١٦ – ئەم ڕێچکانە بناسە ، عەلمانیەت ، تەبشیریەت،بوزیەت، ل٥.

خۆیـان بـە شـوێنكەوتەی پێغەمبـەر (عیسـا) "سـەلامی خـوای لێبێت" دەزانی و خۆیان ناونابوو (رجال الدین) پیاوانی ئایینی، ئەمانە غەدر وفێڵێكی زۆریان لە خەڵكی ئەوروپا دەكرد، تەنها خۆیان بۆیان هەبوو لە كتێبی پیرۆز (كتاب المقدس) شارەزابن، (صكوك الغفران) چەكی لێخۆشبونیان بە خەڵكی دەفرۆشت، ئەمـەش ئەوپـەڕی گەنـدەڵی بـوو، خـەڵكیان كردبوو بـە كۆیلـە و خزمـەتكاری خۆیـان، بـە ویسـت و ئارەزوی خۆیـان دەسـتكاری دەقـەكانی كتێبـی پیرۆزیـان دەكـرد و دەیانشـێواند، بـۆ نمونـە بیردۆزەی هەریەكە لە (بگلیموس) و(ئیقلیدیس) یان پەیوەست دەكـرد بـە (تـەورات وئینجیـل) و وەك حەقیقـەتێكی ئـایینی سەیریان دەكرد، ڕەهبانیەتیان داهێنا و دەیانوت دەبێت مرۆڤ زۆر خۆی ماندوو بكات هەر بۆیە ڕاهیبەكانیان ژنیان نـەدەهێنا و خۆیان نەدەشۆرد و بۆنی خۆشیان لە خۆیان نـەدەدا و خواردنی خۆشیان نـەدەخوارد، هـەموو ئەمانـەش لەگەڵ سروشتی مۆرڤدا

نە دەگونجان[117]. هەر جموجوڵێكی زانستی بهاتایەتە ئاراوە یەكسەر سەركوتیاندەكرد و دژی دەوەستان، هەر بۆیە پیاوانی بەناو چاكەخواز و دینداری كڵێسا بوونە ستەمكار و چەوسێنەرەوەی هەژاران وپشتگیریكار لە خەڵكانی بە دەسەڵات وسەرمایەدار، لەبەر ئەم هۆكارانە دەیان و سەدان بیروباوەڕی نادروست و خورافی و دوور لە ئایین و زانست و ژێری سەریانهەڵدا[118].

كار گەییشتە ئەوەی ئەوروپاییەكان ئایینیان بە یەكجاری وەلا نا، چونكە پێشتر و لە سەردەمی نەسرانیەتدا ئەوەندە لێی داخ لە دڵ ببوون، كەس بۆی نەبوو هەر باسی ئایین بكات، ج جای ئەوەی دواتر پەیتا پەیتا زانست بەرەو پێش چوو[119]، هەر باسی ئایین نەدەكرا، تا سەرەنجام خەڵكی ئەوروپا بەرهەڵستی

---

[117] - چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم: ،ل ٨٥.

[118] - ئەم ڕێچكانە بناسە ، عەلمانیەت ، تەبشیریەت،بوزیەت، ل٥- ٦ .

[119] - صراع الأفكار فی المجتمع الإسلامي ، ١١-١٢.

ئەم ڕەوتەیان کرد و بیرمەندان و زانا و فەیلەسوف و ڕەخنگران دەستیانکرد بە نکوڵیکردن لەوەی لە ناو تەورات و ئینجیلدا هەیە و دەیانوت ئەوەی ئێوە ئەیڵێن دوورە لە زانست و ژیریەوە، بەڵکو هەر بەمەشەوە نەوەستان، تا کار گەییشتە ئەوەی نکۆڵییان کرد لە بوونی خوای گەورەیش، ئیتر ئەمە بوو بە سەرەتای دابەشبوونی ئەورووپاییەکان بەسەر دوو گروپدا، گروپێك ژیانی ئایینی هەڵبژارد، گروپەکەی دیکەیش ژیانی دنیای هەڵبژارد[١٢٠].

لێرەوە خەڵکی بە ئاگا هاتن و خەڵکی ئەورووپا بە گشتی و وڵاتی فەرەنسا بە تایبەتی شۆڕشێکیان بەرپا کرد، لە ساڵی (١٧٨٩ ز)، کە بە (شۆڕشی فەرەنسی) بەناوبانگە، فەرەنسا یەکەم وڵات بوو بانگەشەی بێ دینی و سەربەخۆیی خۆی کرد، و دەستوور و یاسای نوێی بۆ وڵات دامەزراند و بە ناوی گەلەوە فەرمانڕەوایی خەڵکی فەرەنسای کرد، ئەمەش ڕێخۆشکەرێکی گەورە بوو بۆ هاتنە کایەی سەرجەم ڕێچکە بێ دینی

[١٢٠] - صراع الأفكار في المجتمع الإسلامي ، ١١-١٢.

وملهوڕییەکانی دیکە وەك (مارکسیەت لە ئەڵمانیا و ڕوسیا، بڵاوبونەوەی بیری داروین و فرۆید لە وڵاتەکانی دیکەی ئەوروپا)، سەرەکیترین هۆکاریش بۆ ناشیرین کردنی ئاین و نەمانی متمانە بە سەرجەم ئایینە ئاسمانیەکانی دی کارە دزێوو نامرۆڤانەکانی پیاوانی کڵێسا بوو کە بە ناوی ئایینەوە لە ئەوروپا ئەنجامیان دەدا[121].

کۆمەڵگەی ئەورپی بۆ ماوەی چەندین سەدە گیرۆدەی ئەفسانە و تەڵە و داوی قەشە و پاپاکانیان بوو و خۆ سەپاندن و سوغرە و بێگاری و باج و پیتاکی جۆراو جۆریان لەچینی گشتی دەسەند، لەو سۆنگەشەوە بە مانای وشە لە تاریکستانی نەزانیو نەفامی ئەنگوستەچاودا دەژیان، ڕێچکەی عەلمانیەت بۆ ڕۆژئاوا گیرخواردووەکان شتێکی سروشتی و چاوەڕوان کراوبوو، چونکە هیچ ڕێگەچارەیەکی دیکەیان شك نەدەبرد، دیارە مرۆڤ کە کەوتە ئاوە وە بۆ دەرباز بوون دەست بۆ پوشیش دەبات[122].

---

[121] - ئەم ڕێچکانە بناسە ، ل ٦.

[122] - سۆزی نەتەوایەتی وبیری ناسیۆنالیزم: عەلی باپیر : ل ١٧٤.

**دزەکردنی ( عەلمانیەت ) بۆ نێو جیهانی ئیسلامی:**

بە هۆی ئەوەی عەلمانیەت لە جیهاندا بە گشتی و ئەورووپا بەتایبەتی ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو پێشچونی بە خۆیەوە دەبینی و دەوڵەتە ئەورووپیەکانیش یاسا نا ئایینیەکان جێبەجێدەکرد بە تایبەت لە سەدەی (نۆزدە) دا، ئیتر دەوڵەتی ئیسلامی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا وردە وردە بە ڕێژەیەکی ترسناک بەرەو دابەزین دەهات، هۆکاری ئەمەش کوژانەوە و چەقبەستنی هزری ئیسلامی بوو، هەروەها لاواز بوونی لایەنی ماددی ومەعنەوی و تێنەگەییشتن ونەبوونی بیروباوەڕێکی ڕوون و ئازادبوو بە شێوازێکی ڕاست و دروست و نەشارەزایی خەڵکی لە حیکمەتی بڕیارەکانی شەریعەت و پەنابردنە بەر لایەنگیری دەمارگیرانە و دوور کەوتنەوە لە لە کرۆکی جیهاد و تێنەگەییشتن لە سروشتی گەردوون بۆ بنیاتنانی شارستانیەت و بەرەو پێشچوون و جێنشین بوون لە زەویدا، وێڕای هەموو ئەمانەش زانایان و

بیرمەندان و پیاوانی سیاسەت هەستیان نەکرد بە حەقیقەتی ئەم بیرە ڕۆژئاواییە[123].

**هۆکاری سەرهەڵدانی (عەلمانیەت) لە وڵاتانی ئیسلامیدا:**

دوای ڕووخـانی خیلافـەتی (عوسمـانی) و پارچـە پارچـە بـوونی وڵاتـانی ئیسـلامی، هـەر وڵاتـە و کەوتـە ژێـر دەسـەڵاتی یـەکێك لـە دەوڵەتـە زلهێزەکـانی ڕۆژئـاوای عـەلمانی، ئـیتر لـەم ڕێگەیەوە بیری عەلمانیەتیان لە وڵاتانی ئیسلامیدا چاند[124].

ئـەم دۆخـە نالـەبارە وای لـە دوژمنـان کـرد چاو ببڕنـە بکەنـە سـەر گـەلی ئیسـلامی و خـاك و بـەروبومی پـڕ خێـر وشـوێنە جوگرافیەکـەی[125]، بـۆ ئـەوەی موسـڵمان نـەتوانێت پرسـیار لـە پێناسی خۆی بکات و لە ڕەچەڵەکی خۆی بکۆڵێتەوە، ونەتوانێت بـە ڕابەرایـەتی ئیسـلام سـەر لـەنوێ هـەوڵی بنیاتنانـەوەی

---

[123]- صراع الأفكار في المجتمع الإسلامي ، ص١٥.

[124]- ئەم ڕێچکانە بناسە ، ل ٢٠.

[125]- صراع الأفكار في المجتمع الإسلامي ، ص١٥.

شارســـتانيەتەكەی بداتـــەوە، كـــە زامنـــی ڕێبـــازێكی ڕوون وكۆشكێكی پتەو و بزاڤێكی ڕەسەنی ناو كۆمەڵگەيە.

ئەم دوژمنانە هاتن گەماڕۆی ئەم نەخۆشی و برينانەی نێو جەستەی دەوڵەتە ئيسلاميەكانياندا و چەندين پيلانی سەختيان داڕشت بۆ دەست بەسەراگرتنيان، جارێك بە داگيركردنيان‌و جارێكی دی بە چاودێری خستنە سەريان. ئيتر لێرەوە كەش و هـەوايان بـۆ ڕەخسـا بـۆ وێرانكردنـی بيروبـاوەڕ و ڕەوشـت و شـەريعەتی ئيسـلامی و جـودا كردنـەوەی ئـايين لـە دەوڵـەت و ڕاگەياندنی عەلمانيـەت، ئەمـەش بە ڕازاندنـەوەی ئـەو دروشمـەی كە گوايە ڕۆژئاواييەكان پێشنەكەوتن تا ئايينيان لە دەوڵەت جيا كـردەوە. ئەمانـە لەچـەند دەلاقەيەكـەوە بيرۆكـەی عەلمانيـەتيان بەرجەســـتە دەكـــرد، وەك دەزگاكـــانی بـــە ڕۆژئـــاواييكردن و موژدەگـاری و دەســـتگرتن بەســـەر دەزگاكـانی ڕۆشـنبيری و ڕاگەياندن، ودانانی بەرنامەيەكی دژە ئاينی بۆ خوێندن و كەناڵـە پەروەردەييـەكان و بانگەشـە كـردن بـۆ نەتەوەگـەرايی لـەبری

بانگەوازی ئیسلامی، هەموو ئەمانەش بە ڕێگەی دبلۆماسی و لە ڕێگەی پسپۆڕانیانەوە و كردنەوەی قوتابخانە موژدەگاریەكانیان و فێركردنی قوتابیان لە زمانی بیانی، ئەمەش بەو نیازەی ئەوەی هزر و ڕۆشنبیری ئەوروپی و عەلمانی بگوازنەوە بۆ ناو هەست و هۆشی قوتابیان.[١٢٦]

هەروەها ڕۆژئاواییەكان توانیان زۆرێك لە سەركردە و فەرمانڕەواكانی وەك (جەمال عەبدلناسر، ئەنوەر سادات، موستەفا ئەتاتورك، سەدام حسێن..)، قایل بكەن تا كار نەكەن بە زۆرێك لە یاساكانی شەریعەت و لە ئاین دووریان بخەنەوە و دەیان و سەدان حزب نەتەوەیی قەومی عەلمانی لە ولآتانی ئیسلامیدا بلآو كردەوە[١٢٧].

لە لایەكی دیكەوە بێ شەرمانە تانەیان دەدا لە ئیسلام و ئیسلامیان دەدایە بەر نەشتەری ڕەخنەی بێ جێ و ڕێ و كوێرانە

---

[١٢٦]- صراع الأفكار في المجتمع الإسلامي ، ص١٥- ١٦.

[١٢٧]- ئەم ڕێچكانە بناسە ، ل ٢٠.

شەریعەتیان تاوانبار دەکرد، ئەمەش لە ڕێگەی بانگەشە کردن بۆ ئازادی ئافرەت و هەوڵی زیندوو کردنەوەی شارستانیەتی کۆن و دارنینی ئافرەتان لە بالآپۆشی و ناوزەدکردنی ئیسلام بە دواکەوتووی و کۆنە پەرستی و کردنی ئیسلام بە چەند دروشمێکی خەیاڵی وناشیرینکردنی مێژووی ئیسلامی لەبەر چاوی خودی موسڵمانانیش.

**دروشمەکانی عەلمانیەت:**

عەلمانیەکان زۆر ژیرانە کۆشش دەکەن و خۆیان وا پیشان دەدەن کە سەر بە ئاینن و موسوڵمانن، ئەوان عەلمانیەت وەك تەرزێکی دوور لە چالاکی ژیان سەیری کرۆکی ئایین دەکەن، بۆیە مەگەر بەپێی حەزیان لە کاتی زۆر پێهاتن و سەغڵەت بووندا، ئەگین باس وخواسی ئیسلام ناکەن.[128]

بە خۆهەڵکێشانی سەیر و بە پیلانی توندەوە دروشمی پێشخستنی شەریعەت و وەرگرتنی یاسا و دەستوور لە

[128]- گۆڤاری نمانا ژمارە ٣ ، بکر حمە سدیق ل١٣٥.

شـەریعەت و جێبـەجێکردنی شـەریعەتیان بـەرز کردۆتـەوە، بـۆ ئەوەی موسڵمانان لە بیرو بۆچونی عەلمانیەکان ڕانەکەن، ئـەوان دەیانـەوێت ڕێبـازی خۆیـان زۆر بـە ووردی و لەسـەرخۆییەوە بخەنـە نێـو مێشک وهـزرو دەروونـی موسـڵمانان، هـەروەك چۆن ژەهر بە ئاسانی دەچێتە نێو گیانی ئادەمیزادەوە و پاشان کاری تێـدەکات و دەیکوژێـت، ئـەوانیش فێڵبازانـە و بـە نـەرمی بـۆ موسڵمانان دێن، واش پیشان دەدەن کە گوایە دەیانەوێت وردە وردە و بـە قۆناغبەنـدی شـەریعەتی ئیسـلام جێبـەجێ بکـەن و بیکەنە بەرنامەی ژیان.

بـە نـاوی بـەرگری لـە ئـافرەت و قوتابخەنـە عەقڵانیـەکان و حـوکمی گـەل بـۆ گـەل وئـازادی تاکـە کەسـی کۆمـەڵ لـە خشـتە دەبـەن، لـە ژێـر دروشمـی ڕۆشـنبیریدا مـرۆڤ لـە ڕونـاکی ئیسـلام دەردەهێنن و بەرەو تاریکی و گومڕاییان دەبەن، لە ژێر دروشمی بزافـی ڕۆشـنبیری و نـاوی هونـەردا هـەموو بـەرەڵایی و بـێ ئابڕوییەك دەخولقێنن.[129]

---

[129]- هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بە عەلمانیەت: محمد عبدالهادی المصری، وەرگێڕانی: عزالدین عبدالرحمن امینی ، ٤٢-٤٣.

هەوڵ بۆ ئەوە دەدەن بۆ خەڵکی بسەلمێنن کە سیاسەت لە ئیسلامدا حەرامە، وەك ئەوەی ئەوان موفتی سەردەمی ئەمڕۆی ئیسلام بن و کەسیتر ئاشنای قورئان نەبێت جگە لە خۆیان، ئا ئەمەیە ئیسلامی عەلمانی، بەڵام خۆ چەمکی سیاسەتیش خۆی بۆ خۆی کێشەیەکە لەگەڵ عەلمانیەت، چونکە ئەگەر سیاسەت لە لای عەلمانیەکان فرت و فێڵ و درۆ و دەست بڕین بێت، ئەوا ئێمەی موسڵمان بە حەرامی دەزانین، ئەگەر لای ئیسلامیەکان بریتی بێت لە بەڕێوەبردنی سیستەمی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ژیاری و خزمەتکردن بە کۆمەڵگە، ئەوا بێگومان ئەوە لە بنەڕەتی ئاینەکەمانە.[130]

وە ئەیانەوێت ئیسلام تەنها بە ئاینێکی ڕوحی بهێڵنەوەو دوور بێت لە بەجێگەیاندنی دروشمەکان، بەم پێودانگەش دەبێت خەڵکی موسڵمان لە دروشمی بوون ئازاد بکرێن، چونکە

---

[130] - دیالۆگی ئیسلام _ عەلمانیەت: ووتو وێژی: ئەبو دوعا، ئازاد عەلی، ئامادەکردنی: ئیبن بلدی ، ل١٥-١٧.

پێویست ناکات خەڵکی بۆ نوێژ لە مزگەوتدا کۆببنەوە، ونوێژ شتێکی تایبەیە. دەڵێن ئیسلامی ڕاستە قینە نەماوە، بەڵکو سەرەتای مێژووی ئیسلامی وبنەماکانی ئیسلام وتایبەتمەندیەکانی بە تەواوی گۆڕاوە وشێوێنراوە، وتەنها ئیسلامێکی ڕوکاری سوڵتەیی گەییشتووە بە دەستی ئێمە. وە ئیسلام چەندین دروشمی هەڵە وخراپی تێکەڵ بووە، وبەرەو نەمان دەڕوات. ئیسلام تەنها موڵکی عەرەبە وناکرێت بیگشتێنین بەسەر هەموو گەلاندا، چونکە پێش لەوەی ئیسلام بێتە ئاراوە یەکەم ماڵی خوا لە زەوی عەرەبدا بنیات نرا، کەواتە ئیسلام ئایینێکی تیرەگەراییە بۆ عەرەب، وعەرەبەکان لە گشت شوێنێکدا وای پیشان دەدەن کە ئیسلام ئایینی ئەوانە. بەکورتی دەڵێن: ئیسلام ئایینێکی مێژووییە وبەهۆی سەرکەوتنیەوە لە بواری سیاسەتدا خۆی سەپاندووە بەسەر گەلاندا.[١٣١]

---

[١٣١] - مآل الإسلام فى القراءات العلمانية: الدكتور أحمد إدريس الطعان .

## ئایا فکری عەلمانیەت بۆ جیهانی ئیسلامی شتێکی پێویستە؛

بیر و بیرۆکەی عەلمانیەت بە هیچ شێوەیەك بۆ موسڵمانان و جیهانی ئیسلامی شتێکی پێویست نییە، بەڵکو ڕەتکراوەیە و جێگەی نابێتەوە، لەبەر ئەم هۆکارانە:

١. شارستانێتی ئیسلامی بە بیر وباوەڕو یاسا وهاوکێشە ڕەووشتیەکەیەوە شارستانیەتێکی تەنیا ڕۆحی نیە، کە بڕوای وابێت مرۆڤ لە ئاسماندایە نەك لە زەوی، بەڵکو شارتانیەتێکی مادیە، کە بە ڕێنمایی وپێوەری ئیسلامی بەڕێوە دەچێت، بۆ گەشەپێدان و کارئاسانی کردنی ژیان لەسەر زەویدا و بنیاتنانی بزاڤێکی مادی لەسەر ئەم گەردوونەدا، هەر وەك ئەمەش مەبەستە لە فەرمودەی خوای گەورە: (وإذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الأرض خليفة[١٣٢])..[١٣٣]

---

١٣٢ – سورة البقرة الاية :٣٠

١٣٣ – منهج التغيير الاجتماعي في الاسلام ، د.محسن عبد الحميد ،ص٦١ وەرگیراوە لە صراع الأفكار في المجتمع الإسلامي ، ص٢٩.

٢. ئیسلام یاسایەکی هاوسەنگی هەیە، بنەما ویاساکانی وە هەروەها زۆرێك لە ووردەکاریەکانیشی پشت بە (وەحی) سروشی خوایی دەبەستێت، نەك تەنها پشت بەستن بە بۆچون ولێکدانەوە و ووتەی زانایان، کەواتە ئیسلام هاوسەنگی لە نێوان هەردوو لایەنەکەدا ڕاگرتووە، لایەنێکیان تەنها وەحی ئاسمانیە وبواری لێکدانەوە وبۆچونی تێدا نییە، لایەنێکی تریشیان ڕووبەرەکەی بەرفراوانە، و بوار هەیە بۆ لێکۆڵینەوە تێیدا لە هەموو کات وشوێننێکدا، واتە بەپێی بەرژەوەندی گشتی لەژێر یاسا وبنەما شەرعیەکاندا قابیلی ئیجتیهاد ولێکۆڵینەوەی جیاواز دەکات.

ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئەو مەسیحیەتەی لە ڕۆژئاوادا عەلمانیەتی لێکەوتەوە یاسا وبنەمایەکی جێگیریان نەبوو، کە پشت بە وەحی ئاسمانی ببەستێت، بەڵکو لەسەر چەند بیرۆکەیەکی کۆن و هەڵە دەڕۆییشتن، نان وسامانیان بەسەریەوە پەیدا دەکردن و خەڵکیان پێ موحاسەبە دەکرد و بڕیاری بێ

باوەڕی و کوفریان بەسەر ئەو کەسانەدا دەدا کە ڕاستیە زانستییەکانیان ئاشکرا دەکرد.[١٣٤]

٣. بە هیچ شێوەیەك و بەدرێژایی مێژوو ناکۆکی و دژایەتی لە نێوان زانست و ئاینی ئیسلامدا ڕووینەداوە و دروست نەبووە، لە نێوان ئیسلام وزانست وفەلسەفەی ژێری ڕاستدا هیچ ناکۆکیەك نیە، چونکە ئیسلام هەڵوێستی خۆی سەبارەت بە بوون و گەردوون لەسەر بنەمای زانست وپاشانیش فەلسەفەی ڕاست و دروست بنیاتناوە، ئایاتەکانی قورئانی پیرۆزیش بەڵگەی ئەم ڕاستیەن.

موسڵمانان بەرنامە و ڕێبازە زانستیەکانیان لەسەر ئەم بنەمایە بەرەو پێش بردووە، هەروەك بوارەکانی گەردووناسی، بیرکاری، فیزیا، کیمیا، پزیشکی، ئەدەب، جوگرافیا، مێژوو، ئابووری، کۆمەڵایەتی، بیناسازی..وە هەروەها، وە بە درێژایی مێژووش شارستانێتی ئیسلامی دەرگای واڵا بووە.[١٣٥]

---

[١٣٤]- صراع الأفكار فی المجتمع الإسلامي ، ٢٩- ٣٠.

[١٣٥]- هەمان سەرچاوە ص٣٤- ٣٥ .

٤. دەوڵـەتی ئیسـلامی دەوڵـەتی پیـاوانی ئـایینی (ئـەکلیرۆس) نییە، بەڵکو به مانای ووشـه دەوڵـەتێکی مـەدەنی دەستوورییه و فەرمانڕەواکانی تەنها یاساکانی ئیسلام جێبەجێ دەکەن، وە بۆ هـیچ زانایـەك یـان دەسـتە و گروپێـك نییـه بیروبۆچـونی خـۆی بسـەپێنێن بەسـەر هـیچ لاو لایەنێکـدا، بـەڵکو ئەنجومـەنی ڕاوێـژکاری تـاوتوێی هـەموو کـارو بارەکـان دەکـات، بـه پێـی یاساکانی ئیجتیهاد وله ژێر دروشمی هێنایه کایەی بەرژەوەندی گشـتیدا، وبـه پێـی دەنگـی زۆرینـه، وەپاشـان کارەکـه دەدرێتـه دەسـت لیژنەیـەك کـه لـه کەسـانی پسـپۆڕ وتایبەتمەنـد پێـك هـاتوون، لـه بوارەکـانی سیاسـی وئـابووری و کۆمەڵایـەتی وڕاگەیاندن و پەروەردە وفێرکردن وبەرگری، دەوڵـەتی ئیسلامی قیـاس ناکرێتـه سـەر دەوڵـەتی کڵێسـای سـەدەکانی ناوەڕاسـت، چونکه پێکهاتەی دەوڵەتی ئیسلامی نوێنەرایەتی خـودا ناکات، بـەڵکو نوێنەرایـەتی گـەل دەکـات بـۆ جێبـەجێکردنی یاسـاکانی ئیسلام.[١٣٦]

---

[١٣٦]- هەمان سەچاوە

٥. (ئادم متن) دەڵێت: ئاییینی ئیسلام بایەخ بە هەموو چین وتوێـژێك دەدات و دادگەری کۆمەلأیەتی بۆ کۆمەڵگە فەراهەم دەکات، نەك بە تەنها بۆ موسڵمانان، بەڵکو بۆ هەموو کۆمەڵگە، بە موسڵمان وغەیرە موسڵمانەوە، چونکە مافی ژیان دەستەبەر کراوە بۆ گشت کەسێك، ئێمە سەرمان لەوە سوڕماوە ئەو هەمووە کرێکار و کارگوزارە ناموسڵمانانە لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا کار دەکەن، لەناو شار و ولأتە ئیسلامیەکاندا ناوچەیەکی تایبەت یان کۆلأنێکی دیاریکراو نییە بۆ فەلە وجوو (یەهود ونەسارا) تاوەکو بۆیان نەبێت ئەو سنورە ببەزێنن ولێی دەرنەچن. وە هەروەها ئیسلام دەست وەرناداتە دروشمە ئایینیەکانی(ئەهلی زیمە[137])[138]

---

[137] - ئەهلی زیمە : ئەو خەڵکە نا موسڵمانانەن کە ئیس لامیان قبوڵ نەکردووە ، بەلأم لە ژێر دەسەلأتی ئیسلامیدا دەژین ، هەموو مافێکی هاولأتی بوونیان پێدراوە ، وە بەدانی ڕەفری سالأنە و ژان و سامانیان پارێزراوە .

[138] - صراع الأفكار في المجتمع الإسلامي ، ٢٩- ٣٠.

٦. عەلمانیەت ئامانجیان دابڕینی ئایینە لە دەوڵەت، واتە ئایین بە دوور بێت لە بوارەکانی سیاسەت وفەرمانڕەواییکردن وپەروەردە وهەموو بوارەکانی تری ژیان، ئەمەش لەسەر بنەمای (إعط ما لقیصر لقیصر وما لله لله)، ئەمەش فەرمانڕەوایی دەبەخشێت بە هەموو دەسەلآتدارانی وولآت، جا هەر کەسێك بێت، چاك بێت یان خراپ، وە هەروەها ملکەچ بوونیشە بە بڕیارەکانی کەنیسە وقەشەکانیان.[139]

پاشان ئەو کات پاشا گەردانی دروست دەبێت وخەڵکی موسڵمان زوڵم وستەمێکی زۆریان لێدەکرێت، ویاسایەکی دادگەر لە ئارادا نابێت بۆ بەرگریکردن لە خەڵکی چەوساوە، وسیستەمی کۆیلایەتی پیادە دەکرێت.

[139]- ئەم ڕێچکانە بناسە ، ل ٦.

**دەرەنجامەکانی جێبەجێ کردنی عەلمانیەت لە وڵاتانی ئیسلامیدا:**

پیـادەکردن و پراکتیـزە کردنـی عەلمانیـەت لـە وڵاتـی ئیسلامی وموسڵماناندا بەرەو دەرئەنجامێکی زۆر مەترسیدارمان دەبـات، چـونکە کاریگەریـەکی زۆر دەکاتـە سـەر دواکـەوتنی ئوممەی ئیسلامی و تێکشاندنی بنەماکانی، لێرە لەم دەرفەتەدا بـە کـورتی تیشـکێك دەخەینـە سـەر ئـەو خاڵـە نێگەتیڤانـە وهەندێکیان دەخەینە پێش چاو:

١. عەلمانیـەکان بایـەخ بـە ڕەسـەنایەتی و مـۆرکی ئیسـلامیەتی موسـڵمانان نـادەن و پارێزگـاری لـە تایبەتمەنـدی و شارسـتانیەتیان ناکـەن و هێڵـی سـەوزیان داوە لـە هـەموو بوارەکانی ژیان، بۆ ئەوەی ئەو هێڵانە ببەزێنن، واتە ئەوان لە بەر ڕۆشنایی ئەو هێڵانەدا هەوڵەکانیان دەخەنەگەڕ و ئامانجیان بۆ ڕووخانـدنی ڕابردووی ئیسـلامە، ناشـتوانن بـەدیلێکی نوێی بۆ دابنێن، چونکە دابڕینی موسڵمانان لە بنەماکانی بووەتە شتێکی مەحاڵ و ڕیشە و ڕەووشتی ئیسلامی چەسپاوە و چووەتە ناخی

زۆرێـك لـە خـەڵك، ئـەوان نـاتوانن موسـڵمانان لـە ڕابـردوو و مێـژوویان دابڕن، بەڵام توانیویانـە بە تـەوجیهات و پـەروەردەی ناڕاسـت بـۆ نـەوەی نـوێ ئاڵۆزیـەکی فکـری دروسـت بکـەن و دژایـەتی لـە نێـوان کـۆن و نوێـدا دروسـت بکـەن، ئەمـەش بووتـە هۆی لەدەستدانی لایەنێکی ژیانی کۆمەڵایەتی.[١٤٠]

٢. هـەوڵ دەدەن لـەناو نـەوەی نوێـدا پـیرۆزی و قودسـیەت بـۆ بیروبـاوەڕی ئیسـلامی نـەهێڵن، ئەمـەش بـۆ ئـەوەی لەسـەر یـەك بنـەما نەمێننـەوە و بـۆ هـەر هەڵوێسـتێك بیروبـڕوای دروسـتیان هـەبێت دەربـارەی ژیـان و لـە شوێنیشـیدا بیروهـزری ڕۆژئـاوایی دابنێن وبیپرۆێنن و تەنها بایەخ بە بەرژەوەندیە تاکە کەسیەکانی خۆیـان بـدەن و گوێیـان لـە بچـوکترین بەرژەوەنـدی وڵات و هاوڵاتیانی دیکە نەبێت، ئەوان چونەتە نێو ژیـانی موسڵمانانەوە و بـەرەو ڕوخانیـان دەبـەن، واتـە موسـڵمانان و شارستانێتیەکەشیان دەکەنە قوربانی.[١٤١]

---

[١٤٠] - صراع الأفكار في المجتمع الإسلامي ، ٣٥- ٣٦.

[١٤١] - هەمان سەچاوە، ٣٦.

٣. عەلمانیـــەت لـــە جیهـــانی ئیســـلامیدا پابەنـــد نییـــە بـــەو عەلمانیەتەی خۆرئاواوە، کە ئازادی ودادگەری ڕاستەقینەی بۆ خۆیان چەسپاندووە، بەڵکو بە ناوی ئازادی ودادگەریـەوە لـە نـاو موسـڵماناندا ڕێگـەیان لـە موسـڵمانان گرتـووە کـە بـە ئـازادی وسەربەسـتی نـەوەکانیان لەسـەر ئیمـان و ڕەووشـتە بالآکـان و پابەنـد بـوون بـە بڕیارەکـانی شـەریعەتەوە پـەروەردە بکـەن، وە ڕێگـەیان گرتووەتـە بـەر بـۆ ڕووخانـدنی بیروبـاوەڕ و ڕەوشـت و یاسـای ئیسـلامی، و دەیانـەوێت لـە ڕێگـەی ڕاگەیانـدن و کەناڵـە ڕۆشنبیریەکانەوە بە هێواشی موسڵمانان لە ئاییەنەکەیان دوور بخەنـــەوە، واتـــە ئـــازادی تـــەواو دراوە بـــە گێـــرە شـــێوێن و ناڕاستەکان، وبانگخوازە ڕاستخوازەکانیش دووره پەرێز خراون، و کۆت و بەند کراون.[١٤٢]

٤. عەلمانیـەت و بـیری ڕۆژئـاوا هـەوڵ بـۆ ژیـانێکی ئابوریانـەی تەرفیهی ڕوکار و ڕازاوە دەدات، نەك بۆ دابین کردنی ئەو شتانەی

[١٤٢] - هەمان سەچاوە، ٣٩-٤٠.

کە پێویسـت و زەروریـن، بـە تایبـەت جوانکـاری و شـتە ڕازاوە حەرامـەکان، وەك ئیسـرافی زۆر لـە ڕاگەیانـدن ودەزاگاکـانی دەوڵەت و.. هتد، بۆ ئەوەی داهاتی گەل بە فیڕۆ بڕوات، تا زۆرێك لـە داهـاتی میللـەت دەدزن و هاولاتیـان لـە بەروبومی خۆیـان بێ بەش دەکەن و دارایی لە بواری پیشەسازی و کشتوکاڵدا خـەرج ناکەن.[١٤٣]

٥. عەلمانیـەت ڕۆشـنبیری وهونـەر ونـەریتی خۆیانیـان هێناوەتـە نـاو موسـڵمانانەوە وپاشـا گـەردانی وهەسـتی بەرپرسـیارێتیان نەهێشـتووە لـەناو نـەوەی نوێـدا، بەمـەش لـە ڕەووشـت ونەریتـە ئیسـلامیەکان لایانـداوون، کـە سـەدان سـاڵە لەسـەری ڕاهـاتوون ولەسەری دەڕۆن.[١٤٤]

٦. عەلمانیـەکان بـۆ ئـەوەی لـە نەخشـەکانیاندا سـەرکەوتووبن هەسـتاوون بـە دروسـتکردنی چینایەتی و تائیفەگەرایـەتی لـە

---

[١٤٣] - صراع الأفكار في المجتمع الإسلامي ، ٣٨- ٣٩.

[١٤٤] - هەمان سەچاوە، ٣٨

نێوان موسڵمانانندا، بەمەش خەڵکیان سەرقاڵ کردووە لەوەی کە یەکێتی و یەکڕیزی ناوخۆ بپارێزن، و دوژمنایەتییان لە نێودا دروست بووە.[145]

٧. عەلمانیە موسڵمانەکان بە تەواوی نەزانن دەربارەی ئیسلام و پابەند نین بە بنەماکانی ئیسلامەوە، ئەوانە زۆربەیان دەرچووی زانکۆکانی ڕۆژئاوان، تێکەڵبوون لەگەڵ ژیانی ڕۆژئاوادا، بە تایبەت ئەوانەی پابەندن بە ماسۆنیەتەوە، ئیتر لێرەوە ئەوان هاوکار وپشتیوانی ڕۆژئاوان، بۆ دوور خستنەوەی ئیسلام لە کاروباری ژیان، بەمەش ڕۆڵی ناپاکان دەنوێنن بۆ خاوکردنەوەی ڕاپەڕینی موسڵمانان وبەئەنجام گەییشتنی پیلانەکانی دوژمن.[146]

٨. عەلمانیەت دەیەوێت چەند ئیسلامێك دروست بکات، هەر وەك ئیسلام دابەش دەکات بەسەر ئیسلامی سوننی وشیعی

[145]- هەمان سەچاوە، ٣٧

[146]- هەمان سەچاوە، ٣٧

وئیسلامی تاکە کەسی، وئیسلامی ئەندۆنوس، وئیسلامی عەرەبی، وئیسلامی ئێرانی، وئیسلامی عێراقی، وئیسلامی ئەشعەری، وئیسلامی شامی، و..هتد، ئەمەش بۆ ئەوەیە بە تەواوەتی ئیسلام هەڵبوەشێنێتەوە و بە ئاسانی بەربای بکەن، و وایلێبکەن کە ئەو ئیسلامەی خەڵکێکی زۆر دوای کەوتوون وپێشوازیان لێکردووە و وەریانگرتووە ئەوە ئیسلامێکی خەیاڵیە ودوورە لە ئیسلامی ڕاستەقینەوە، ئیسلام ئەوە بووە کە لە ڕابردوودا جێبەجێ کراوە، وە ئێستا ئیسلامێکی ڕاستەقینە لە ئارادا نییە کە بگەڕێینەوە بۆ سەری و ئێمەش ناتوانین ئیسلامی حەقەیقی دیاری بکەین وهیچ پێوەرێکیش بۆ ئەو بابەتە نییە. چونکە ئیسلام هەرگیز تەواو نابێت، بەڵکو دەبێت بۆ هەموو قۆناغێك ئیسلام سەرلەنوێ دیاری بکرێت وپێناسە بکرێتەوە[١٤٧].

[١٤٧] - مآل الإسلام فی القراءات العلمانیة

٩. خۆ داڕنین لە موقەدەس وپیرۆزی، ئەمەش بە چوونە نێو ناوچە حەرامەكان و ئەنجامدانی یاساغ كراوەكانی دوێنێ، و خۆ دوور گرتن لە چاودێریە كۆمەڵایەتیەكانی ئەمڕۆ و دووبارە كۆڵینەوە لە هەموو بیروباوەڕە دینیەكان و خوێندنەوەی تازە بۆ گووتاری ئیسلامی، ئەیانەوێت كۆشكی شەریعەت بڕوخێنن و بە تەقلیدی ناوزەندی دەكەن و ئەشیانەوێت هەر بە ئامێری عەرەبی بیڕوخێنن وتێكی بدەن، وە كەسیش باس لە نوێ بوونەوە نەكات، بەو مانایەی سەر لەنوێ دەست پێبكرێتەوە، بەڵكو هەمووی بانگەشە بۆ چاكسازی و نوێ بوونەوە و گەڕانەوە دەكات بۆ ڕابردوو.[١٤٨]

١٠. لە زۆربەی كۆمەڵگاكانی ڕۆژئاوا لە سایەی عەلمانیەتدا كە بە هۆی ئەوەی حساب بۆ خوا و ئاین وڕۆژی دوایی ناكرێت، خێزان و كۆمەڵگا لێك هەڵوەشاوەتەوە، و ئەخلاق داڕوخاوە، و غیرەت پارێزی نەماوە، شەرمو شكۆ و پەردە نەماوە، بۆیە

---

[١٤٨]- هەمان سەچاوە،.

چەندین نەخۆشی عەقڵی وسایکۆلۆژی وکۆمەڵایەتی سەریان هەڵداوە،[149] دیاری دەستیان بۆ هەموو کۆمەڵگەیەکیش هەر ئەمانەیە، کەواتە ئەگەر کۆمەڵگەی ئیسلامیش ڕەوتی عەلمانی قەبوڵ بکات و پەیڕەوی لە بەرنامەکانیان بکات هەر ئەو سەرەنجامەی دەبێت و بە دەردی ئەوان دەچێت.

**هەڵوێستی عەلمانیەت سەبارەت بە ئیسلام و ئیمان:**

ئەو عەلمانیەتەی باس وخواسی رابوورد پێویست بە هەڵوێستە کردن و ڕاوەستان ناکات لەسەر ئەوەی کە ئایا هەڵگری پەیام و شەپۆلێکی بێ دینین، ئەگەرچی بە ئاشکراش دیدو بۆچونیان ئاشکرا نەکەن ودەرینەبڕن، ئەوانەشیان کە قسە دەربارەی ئیسلام وئیمان دەکەن ئەوا مەبەستیان ئەو ئیسلام وئیمانە نییە کە خوای مەزن بڕیاری لەسەر داوە ودایبەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)، ودەربارەی دەفەرموێت:

[149] - چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم ، ل٨٩.

(إن الدين عند الله الإسلام[150]). (ومن يبتغ غير الإسلام دينا فلن يقبل منه وهو في الآخرة لمن الخاسرين)[151]. بەڵکو ئەو ئیسلامە نوێیەکەی ئەوان ئەیانەوێت و دروستیان کردووە، ئەو ئایینە تێر وتەواوە نییە کە خودا دەیەوێت و دەربارەی دەفەرموێت: (اليوم أكملت لكم دينكم واتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام دينا)[152]. ئەو ئایینەی ئەوان ئایینێکە هەڵقوڵاوی بیر وهزری خۆیان وسروشتە، نەك ئایینێك کە لەسەر پێنج بنەمای (شەهادە، نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج) بنیاتنرابێت و شەهادە بدەن بە تەنهایی خودا وبە پێغەمبەرایەتی (محمد ﷺ)، چونکە ئەمە بەلایانەوە هیچ مانایەکی نییە و دەڵێن شەهادەت واتە شایەتیدان لەسەر کات وڕۆژگار، وە نوێژیش پێویست ناکات ئەنجام بدرێت، چونکە سەرەتا بۆ ئەوە بووە کە ڕاهێنانێك بێت

---

[150] - سورة آل عمران/ الاية:١٩.

[151] - سورة آل عمران/ الاية:٨٥.

[152] - سورة المائدة/ الاية: ٣.

بــۆ فەرمانبــەرداریکردنی ســەرۆك وســەرکردە، ولــە ئــەمڕۆدا (یۆگــا)کردن بــووە بــە بــە دیلێکــی بــاش بــۆ نوێــژ، زەکــات دەرکــردنیش بــە هــەمان شــێوە هــیچ پێویســت ناکــات، چــونکە ناهێڵێت داهاتێکی گەورە وقازانجێکی زۆر بە دەست بهێنرێت، دەشـڵێن: زەکـات و پێشـەکیەکە بـۆ ئـەوەی ڕوو بکەینـە ڕژێمـی ئابووری کۆمۆنستی.

ڕۆژوو گـرتنیش بـە لایانـەوە شـتێکە بە ویسـتی مرۆڤـەکان خۆیانە وپێویست کراو نییە لەسەریان، بەڵکو بۆ ئەم سەردەمە نابێت موسڵمانان بە ڕۆژووبن، چونکە داهاتیـان کـەم دەکاتـەوە، وبەرژەوەندیەکانیان لە دەست دەدات.

هــەروەها حــەجیش یەکێکــە لــە دروشمــەکانی عەرەبــە بتپەرســتەکان، و ئیسـلام لەبـەر خـاتری عـەرەب ئـەم دروشمـەی هێشتووەوە، حەجکردن بۆ دووبارە زیندووکردنەوەی تەجرەبەی سێکسی نێوان (ئادەم وحەوا)یە، هەر وەك دەڵێن گۆڕانی (قیبلـە) گوزارشتە بـۆ بـە عـەرەبکردنی ئیسـلام وجـەخت کردنـەوە لەسـەر

عەرەبیـــەتی ئیســـلام. ئەمـــە کورتـــە وپوختـــەی هەڵوێســـتیانە دەربارەی پێنج پایە سەرەکیەکەی ئیسلام.

هـەروەها سـەبارەت بە ئیمـانیش دەڵێن: بە هاتنـەدی لایەنـە ڕۆحیـــەکانی ئیســـلام ئیســـلامی بـــوون دێتـــە دی، دروشـــم و شـیعارەکانیش ئـەنجام نـەدرێن، هـەر وەك دەڵـێن مزگەوتـەکان بوونەتە مۆڵگەی تیرۆریستی و سیواك، ڕیش، بالأپۆشی مایـەی دواکەوتنن، ئیتر بەم شێوازە و لە ژێر ئەم دروشمانـەدا ئیسلامی حـــەقیقیان ڕووپـــۆش کـــردووە و ئیســـلامێکی ناڕاســـتی دروستکراوی عەلمانییان لە جێیدا داناوە، کە بە لایانەوە قابیلی هەموو دەستکاریکردن و تێکەییشتنێکە.

ئیمان بە لایانەوە دوورە لەو شەش پایـەی کە باوەڕ هێنانـە بـە (خـودا، فریشـتـەکانی، پەیامـەکانی، پەیامبـەرەکانی، ڕۆژی دوایی، قەزاو قەدەر بە خێر و شەڕیەوە). کێشـەی ئیمان لەگەڵ ئەواندا ئەوە نییە کە سەر بۆ بت دابنەوێنرێت، بەڵکو کێشـەی ئیمـان لـەم سـەردەمەدا ڕووکردنـە لـە سروشـت لـەبری ڕووکردنـە

خوای گەورە و غیابی خودایە لە دروستکراوەکانی، ئەیانەوێت بەم کۆمەڵە بۆچونانەیان بێ بڕواییە خۆرئاواییەکان بخزێننە نێو بازنەی ئیسلامەوە، بۆ ئەم مەبەستەش هەندێکیان ئیمانیان تەنها لە دوو بنەمادا قەتیس کردووە:

یەکەم/ بڕوابوون بە خودا.

دووەم/ بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی.

هەندێکی دیکەشیان ئیمان بەرجەستە دەکەن تەنها لە:

یەکەم/ بڕوابوون بە خودای مەزن.

دووەم/ دامەزراوی.

بەمەش ئەیانەوێت گاور وجووەکان (یەهود ونەصارا) وبوزی وهەموو ئایینە دەستکردەکانیتر بخەنە نێو بازنەی ئیسلام وئیمانەوە، گوایە لە ڕۆژی دواییدا ڕزگاریان دەبێت و پیشت بەم فەرمایشتە دەبەستن کە بە هەڵە تەفسیری دەکەن و بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاری دێنن: (إن الذين آمنوا والذين هادوا والنصارى والصابئين من آمن بالله واليوم الآخر وعمل صالحا

فلهم أجرهم عند ربهم ولاخوف عليهم ولاهم يحزنون).[153] بە شتێکی سەیر ومەحاڵی دادەنێن ئەو هەمووە خەڵکەی دوور لە یاسای ئیسلامن لەسەر گومڕایی وناڕاست بن وبچنە ناو دۆزەخەوە. وە ڕاڤەی تەوحید و یەکتاپەرستی بە یەکێتی ویەکبوونی بیر وهزر لێکدەدەنەوە، نەك یەکتایی خوای مەزن، (أجعل الآلهة إلها واحدا أن هذا لشيئ عجاب).[154] ڕاستی ڕوداوەکانی ڕۆژ ی دوایی وەك پردی صیرات و عەرش و کورسی پەری و شەیتان و نامەی تۆماری بەندە لە فکر و بیری ئەواندا تەنها چیرۆك و ئەفسانەیە و هیچی دی.

دەربارەی کتێبە ئاسمانییەکان و لەناویشیاندا قورئانی پیرۆز، نکۆڵی لە بوونی غەیب دەکەن و دەڵێن غەیب لە قورئاندا بریتیە لە داهاتوو، داهاتووش بە لۆژیك و هەژماردن پێی دەگەین، ئەو زیندوو بونەوەیەی کە قورئان باسی ئەکات لە

---

[153] – سورة البقرة/ الاية:٦٩.

[154] – سورة ص الاية:٢.

ئاسمانـدا نییـە و زینـدوو بونـەوەی پـاش مـردن نییـە، بـەڵکو زیندوو بوونەوە لـە جیهانی کۆرپەلـەیی و بـێ ئاگاییدا ڕۆیشتنە بۆ جیهانی بەرەو پێشچوون و ئاگایی بوون.

بـڕوا بـوونیش بـە پـەری و فریشـتە هـیچ پێویسـت نییـە، چونکە ئیمـان و باوەڕ ئەوەیـە لـە دڵ و دەروندا چەسپابێت و بە کـردەوەش ئـەنجام بـدرێت، پێویسـت بـەوە ناکـات بڕوامـان بـە گاڵتەجاڕییەکانی دواڕۆژ هەبێت. _معاذ الله_

بەهەشـت و دۆزەخـیش لـە دواڕۆژدا بـوونی نییـە، بـەڵکو بەهەشـت و دۆزەخ بـریتین لـە خۆشـی و ناخۆشـیەکانی ژیـانی دنیا، حورلعەین وخۆشیەکانیش گوزارشتن لـە هونـەر وژیانێکی دڵنیایی لە دنیادا.[155]

بە کورتی: عەلمانیەکان بە هەموو شێوەیەك سوورن لەسـەر بەربـەرەکانی کردنـی حەقیقـەتی ئیسـلام وبێزراوکردنـی لـەپێش چاوی موسڵمانانـدا، وهەوڵ دەدەن بۆ بڵاو کردنـەوە وسـەپاندنی

[155] - مآل الإسلام فی القراءات العلمانیة.

بەرنامە بێ سەر وبەرەکانیان، یاری بە هزر وبیری خۆیان وشوێنکەوتووەکانیان دەکەن، بەلأم لە هەموو ئەم تەفسیراتانەیاندا خۆیان وشوێنکەوتوانیشیان فریوداوە وهیچیتر، چونکە بیروباوەڕ ویەکتا پەرستی دروشمی ژیانی مرۆڤەکانە و تاکە ووشەیەکی سادە وبێ مانا نییە کە لە زار بێتە دەرەوە، بەڵکو دروشمی یەکتا پەرستی باوەڕێکە هەڵگران وبێژەرانی دەیسەلمێنن کە سەرجەم بوارە فکری ودەرونی و ڕەووشتی و عەمەلی و کۆمەڵایەتیەکانیان بە کێشانەی ئەو یەکتاپەرستیە مەزەندە دەکەن و لەسەر ڕێڕەوی لانادەن و ئیسلام و ئیمان سەرجەم بوارەکانی ژیانیانی گرتووەتەوە و کردوویانە بە کالأی بالأیان.[156]

[156]- ئەم ڕێچکانە بناسە ، ل ٢٥-٢٦.

## سەرچاوەکان

١_ صراع الأفكار في المجتمع الإسلامي: الدكتور محسن عبدالحميد، الطبعة الأولى، ١٤١٩هـ _ ١٩٩٨م، مطبعة وزارة التربية.

٢_ مآل الإسلام في القراءات العلمانية: الدكتور أحمد إدريس الطعان، قرص مكتبة الشاملة/ الإصدار الثالث. (٣.٢٩).

٣_ ئەم ڕێچکانە بناسە: عەلمانیەت، تەبشیر، بوزیەت: دانا عیمان حسن، چاپی یەکەم، ١٤٢٠ك _ ١٩٩٩ز.

٤_ چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم: عەلی باپیر، چاپی دووەم، ١٤٢٤ك _ ٢٠٠٣ز.

٥_ سۆزی نەتەوایەتی وبیری ناسیۆنالیزم: عەلی باپیر، چاپخانەی تەفسیر، چاپی یەکەم، ١٤٢٦ك _ ٢٠٠٥ز.

٦_ ئیسلامیەکان وحیوار لەگەڵ عەلمانیەکان: مێزگردی نێوان: د. محمد عەمارە، د. گارق البشری، د. کمال أبوالمجد، وەرگێڕانی عمر بێژاوی، چاپی یەکەم، ١٩٩٩ز.

٧_ ديالۆگى ئيسلام _ عەلمانيەت: ووتو وێژى: ئەبو دوعا، ئازاد عەلى، ئامادەكردنى: ئيبن بلدى.

٨_ هەڵوێستى ئيسلام بەرامبەر بە عەلمانيەت: محمد عبدالهادى المصرى، وەرگێڕانى: عزالدين عبدالرحمن امينى، چاپى دووەم، ١٤٢٤ك _ ٢٠٠٣ز.

٩_ گۆڤارى نمانا، بەكر حمە صديق عارف، ژمارە ٣/ هاوينى ١٩٩٩.



# نووسەرانی عەلمانی کورد چی دەخوێننەوە؟

نووسینی: إسماعیل طه ها



پرسی قسەکردن لە سەر چەمك وفکرو فەلسەفەو ئادیاکان پرسێکی گرنگە، پێویستە مرۆڤی ڕۆشەنبیر زۆر بە هەستیاری وبابەتیانە مامەڵەیان لەگەڵ بکات.

ئەوەی ئەمڕۆ لە کوردستان دەخوێنرێتەوە لە لایەن نوسەرە عەلمانیەکانەوە، نوسینی چەند نوسەریکی بارگاوی بەفکری مارکسی، دوای ئەوەی فکرەکەی خۆیان داڕووخا، هاتن لە پەنای ئیسلامەوە، دەستیان بەنوسین کردەوە، بەو هیوایەی، بتوانن تەکانێك بە بیری مردووی مارکسیزم بدەنەوە، ناویان نا (الیسارالإسلامی)[157] دەستیان کرد، بەبڵاوکردنەوەی نوسینەکانین، سەرەتا گۆڤارێکیان بەم ناوەوە دەرکرد، بەمەش بو بە سەرچاوە بۆ عەلمانیەکان لە وڵاتی ترەوە بۆ ئەوەی، لەم سەنگرەوە تیرەکان بگرنە ئیسلام، ئەمە جگە لەوەی ئەو نوسەرانە هەر یەکێك لەوانە پشت بە فکری فەیلەسوفێك، یاخود رۆژهەڵاتناسێك دەبەستێت، دیارە زۆربەی نوسەرانی کورد لە

١٥٧- بروانە: گۆڤاری الیسار الإسلامي ژمارە١ .

ڕەخنەگرتن لە ئیسلام پشت بەنوسەرانی عەرەب دەبەستن، بۆیە زۆر جار هەڵەکانی ئەوان ئەوان دووبارە دەکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە قسە دەکەن خۆیان وەك سورچاکێکی ئەم مەیدانە دەردەخەن، ئینجا ئەم نوسەرانەی کە ئەوان پشتیان پێدەبەستن لە ڕەخنەکانیان بەلێکۆڵینەوەی زانستی دەرکەوتوە کە لە نوسیەکانیان چەندین تدلیس ولادانیان ئەنجام داوە بۆ ئەوەی لەکۆتای بگەنە ئەو ئەنجامەی دەخۆیان دەیانەوێت.

کاتێك ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن، ئایە ئەو فکرەی کاری لەسەر دەکەن یاخود زادەی بیری خۆرئاوایە؟ دەچێتە خانەی داهێنان، یاخود دەچێتە خانەی شوێنکەوتنی کوێرانە؟ ئەوەی لەم بابەتە خراوەتە روو دیدی سێ نوسەری کوردە، کە وەك ئیسلامناس خۆیان دەردەخەن لێرەوەولەوێ، ئەوکارەکەی کەمن پێی هەڵساوم پیش من چەند کەسێك وەڵامی کارەکانیان داوەنەتەوە، ئەوەی من کردووە، تەنها خستنە رووی سەرچاوەی فکریانە لەگەڵ دووبارەکردنەوەی ئەو وەڵامانەی لە لایەن نوسەرانی بەرێزەوە دراوەتەوە، لەگەڵ ئاماژەکردن بە ناوی نوسەرەکان.

## بەشی یەکەم

**فوئاد مەجید میسری.**

فوادی مەجید میسری یەکێکە لەو بەناو نوسەرانەی، کە ساڵانێکە لە بابەت لەسەر ئیسلام ومسوڵمانان دەنوسێت، یەکێکیشە لە عەلمانیە توندرەوەکان، ئەوەندەی ئێمە بە دواچونمان بۆ کردبێت خاوەنی دوو کتێبە لەسەر فکرو مێژووی ئیسلامی، کە بریتین لە کتێبی بیری ئوسوڵی ئیسلامی وخوێندنەوەیەکی سۆسیۆلۆجی، لەگەڵ کتێبی کۆمەڵگا لەسەیەی دەوڵەتی خەلافەت دا.

هەر کەسێك ئەم دوو کتێبەی میسری بخوێنێتەوە ئەزانێت کە ئەم کابرایە ئە نوسینانە وەرگیراوە لە فکری عەلمانیەتی عەرەبی، چونکە میسری هەمان هەڵەی عەلمانیەکانی دووبارە کردۆتەوە، خۆی پێی زانیبێت یاخود پێی نەزانیبێت.

بۆ ئاشکراکردنی هەندێك لە هەڵەکانی ئێمە تەنها دوو سەرچاوە دەستنیشان دەکەین، ئەوانیش هەردووکتێبی کاك

فـازڵ قـەرەداغی و کـاك ئیکـرام کـریم، ئـەم دوو بـەڕێزە هـیچ مـەجالێکیان بـۆ ئێمـە نەهێشـتۆتەوە بـۆ ئـەوەی ڕەخنـەیان لـی بگـرین، چـونکە ئەوەنـدە بـە وردی شـەن وکـەوی نوسـەنەکانی فوادیان کـردووە، بـۆ دەبێـت بگەڕێینـەوە بۆ کتێبـەکانی ئـەم دوو بەڕێزە بۆ ئاشکرا کردنی مەنهەجی میسری، کە بزانین چۆن کاری لەسـەر بابەتـە ئیسـلامیەکان ومێـژوی ئیسـلامی کـردووە، لەگـەڵ دەرچونی ئەم دوو کتێبە میسر نـەیتوانی بچوکترین وەڵامـی ئـەم دوو کتێبـە بداتـەوە پارێزگـاری لـە بـۆ چـونەکانی خـۆی بکـات ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتـەوە کـە میسـری نوسـینەکانی لەشـوێنی دزیـوە، سـەرەتاش بـاس لـە کتـێبی بـیری ئوسـوڵی ئیسـلامی خوێندنەوەیەکی سۆسیۆلۆجی دەکەین[١٥٨].

یەکەم میتۆدو ئامانجی کتێبەکە:

بـردن نەپاراسـتنی ئەمانـەتی نوسـین، کـە دیـاترین ئـەخلاقیاتی نوسـینی زانسـتیە، بـەکارهێنانی سەرچـاوەی زۆر،

١٥٨ ـ بیری ئوسوڵی ئیسلامی لە نێوان خویندنەوەو نەخوێندەواریدا

بەبێ گەڕانەوە بۆ زۆربەی سەرچاوەسەرەكيەكان، بەهۆی سەرچاوەی دووەمەوە، ميسری لەم ديدگايەوە كتێبەكەی نوسيوە كە تێيدا ئەو ئامانجە بپێكێت، كە پێشتر دياری كردوە، وەك بانگەشەكردن بۆ لە ڕيشەهەڵكێشانی ئيسلاميەكان بەهەمو ڕەوتە جياوازەكانەوە، مادام مسوڵمانن، جياوازی لە نێوان توندڕەو ميان ڕەو نيە، چونكە داوای چەسپاندنی شەريعەتی ئيسلامی دەكەن، ميسری هەميشە ئيسلاميەكانی كوردستان بەمە تۆمەتبار دەكات كە خزمەتی بەرژەوەندی عەرەب دەكەن[١٥٩]، لە پێناو شێواندنيان لەپێش ڕای گشتی[١٦٠]، زۆرجار ئەم جۆرە نوسەر لەپەنای ئيسلاميەكانەوە ڕەخنە لە ئيسلام دەگرن، كە

١٥٩ـ لەكاتی نوسينی ئەم دێرانە پرسی نوسينەوەی دەستوری مصری لە ئارادابوو، يەكێك لەوانەی كە زۆر سەرسەختانە هێرشی دەكردە سەر ئيخوان وديفاعی لە عەلمانيەكانی مصر دەكرد، فواد سەتەلايتی گەلی كوردستان، هەر كەس سەيری بكردايە وای دەزانی ئەمە كەناڵی بەرادعيە، ئەمە جگەی لەوەی ساڵانە ميوانداری گۆرانی بێژو ئەكتەرە عەرەبان دەكەن، سەردان ڕێك دەخەن بۆ كەناڵە عەرەبيەكان وپارەی ميلەت بەهەدەر دەدەن بەناوی هونەرو گۆرانيەوە.

١٦٠ ـ سەچاوەی پێشو دوای لاپەرە ٩ بەدەستكاريەوە. .

ئامانجی سەرەکیان ئیسلامە، فواد زانیاری لەسەر زۆربەی ئەم بابەتانە نیە کە لەکتێبەکەی قسەی لەسەر کردوون، کە من لێرە هەندێکی لێ باس دەکەم.

١ـ نەشارەزایی بە زانستی فقە:

فواد مجید فقهی ئیسلامی بەوە تۆمەتبار دەکات کە فقهێکە داهێنانی مرۆڤەو خراوەتە ئاستی قورئان، بەرگی موقەدسی کراوەتە بەر، کراوە بە بەشێك لە بیروباوەر، ئەم فقهە کۆسپێکی گەورەیە لە لەپێش بنەماکانی شەریعەت بۆ ئەوەی لەگەڵ زەمان بکونجێت[161]، ئەوەی ئاشکرایە کە فقهی ئیسلامی هەندێکی لە قورئان هاتوە، هەندێکی لە سونەت هەندێکیش ئیجتهادی زانایانە، لەهیچ سەردەمێکیش فقە بەشێك نەبوە لە عەقیدە، چونکە بواری عەقیدە جیایە لە بواری فقە، ئەمە جگە لەوەی میسری وشەی ئیمانی لەجێگای عەقیدە دانانەوە[162].

---

١٦١ـ بیری ئوسوڵی ئیسلامی لە نێوان خویندنەوەو نەخوێندەواریدا لاپەرە ٩ بەدەستکاریەوە.

١٦٢ـ سەرچاوەی پێشوو٩

## ٢ـ میسری جەهلی بە فەلسەفە:

یەکێك لە نیشانەکانی میسری جەهلیەتی بەرامبەر فەلسفە، میسری هیچ شارەزایەکی لێی نیە، خۆشی نازانێت باسی چی دەکات، کاتێك دەڵێت: ئوسوڵیەتی ئیسلامی وەك کەنیسەیە لەسە دەکانی ناوەراست، کە دژی هەمو دەستکەوتەکانی زانست بوو، پاشان دەستی بەدژایەتی داروینیەت کرد، فەلسەفەی زانست بە قۆناغەکانی گەشەی مێژووی و دیالێکتێکب تەبیعە، ئیسلامیەکان پێیان وایە کە ئەوەی ئێمە باسی دەکەین لە بواری فکر وفلسەفەی جولەکەیە، ئەوەی میسری باسی دەکات هەڵەیە چونکە کەنیسە لەسەدەکانی ناوەراست دژی هەمو دەستکەوتێکی زانستی نەبوە و پێشکەوتن نەبووە، میسری تێروانێکی نازانستی هەیە، ئەمی ئەو باسی دەکات مارکسیەتە لە بابەتی خۆی، ئەو باسی داروین گەشەی مرۆڤ دەکات، پاشان باسی دیالیکتی تەبیعە دەکات، کە سەرچاوەی ئەم دیالیکتیکە دەگەڕێتەوە بۆ هێگڵ، مەبەستی سەرەکی میسری ئەوەیە بڵێت:

کە ئیسلام دژایەتی زانست دەکات.[163]

٣ـ نەشارەزایی بە بیریارانی ئیسلامی:

کەسێك نەزانێت کتێبی ( في ظلال القرآن )ی سەید قوت چیە، چۆن بابەتیانە دەتوانێت قسە لەسەر سەید قوتب بکات؟

فواد دەڵێت: هەر کەسێك سەیری تیۆرەکانی سەید قوتب و ئەبو ئەعلای مەودودی و مستەفا شکری وعبدالسلام محمد فەرج وحەسەن بەناو محمد ڕەشید ڕەزا و پێش ئەوانەش ئیمام شافعی بکات دەگاتە بەرەگەزپەرستی عەرەبی بە بەرگێکی دینیەوە[164].

لەوە دەچێت کە میسری شتێکی بیستبێت بەناوی (في ظلال القرآن) پاشان یەکسەر هاتوە قسەی لەسەرکردوە، کە دەڵێت: سەید قوتب لە بابەتێکی بەناوی (في ظلال القرآن)، ئایە (في ظلال القرآن) کتێبێکی شەش بەرگیە بۆ تەفسیری قورئان، یاخود بابەتێکی ئاساییە[165].

---

١٦٣ـ سەرچاوەی پێشوو٩

١٦٤ـ سەرچاوەی پێشوو١٩

١٦٥ـ سەرچاوەی پێشوو

هەر كەسێك نوسینەكانی سەید قوتب بخوێنەوە ئەزانێت كە سەید قوتب لە هەمو كەسێك دوورتر بوە لە ڕەگەزپەرستی قەومی، هەروەها دژایەتی تەواوی قەومیەت رەگەزپەرستی دەكرد، نشتیمانی سەید قوتب دارالإسلام بو، ئینتمای بۆ ئیسلام بوو، ئەمەشی بە ڕاشكاوی گوتوە لە تەفسیرەكەی كە دەڵێت: ئەم ئالآیەی مسوڵمان پارێزگاری لیّ دەكات ئەمە بیروباورەكەیەتی، ئەم نشتیمانەی جیهادی لە پێناو دەكات كە شەریعەتی خوای تێدا دەچەسپێنێت، ئەم زەویەی كە پارێزگاری لێدەكات ئەمە دارالإسلام، كە ئیسلام دەكات بە بەرنامەی ژیان، هەمو تێروانینێكی تر بۆ نشتیمان تێروانینێكی نائیسلامیە، كە دەبێتە هۆی گەشەپێدانی جاهیلیەت، كە ئیسلام ناناسێت[١٦٦].

ئەگەر سەیری سەرچاوەكانی ئەم كتێبەی میسری بكەین دەبینین چۆن هەڵس وكەوتی لەگەڵ سەرچاوەكان كردووە، ئایە ئەم كتێبەی لەسەرچاوەی ئەسڵیەوە نوسیوە، یاخود لە چەند سەرچاوەیەكی عەلمانیەكانەوە نوسیوەیەتی.

---

١٦٦ــ في ظلال القرآن: دارالشروق ج ٢ / ص ١٨٣.

کاک فازڵ قەرەداغی ئامارژە بە شتێك دەكات كە كتێبەكەی فواد لە پێنج [167] کتێب كۆكراوەتەوە، لە لیستی سەرچاوەكانیشی زیاتر لەسەد سەرچاوەی نوسیوە، كە ئەمانە هەندێكیانە.

١ـ حوار العلمانية لفرج فودة أحد منظري العلمانية أشار ميسري إليه واستشهد به على الإسلام، والإسلاميين.

٢ـ نصر حامد أبوزيد: كتاب الإمام الشافعي وتأسيس ايدولوجية الوسيطية، وكتاب نقد الخطاب الديني

٣ـ قاسم: أمين تحرير المراة

٤ـ عبدالجواد ياسين: السلطة في الإسلام

٥ ـ علي الوردي: لمحات اجتماعية في تأريخ العراق.

٦ـ هادي العلوي: من قاموس التراث.

٧ـ حسين مروة: النزعات المادية في الفلسفة الإسلامية.

---

١٦٧ـ التطور الفكر السياسي في الإسلام خديجة النبراوي ودكتور محمد نصر مهنا دارالمعارف القاهرة ١٩٨٤ـ الأحزاب والحركات والجماعات الإسلامية المركزالعربي للدراسات الإستراتجي د. جمال الباروت، الصراع بين التيارين الديني العلماني في الفكرالعربي المعاصر محمد كامل ظاهر دار البيروني، الإسلام المعاصر قراءة في خطابات دمشق ١٩٩٤، مساهمة في إعادة كتابة التاريخ العربي برهان الدين دلو ١٩٨٥.

میسری لەپاڵ نوسی کتێبی بیری ئوسوڵی ئیسلامی کتێبی کۆمەڵگا لەسایەی دەوڵەتی خەلافەت نوسیوە، کە پڕیەتی لە درۆو دەستکاری کردن، دیارە ئەم کتێبەش لەلایەن کاك ئیکرام کەریم وەلام دراوەتەوە، بەناونیشانی دەوڵەتی خیلافەت وهەڵسانەوەی کۆمەڵگاو گەشەی شارستانیەت، میسری لەم کتێبەی کۆمەڵێك سەرچاوەی بەکارهێناوە بەلام دەستکاری ناوەڕۆکەکەی کردووە، نەیتوانیوە لێکۆلەرێکی بابەتی بێت، بەڵکو دەستکاری زۆربەی زانیاریەکانی ناوسەرچاوکانی کردووە، دیارە هەرکەسێك کتێبەکانی میسری بخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە میسری جگە لە بەکارهێنانی چەند رستەیەکی دووبارە شارەزایی لە بواری ئیسلام ومێژووی ئیسلامی نیە، بۆیەش زۆربەی جار کە لەگەڵ کەسانێکی ئیسلامی دەکەوێتە گفتوگۆ توشی هەڵچونێکی زۆر دەبێت.

نوسەر لەهەندێك شوێنی ئەم کتێبە لە گواستنەوەی زانیارەیەکان دەستکاری زانیارەیەکانی ئە سەرچاوانەی کردووە،

کە پشتی پێ بەستاون، بەتایبەتیش ئەم سەرچاوانەی کە دژی قورئان وفەرمودەو خەلیفەو هاوەڵانن[168].

**تێڕوانینێك بۆ کتێبی کۆمەڵگا لەسایەی دەوڵەتی خیلافەت:**

نوسەر هەر لە ناونیشانی کتێبەکەیەوە دژایەتی خۆی بۆ ئیسلام دەرخستوە.

کە ئەویش بە نوسینی: (کۆمەڵگا لەسایەی دەوڵەتی خەلافەت) هەرکەسێك سەرەتای زمانی عەرەبی بزانێت، کە وەشەی (خلافە) بە فەتحە جیاوازە لەگەڵ (خلافە) بە کەسرە، چونکە (خەلافە) بەوتای گێلیەتی دێت، بە پێچەوانەوە (خیلافە) بەکەسرە، کە بە واتای پیشەوایەتی وجێنشنیەتی دیت[169].

لە بارەی تەفسیری مێژوە فواد وەك نوسەرە عەلمانیو مادیەکان، تەفسیری مادی بۆ مێژوو وەرگرتوە، کە بە مادەیەتی مێژووی بەناوبانگە لای مارکسیەکان، لە بەرامبەردا چەندین تەفسیری تر هەیە زۆر بابەتیتر وبەهێزترن بۆ مێژوو، دەکرێت

١٦٨ . بڕوانە: بوژاندنەوەی کۆمەڵگاوگەشەسەندی شارستانیەت إکرام کریم ٣.

١٦٩ . بڕوانهە: بوژاندنەوەی کۆمەڵگاوگەشەسەندی شارستانیەت إکرام کریم ٤

مێژو پاڵنەری مادی هەبێت، بەهەمان شێوەش دەکرێت پاڵنەری ئاینی وپاڵنەرەکانی تریشی هەبێت[١٧٠].

چونکە تەفسیرەکان جۆراوجۆرن، تەفسیری مارکسی[١٧١]، ماتریالی هێگلی[١٧٢]، شارستانیەتی تۆنیبی[١٧٣]، تەفسیری نەتەوەیی،[١٧٤] تەفسیری جنسی لای فرۆید[١٧٥]، تەفسیری مرۆڤی لای مسعود محمد، چەندین تەفسیری تریش هەیە، بەڵام لەم هەمو تەفسیرە میسری تەنها تەفسیری مادی وەرگرتوە.

ئەمەی جێگای تێرامانە میسری هیچ لایەنێکی ئیسلام سەرسامی نەکردووە، بەڵکو ئیسلامی لە سەرەتاوە تا کۆتای لای ڕەفزە، پێی وایە کە ئاینی ئیسلام وەك ئاینی نصرانیە، دەوڵەمەندی و هەژاری دەخاتە ویست وئیرادەی خوای گەورەو

١٧٠- سەرچاوەی پێشوو لا ٥

١٧١- د.محمد بن صامل السلمي منهج كتابة التاريخ الإسلامي تاليف: دار إبن الجوزي السعودي ص ١٦٦

١٧٢- سەرچاوەی پێشوو لا١٧٠

١٧٣- سەرچاوەی پێشوو لا ١٧١

١٧٤- سەرچاوەی پێشوو لا ١٧٢

١٧٥- سەرچاوەی پێشوو لا ١٧٣

شایەنی گۆڕان نیە، خاوەنی بیروباوەری دروست ئەم کەسەیە کە ناخۆشـی بچـێژێت لـە دونیـا بـۆ ئـەوەی لـە دوارۆژ بەختـەوەر بژیت[١٧٦].

هەرکەسێك شتێك لە ئیسلام بزانێت، لای رونە کە پرسی کارکردن یەکێکە لە پرسەگرنگەکان بۆ گەشەپێدانی کۆمەڵگا، ئەمەش لەسەر دەمی پێغەمبەر وهاوەڵانی رەنگی دابویەوە، بەڵام میسـری ئەمانـەی تێکـەڵ کـردووە، چـونکە هـیچ زانیاریـەکی لـەزمانی عـەرەبی نیـە، ئـەگینا قورئـانی پـیرۆز هـانی زۆری مرۆڤـەکانی داوە بـۆ ئـەوەی بـەدوای رۆزی بگـەرێن، زەوی بـۆ رامکـردوون بـۆ ئـەوەی کـون وکەلەبـەرەکانی بگـەڕێن لـە پێنـاو دۆزینەوەی کانزاکان، ئەوەتە لەم ئایەتانە دەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ﴾ الجاثية١٣ ﴿ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاء بِنَاء﴾ البقرة٢٢. ﴿ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجْنَا بِهِ

---

١٧٦ـ فؤاد مجید میسری کۆمەڵگا لەسایەی دەولەتی خەلافەت ١١٥..

أَزْوَاجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّى﴾ طـه٥٣، و﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ ﴾ الملك ١٥ ، لە پێناو گەشـەپێدانی زەوی دەفـەرموێت: ﴿ هُـوَ أَنشَـأَكُمْ مِـنَ الأَرْضِ وَاسْـتَعْمَرَكُمْ ﴾ هود:٦١.

لەبـــەر ئـــەوەی میســـری تـــەنها جـــارێکیش قورئـــانی نەخوێندۆتەوە، بۆیە هیچ شارەزایەکی لە توراسی ئیسلامی نیە، بۆیـــە وا دەزانێـــت ئیســـلامیش وەك مەسـیحیەتە، ئەگـەر تـەنها جومعەیەك گوێی لە وتارێکی هەینی بگرتایە ئەوکات گوێی لـەم ئایەتە دەبوو، کە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (الجمعة/ ١٠).

مـەنهجی ئیســلامی ڕازاوەیـە بـەکارکردن بـۆ پێداویســتی ڕۆژانــە، لەگـەڵ پاکردنـەوەی دەرون وپەیوەســت بـون بــەخوای گەورە لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خواو خۆئامادەکردن بۆ ڕۆژی دوایـی، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَابْتَـغِ فِيمَـا آتَـاكَ اللَّـهُ

الدَّارَ الآخِرَةَ وَلا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا﴾ (القصص/ ٧٧)، چونکە لە ئیسلام سەرجەم وزەی مرۆڤ بۆ ئەوە نییە کە تەنها بۆ خۆشگوزەرانی دونیا بژیت، یاخود بەپێچەوانەوە تەنها بۆ دوارۆژ بژیت، بەڵکو دەبێت بۆ دونیاو دوارۆژی کاربکات.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزەوە بانگی خەڵك دەکات بۆ کارکردن، هانیان دەدات، بۆ ئەوەی ژیانێکی باش بگوزەرینن چێژ لە ماندوبونەکانیان وەربگرن لە پێناو سود گەیاندن بەخەڵك وسود وەرگرتن، خوای گەورە ژیانی ناخۆشی ناوێت بۆ بەندەکانی رقی لە کارنەکردنە، ئەبینین دەفەرموێت: ﴿ فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ ﴾ (الملك/ ١٥).

خوای گەورە زەوی درستکردوە پڕی کردووە لە نیعمەت، لە پێناوی ئەوەی مرۆڤەکان بەخۆشگوزەرانیەکی فراوانەوە بژین، کە دەفەرموێت: ﴿ وَآيَةٌ لَهُمُ الأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ * وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا

مِنَ الْعُيُونِ * لِيَأْكُلُوا مِنْ ثَمَرِهِ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلا يَشْكُرُونَ ﴾ (يس/ ٣٣-٣٥).

مرۆڤ ناتوێنت ئەم نیعمەتانە بەدەست بهێنێت تەنها دوای هەوڵ وماندوبون نەبێت.

ئەمەی سەیر میسری ئەم هەمو رەخنەیە لە ئیسلام ومێژوی ئیسلامی دەگرێت، بەڵام خۆی تەحمولی بچوکترین رەخنە ناکات نەبۆ خۆی نەبۆ هاوبیرەکانی، لە چاپی دووەمی کتێبی کۆمەڵگا لەسایەی دەوڵەتی خەلافەت پێشەکیەکی درێژی نوسیوە تێیدا هێرش دەکاتە ئەو کەسانەی کە رەخنەیان لێی گرتوە، کە یەکێك لەوانە کاك محمد یوسف بەهۆی رەخنەگرتنی لە کتێبەکەی رەفیق سابیر، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەیە کە ئەك ئەمەی بەسەر رەفیق سابیر داهێنرا بەسەر میسریش دابهێنرێت، سوپاس بۆخوای گەورە دوای ماوەیەکی کەم سەرجەم شتەکانی میسری کەشف کە لەکوێی هێناوە، ئەم خۆی ئەم ئاستەی نیە

لێکۆڵینــەوەی ڕەخنــەی بنوســێت دژی ئیســلام ومســوڵمانان، بەهۆی ئەوەش کە نوسینەکانی هیچ بەهایەکی زانستیان نیە.

میسری کاتێك دیمانەی لەگەل دەکرێت لەکەناڵەکان چەند رســتەیەك فێربــووە، لەسەرســەرجەم دیمانــەکان دووبــارەیی دەکاتــەوە، ئــەویش وشــەی ئیســتاتیکا، یــاخود بــەراوردکردنی ئیسـلام ومەسـیحیە، کـە دەڵێـت، مەسـیحیەت تـەنها بیروبـارەوو رەوشتە ئەخلاقی لەگەڵە، بەڵام ئیسلام شەریعە[177].

میســری گشــتاندنێکی ترمــان پێشــکەش دەکــا ســەیرتر لــەوانی پێشــوو و دەڵــێ "ئیســلام قــابیلی ڕیفــۆرم نیــە چــونکە جیاوازی ئیسلام و مەسیحیەت ئەوەیە تێکستەکانی ناو ئینجیل ئامۆژگارین و ئەوانەی قورئان بوونەتە یاسا، یاسای خوایی کە ناکرێ مرۆڤ دەسکاریان بکا" گەر کەسێك تەواو جاهیل نەبێ

[177] ـ دوادیار کە ئەم قسانەی دووبارەکردەوە، بەرنامەی بەکراوەیی لەگەل ڕەنج تـەوەرەیی بەرنامەکـە پەیکـەر شـکاندن و مـەسـەلـەی ئـازادی تـاك و ئـەخلاقی کۆمەڵگەی کوردەواریدا. لە ٢٠١٣/١٠/٢٧ پێشکەشکرا.

قسەی وا ناکات. چونکە نە ئینجیلەکان هەمووی ئامۆژگارین نە قورئانیش هەمووی یاسایە. هەر کەسێك ئینجیلەکانی خوێندبێتەوە، زۆرێك لەو یاسایانەی پێش چاو دەکەون کە لە بواری ژیان بۆ شوێنکەوتووانی مەسیح دەستنیشان کراون، تەنانەت لە مەسەلەی جل و بەرگی ئافرەتان، قسە نەکردنیان لە کڵیساکان، مەسەلەی ژن هێنان، پەیوەندی نێوان تاکەکان..هتد. خۆ گەر پرسیاریش بکەین ئەی مەسیحیەکان لە سەدە ناوەڕاستەکان پێش ڕێنیسانس و تەنانەت دوای ڕێنیسانسیش بە چ یاسایێك بەڕێوە دەچوون جگە لە مەسیحیەت و یاسا کۆنەکانی ڕۆم، ئەوا دەبێ پرسیار لە خودی میسری بکەین بەڵکو وەڵامان بداتەوە!

لە میانی قسەکانی دەڵێ "بەعس عەلمانی نەبوو". بەڵگەشی ئەوەیە چونکە وەك خۆی دەڵێ "هیچ نیزامێك لە جیهانی عەرەب بە قەدەر بەعس ئیعتزازی بە ئیسلامەوە نەکردووە" ئەمەشیان سەیرو سەمەرەیەکە نە لە جیهانی کورد نە

هـی عـەرەب نـەهی شـوێنێکی تـر بیسـتراوە کـە کەسـێك لـە بـەر ئەوەی ئیعتزاز بە دینێکەوە بکات عەلمانی نەبێت. کەواتە پـارتی لیبڕاڵـی ئوسـتڕالیا، کـە پـارتێکی عەلمانیـەو یـەکێك لـە جیاوازیـەکانی لـە گـەڵ پـارتی کرێکـاران ئەوەیـە، کـە ئـایینی مەسیحی و بەهاکانی بەرز دەنرخێنێ و ڕۆڵیشی لە ژیانی تـاك و خێزانـدا بـە گـرنگ تەماشـا دەکـات، پـارتێکی عـەلمانی نیـە! تـا ئێسـتاش سـەرەك وەزیرانـەکانی ئوسـتڕالیا بـە ئینجیـل سـوێند دەدرێن، بەڵام کاتێك جولیا گیلارد (سەرەك وەزیرانی ئێستا) ئەم سوێندەی بە ئینجیل نەخوارد هەڵلایەکی نایەوە لە لایـەن پـارتی لیبڕاڵ. بە پێی قسەکانی میسری بێ، ئەم پارت و دەسـەڵاتانەی ئوستڕالیاو و زور وڵاتانی دیکەی دونیا، عەلمانی نین[١٧٨]!

١٧٨ ـ عەلمانیـەت و ئیسـلام لای فوئـاد مەجیـد میسـری و هاوشـێوەکانی عـەلی سیرینی

**ئومێد قەرەداغی:**

یەکێك لەوکەسانەی وەك ئیسلامناس خۆی دەردەخات لە دیدگایەکی عەلانیەوە قسە دەکات ئومێد قەرەداغیە، هەمیشە سەرقاڵی نوسینە نوسینەکانیشی دوورن لە بابەتی بونەوە جارێك باس لە نوێگەری دەکات جارێکی دەبێت بە پارێزەری تیۆرەکەی داروین، قەرەداغی خاوەنی نوسینی زۆر لەسەر ئیسلام وئیسلامیەکان، ئەوەی من سەی لەسەر دەکەم ئەم نوسینانەیەتی کە زیاتر لەسەر ئیسلام دەیانوسێت، بەم دوایە کتێبێکی بلاوکردەووە بە ناوی (کێشەکانی هزری ئاینی) دوای خوێندەوەی کتێبەکەی دەرکەوت کە هەڵس وکەوتی وەك نوسەرانی تر بوو لەگەڵ ئیسلام، ئەویش بەگەرانەوە هیچ سەرچاوەیەکی توراسی ئیسلامی نەخوێندۆتەوە، تەنها سەرچاوەکانی نوسەرانی علمانی عەرەب نەبێت، کە لەبارەی ئیسلام وئیسلامیەکان نوسیویانە، کە ئێمە لێرە چەند لایەنێکی کتێبەکەی دەخەینە روو بۆ خوێنەر.

**کتێبەکەی قەرەداغی لە سێ بەش پێك هاتووە:**

بەشی یەکەم: کێشەی تیۆری لە فکری ئاینی، کە باس دەکات لە پرسی موقەدەس و واتاو حەقیقەت، هەڵسوکەوتی فکری دینی لەگەڵ(مێژو، توراس، گوتار).

لەبەشی دووەمی کتێبەکەی نوسەر باس لە کوردو قەیرانی فکری ئاینی دەکات، کە لەم باشەیان باس لە کوردو جەلدیەتی ئاین ورێنیساس دەکات، باس لە فتواو دیموکراسی دەکات، باس لە ئایدۆلۆجیاو وەهم دەکات، دواتر باس لە ئیسلام ورۆژئاوا دەکات.

نوسەر لە پێشەکی کتێبەکەی شتێکی سەیر دەنوسێت، دەڵێت: هۆکاری نەچەسپاندی دیموکراسی دەگەڕێتەوە بۆ فکری ئاینی قەیرانەکانی ئەم فکرە[179]، بەگوێرەی تێروانینی کاك ئومێدو هاوشێوەکانی پێویستە یاسا دووربێت لە ئاین، یارە ئەمە هەر بۆچونی کاك ئومێد نیە، بەڵکو هەریەك لە مەریوان وریا قانع ومەلا بەختیاو، بەختیاریش ئەم رایەیان هەیە، بەلأم بابزانین

179ـ کێشەکانی هزری ئاینی ئومێد قەرەداغی2012.

ئایـە تاچـەند راسـتە دیموکراسـی ئەگـەر ئـاینی لەگـەڵ بێـت ناچەسـپێت، لـەکاتی چەسـپاندن دەردەکـەوێت کـە عەلمانیـەت دیموکراسـی بـە زیـانی خـۆی دەبینێـت. وەکـو واقعـیش بینیمـان چۆن ئەو کاتەی عەلمانییەکان ترسیان لـە ئەنجامـەکانی دەنگـدان نـەبوو باسـی دیموکراسـیو دەنگـی گـەلو ژمـارەی دەنـگو سندووقەکانی دەنگدان دەکرد، بەڵام کاتێك گـەل هەڵبـژاردنێکی ئـاینیی خواسـت وەك دەنگـدان بـۆ حزبێکـی ئـاینی یـان بـۆ شەریعەت بیانووی ئەوەیان دەهێنایەوە کە ژمارەی دەنـگ مـەرج نییە چونکە گەل وشیار نییە.

**کێشەی ئافرەت:**

وەك وتم دیموکراسـی بەشـداریکردنی خەڵکـە لـە کـاری سیاسی بەڵام سەبارەت بە توێژی ئافرەتان دەبینین لە رۆژئاوا کە دەمێکە رێگـەی عەلمانیـەتی گرتـۆتـە بـەر ئـەو بەشدارییە هێشتا زۆر لاوازە. لـە رۆژئـاوا بـەرزترین بەشـداریی ئـافرەت لـە پەرلەمانەکان لە سویدە کە هێشتا ناگاتـە نیـوە. رێژەکـەش لـەپڕ کەمدەبێتـەوەو بـەرزترینیان سـێ یەکـە. ئـەوەی جێگـەی سـەرنجە

کە فەڕەنسا کە سەرچاوەیەکی فەلسەفەی ڕۆشنگەری‌و بیری ئازادەو عەلمانیەتێکی پەرگیر حوکمی دەکات ڕێژەکە زۆر کەمترە، بۆ نموونە لە کتێبێکی فەڕەنسی کە باسی بەشداریی ئافرەت دەکات کە چەند لاوازەو هی سەرەتای ئەم سەدەیە باسی ئەوە کراوە کە ڕێژەی ئافرەتان لە پەرلەمان نزیکەی پانزە لە سەدە لەکاتێك وڵاتێکی وەك هیندستان کە زیاتر لە نیوەی ئافرەتانی نەخوێندەوارن‌و ئافرەت بە چاوێکی کەم تەماشا دەکرێت ڕێژەکە نزیکەی نۆ لە سەدە، واتا جیاوازیی نێوان فەڕەنساو هیندستان تەنها دوو لە سەدە. نووسەرەکە دەڵێت کە لە هیندستان ئەندیرا غاندی چوار جار لەسەر یەك بووە سەرۆك وەزیران‌و لەوە زیاتر کەسایەتییەکی بەهێز بوو بەڵام بەدرێژایی تەمەنی فەڕەنسا تەنها یەك جار ئافرەتێك بووە سەرۆك وەزیران ئەویش بۆ ماوەی چەند مانگێك ئەویش لە حکومەتێکی بۆر (بەمەرجێك نیزامی هیندستان پەرلەمانییە واتە دەسەڵاتی گەورە هی سەرۆك وەزیرانە بەڵام نیزامی فەڕەنسا سەرۆکایەتیی‌و

دەسەڵاتی گەورە هی سەرۆکە نەك سەرۆك وەزیرانە). کاتێکیش فرانسوا میتیران بڕیاری دا ئەگەر بووە سەرۆك کۆتا (بەش) بۆ ئافرەتان دابنێت کە یاسا دەربچێت ٣٠ لە سەدی پاڵێوراوان (تێبینی بکەن ڕێژەکە بۆ پاڵێوراوانە واتە بۆی هەیە دەنگ بەو ئافرەتانە نەدرێت) ئافرەت بن، واتە ئافرەتانی هەر لیستێکی هەڵبژاردن پێویستە لەو ڕێژەیە کەمتر نەبن، پاشان کە یاسایەك بەم شێوەیە دەرچوو دادگای باڵای فەرەنسی ڕەتی کردەوە چونکە جیاکارییە لەنێوان ڕەگەزەکان، دواتریش یاسای تر دەرچوو بەڵام بۆ هەڵبژاردنەکانی شارەوانیو پەرلەمانی ئەورووپی.

سەرچاوەیەکی کۆنتریش باسی ئەوەی کردووە بۆچی بەخشینی ماف دەنگدان بە ئافرەتان زۆر دواکەوت (ساڵی ١٩٤٦) ئەویش لەبەر ئەوەی ئافرەتان بەگشتی لە پیاوان زیاتر مەیلی ئاینییان هەیە بۆیە عەلمانییەکان ترسان بەخشینی ئەو مافە بە ئافرەتان ترسی ئەوەی هەیە بە دەنگی ئافرەتان کەسانی نزیك لە

کەنیسە دەسەڵاتیان دەستبکەوێت. ئەمەش وامان لێدەکات وای بۆ بچین کە دانانی کۆتا (بەش) تەنها بۆ شارەوانیو پەرلەمانی ئەورووپی بۆ دوورخستنەوەی ئافرەت بوو لە پەرلەمانی فەڕەنسا کە یاسا بۆ وڵاتەکە دادەنێت.

بەم جۆرەش عەلمانییەت دژ بە دیموکراسی بوو و لەگەڵ دوورخستنەوە بوو.

لەکۆتاییش پێویستە بزانین کە عەلمانییەکان کاتێك دەڵێن دیموکراسی بێ عەلمانیەت ناکرێت ئەوە قسەیەکە بۆ جوانکردنی عەلمانیەت، هەروەها داماڵینی سیفەتی عەلمانی لە نیزامە دیکتاتۆرییەکان هەوڵێکە بۆ جوانکردنی عەلمانییەت، واتە کاتێك دەڵێن نیزامە عەلمانییە دیکتاتۆرییەکان (دەوڵەتە کۆمۆنیستەکانی ئەوسای ئەورووپای ڕۆژهەڵات، حزبی بەعس، تورکیای ئەتاتورك، توونسی بورقێبەو بن عەلی..) عەلمانی نەبوون هەوڵێکە بۆ پاککردنی ناوی عەلمانییەت لەو نموونانە کە بێگومان عەلمانی بوون چونکە لەسەر بنەمای عەلمانیەت

وەســتابوون ئــەویش دوورخســتنەوەی ئــاین لــە سیاســەتو پەروەردە. عەلمانییەکانیش بە دووبارەکردنەوەی قسەکەیان کە دیموکراســی بــێ عەلمانیــەت نابێــت دەیانــەوێت قســەکە بکەنــە ڕاســتی، ئــەرکی ئێمــەش ئەوەیــە هەرچییەك وتــرا وەکــو خــۆی وەرینەگرین بەڵکو شیی بکەینەوەو بزانین چەند ڕاستەو چەندی وا نییە[180].

کاتێك خوێنەر سەیری کتێبەکەی کاك ئومێد کات، دەبینێت ئەم سەرچاوانەی کە پشتی پێ بەستاون سەرچاوەی توراسی ئیسلامی نین[181]، لەوەش سەیرتر نوسەر شتێك دەنوسێت پاشان ئاماژە بەسەرچاوەیەکی تر دەکات لە پەراوێزەکەی، نوسەر باس لە ناکۆکی نێوان عروبەو عەقلانیەت دەکات لای د.محمد عەمارە، لە پەراوێز کتێبی محمد عابدالجابری دەنوسێت[182].

---

۱۸۰ـ عەلمانیەت ودیموکراسی یەککگرتنیان وناکۆکیان فازڵ قەرەداغی پێگەی زاگرۆس.

۱۸۱ـ کێشەکانی هزی ئاینی ۷۰.

۱۸۲ـ سەرچاوەی پێشو ۲۳۱، وهامش ۷۳د. محمد عابد الجابري بنية العقل العربي.

لە شوێنێکی تر باس لەکتێبی الإسلام بین التنویروالتزویر محمد عمارە دەکات، کە بەلای کاک ئومید محمد عەمارە دیفاعی لە مشیر عەفلەق کردووە، بەڵام کاتێك سەیری کتێبەکەی محمد عەمارە دەکەیت تەنها چەند گوتەیەکی مشیر عەفلەقی نەقڵ کردوە بە ئەوەی هیچ قسەیەکی لەسەر بکات[١٨٣] .

یەکێکی تر لەو بابەتانەی کە قەرەداغی قسەی لەسەرکردووە بابەتی مقاصد الشریعەیە، کە بابەتێکی گرنگە بەشێك لە زانستی أصول الفقە، کاتێك کاك ئومێد قسە لەم باسە دەکات رەخنەکانی محمد عابد الجابری نەقڵ دەکات لە زانایانی أصول الفقە، کە زیاتر گرنگیان بە باسە زمانەوانیەکان و بابەتە نەحویەکان داوە، خۆیان لە بابەتی مقاصد بێ دەنگ کردووە، بۆیە ئەمەی کردووە بە قەیران لەو بارەیە دەڵێت: ئەگەر سەیری لێکۆڵینەوەکان بکەیت، لێکۆڵینەوەی فقهی بن یاخود زمانەوانەی، زیاتر ئاماژەیان کردووە بە وتاو وشە، وەك دوو

---

١٨٣ــ بڕوانە: د.محمد عمارة الإسلام بین التنویر والتزویر. دارالشروق ط١ ١٩٩٥. ص ١٠١.

لایــەنی جیــاواز، یــاخود بــەلای کەمـــەوە وەك دوو بابــەت کــە پەیوەستن بەیەکەوە نیسبەتێکیان لە نێوان هەیە.

بەهـەمان شێوە محمد عابد الجابری هـاتوە باسـی زانسـتی اصول الفقه کردووە لـە ئیمـام شـافعیەوە تـا ئیمـام غـەزالی زیـاتر گرنگیـان بـە بابـەتی زمانـەوانی داوە، ئەمـەش وای لێکـردوو لـە مقاصدالشریعە دوور بکەنەوە.

کەچی کاك ئومێد هـەمان شتی دوو بارەکردۆتـەوە بـە بێ ئامـاژە دان بە کتێبەکەی محمد عابدالجاری.

ئەمە لایەك لەلایـەکی تـر وێنـەی راستەقینەی ئیمـامی ئـەبو ئیسـحاقی کـوری موسـای شـابتی(ت ٧٩٠هــ) هەمیشـە کەسـانی لادەر دەیانــەوێت ئیمــامی شــاتبی بکەنــە رەمــزی تەئویلاتــەکانیان بـۆ قســەکردن لەســەر دەقــە شــەرعیەکان، کتــێبی(موافقــات)ی شــاتبی یــان کــردووە بــە قــەڵغانی بۆچــونەکانیان بــە نــاوی بەرژەوەنــدی خواســتن ودەســتگرتن بــە بنــەماکانی شــەریعەت، بەمــەش بــەلای عەلمانیەکانــەوە شاتبی توانی داهێنـانێکی مەعرفی بکـات و اصول الفقه لـە تیۆرەکـانی

ئیمام شافعی و زانایانی دوای ئەو دابڕێت[184].

هەرکەسێك کتێبەکەی کاك ئومێد قەرەداغی بکەخوێنەوە قسەکانی جابری دەبینێت، بەڵام کاك ئومێد ئاماژەیی بە قسەکانی جابری نەداوە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرجەم قسەکانی قەرەداغی لەبارەی مقاصد الشریعه قسەی[185].

ئومێد شتێکی تر ئەنجام داوە کە مایەی پێکەنینە، ئەویش باس لە میشل عەفلەق دەکات، کە محمد عەمارە مەدحی دەکات کەچی ئاماژە بەکێبی الرسالەی ئیمام شافعی دەکات، نازانم پەیوەندی ئیمام شافعی بە ستایشی محمد عەمارە بۆ مشیل ئەفلەق چیە، بەڵام لەوە دەچێت ئومێد تەنها ناوی ریسالەی ئیمام شافعی بیستووە.

کاك ئومێد لەم کتێبەی ناوی لیستێك سەرچاوەی نوسیوە، جگە لە لەمانە کۆی القرآن الکریم والرسالە، والتنویر والتزویر، کۆی سەرچاوەکانی سەرچاوەی عەلمانیەکانن.

---

١٨٤ـ معركة النص. مجلة البيان صالح العجلان سنة ٢٠١٢

١٨٥ـ بنيه العقل العربي مركزالدراسات الوحدة العربية ص

د.نصرحامد أبوزيد:

١ـ الإتجاه العقلي في التفسيردراسة في قضية المجاز في القرآن عند المعتزلة.

٢ـ إشكاليات القراءة واليات التأويل

٣ـ فلسفة التأويل.

محمد عابدالجابري.

١ـ الخطاب العربي المعاصر دراسة تحليلية نقدية

٢ـ تكوين العقل العربي

محمد اركون:

١ـ الفكر الإسلامي قراة علمية.

٢ـ الخطاب والأنسنة في الفكر العربي.

٣ـ الإسلام. أوروبا. الغرب

٤ـ الفكر الإسلامي نقد وإجتهاد.

٥ـ الإستشراق بين دعاته ومعارضه.

د. حسن حنفي

١- مقدمة في علم الإستغراب

علي حرب

١- الممنوع والممتنع نقد الذات المفكرة.

٢- النص والحقيقة نقد الحقيقة.

٣- التأويل والحقيقة قراءات تأريخية في الثقافة العربية.

شەرچاوەکانی تری بریتین لە کتێبەکانی: محمد شحرور، وسيد محمد القمني، وعبدالله العروي، وجورج الطرابيشي، وعبد المجيد الشرفي، وساطع الحصري.

ڕەفیق سابیر:

ڕەفیق سابیر یەکێکە لەو نوسەرە عەلمانیانەی لەسەر ئیسلام ومسوڵمانان نوسیوە، ئەمە جگە لەوەی چەند بابەتێکی لەو بارەیەوە نوسیوە، لە میانەی کتێبەکانی چۆنیەتی هەڵس وکەوتی بەگەڵ ئیسلام ومێژوەکەی دەردەکەوێت.

ڕەفیق سابیر وەك نوسەرانی تری عەلمانی لە نوسینەکانی لە بارەیی ئیسلام پشت بە سەرچاوەی نوسەرانی عەلمانیەتی عەرەبی دەبەستن، پاشان قسە لەسەر بابەتێکی گرنگی وەك مێژوی ئیسلامی و فەلسفەی ئیسلامی دەکات.

ڕەفیق سابیر کتێبەکەی ناوناوە ئیمپراتۆریای لم باسی لەم کتێبەی بە دیدێکی ڕۆژهەڵاتناسیانەوە نوسیوە.

لە ڕاستی ئەمەی ئەو نوسیویەتی ئیمپراتۆریای شێواندنە نەك ئیمپراتۆریایەکی.

ئیمراتۆریای لم وەرگیراوە لەهەندێك لەو نوسینانەی محمد عابدالجابری [186].

---

١٨٦ـ مجلة راية الإسلام السنة١٣، عدد ١ذوالحجة ١٤١٩ـ ئازار١٩٩٩.إمبراطورية الرمال ام إمبراطورالتضليل ردعلى مغالطات رفيق صابرمحمد يوسف ص١٩ .

ڕەفیق سابر پێشتر وەك کەسێکی شاعیر شتی دەنوسی لەپر دەستی دا بابەتێکی گرنگی وەك مێژو لەوەش مەترسیدار دەستی دا نوسین لەسەر فەلسەفەی مێژوی ئیسلامی، دوای ئەوەی کە کتێبەکەیم خوێندنەوە تێبینی ئەوەم کرد کە بە ڕۆحی کتێبی (العقل السياسي العربي) محمد عابدالجاری نوسراوە، دوای دەستکاریکردنی گوتە ئیجابیەکانی جابری لەم کتێبە[187].

ئەوەی تێبینی کراوە، کە ڕەفیق صابر لەسەرەتای نوسینەکەی هیچ ڕەپتێك نیە لە نێوانن لەگەڵ ئەوەشدا خۆی ئاماژەی بەوە کردووە، کە ئەم کتێبە باس لە فەلسفەی ئیسلام وەحی ناکات، بەڵکو باس لە لایەنی ئەنسرۆپۆلۆجی ئیسلام دەکات، بەتاییەت لایەنی کۆمەڵایەتی و ڕۆشەنبیری وپێکهاتەی دەوڵەت، لەگەڵ ئەوەی بریاریدا بوو قسە لەسەر ئەم پرسە نەکات، بەڵام هیچ تیرێکی لە تیردانەکەی نەهێشتۆتەوە سەرجەمیانی ئاراستەی وەحی وبیروباوەری ئیسلامی کردووە،

---

١٨٧. سەرچاوەی پێشوو.

بەتایبەتیش قورئانی پیرۆز، کە چەندین جار بە ئەفسانە ناوی بردووە.

بانگەشـــــەکردنی ڕەفیـــــق ســـــابیر بۆئەفســـــانیەتی دووبارەکردنـەوەی ئـەم قیسـانەیە کـە ڕۆژهـەڵاتناس و لێکۆڵـەرە عـەلمانی ومارکسـیەکان دووبارەیـان دەکـردەوە، کـە تـەنها شـتی ناشیرن لە ڕووداوەکانی مێـژوو دووبـارە دەکەنـەوە، کـە زۆربـەیان لە لێکۆڵینەوەی زانستی دەرناچن، بەڵکو تەنها شتێکە لـە کتێبی ئیسلامی نوسراوەتەوە گوێ نەدراوە بەوەی کە تاچەند ڕاستە، بـەڵکو چـەپاندنی زانسـتی ئـەو حکومەیـە، کـە خـبری ڕاسـت لـە ناڕاست جیا دەکاتەوە، هەروەك لە کتێبەکانی مێژوو، کە ئەویش بەڵگەیە لەسەر ئاسۆفراوانی پیـاوانی سـەرەتایی شارەسـتانیەتی ئیسـلامی، کـە ئێسـتاش شـازانی پێـوە دەکـەین، ئەگـەر شارسـتانیەتی شـیوعی سـەیر بکـەی، دەبـینی ئـەو ئەدەبیاتـەی نوســـراوە لەســـەرجەم زانســـتە مرۆڤایەتیـــەکان دەبینیـــت لەبەرژەوەندی چینی حکومران نوسـراوە(نیوکلامنتـورا) تەنانـەت

نوسینی گەورە نوسەرانی ڕۆژئاوا لەبوارەکانی ئەدەب وزاستی سیاسـی لەبەرژەوەنـدی بۆرجۆواەکانـە، لـە ڕۆژگـاری خـۆی خروشـۆف گـوتی: ئەگـەر مـەیمونێك لەسـەر ئـامێری نوسـین دابنێیت، لە توانای هەیە ئەوە بنوسێت، کە ئەندریە مالرو ئیوت وسارتەر ونەسەرانی تر دەنوسن دەینوسن.

ئەمە جگە لەوە ڕەفیق سابیر بانگەشەی گروقە لادەرەکان دووبارە دەکاتەوە لەبارەیی قورئانی پیرۆزە، کە ئەمەش ڕاست نیـە، کـە ئەمـەش ڕاسـت نیـە، چـونکە کاتێـك قسـە لەسـەر فرەقەئیسلامیەکان دەکەین هەر فرقەیەك بێت، دەبێت بەگوێرەی لێکۆڵینـەوەی زاسـتی بێـت، دەبێـت بنـەماکانی لەسـەر قورئـان وسـوننە سەرچـاوەی گرتبێـت، ئـەوەی زۆربـەی مسـوڵمانان لەسەری هاوران.

ڕەفیق سابیر شێوازی تەدلیسی ویارکردنی بەکار هێنـاوە، کـە ڕێـرەوی شـیوعیەکان، کـاتێ بانگەشـەی ئـەوە دەکـات، کـە هۆکـاری جیـاوازی مسـوڵمانان ئـەوە بـووە، وەك مێژونوسـانی

ئیسلام لەو سەردەم قسەیان لەسەر کردووە، کە پەیوەست بووە بە بابەتی چەپاندن ویاری کردن بەهەندیٚ ئایەتی قورئانی پیرۆز لاپەرە٢.

- نوسەر هەمان شێواز بەکار دەهێنێت، بەشێوەیەکی گشتگیر، کاتێك دەڵێت: لەمەش زیاتر بەگوێرەیی مێژوونوسانی ئیسلام لەم سەردەمە، قورئانی ئەسڵی سیٚ قەبارەی قورئانی دەوڵەتی هەبوو، پاشان فەرمانڕەواکانی دەوڵەت هەڵسان بەگۆڕینی قورئان بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان، ڕقەکەی وای لێکردووە بەرامبەر قورئان تا بگاتە ئەوەی کە کەسێکی وەك حەجاج بکات بەهاوبەش لە پرسی ڕاستی وناڕاستی قورئان، بۆ ئەمەش دەڵێت: بەگورێرەی سەرچاوە ئیسلامیەکان حەجاج هەڵساوە بە دەستکاریکردنی گەورە لەدەقەکان دوای ئەوەی کراوە بە وەکیل بۆ کاروباری قورئانی دەوڵەت٢٢.

ئاشکرایە فەرمانی کۆکردنەوەی قورئان لەزەمەنی خەلیفە ئەبوبەکری سدیق بوو، سەرجەم سورەتەکان کۆکرایەوە بە

کۆدەنگی هاوەڵان، ئەمەش بابۆ ڕیوایەتەکەی ئیمام بخاری جێ بهێڵین کە بۆمانی باس دەکات[188].

ڕەفیق سابیر وەك وشەبەوشەی کتێبەکەی لە نوسەرانی ناسراو وەرگرتووە، لەگەڵ دارنینی بابەتی بوون لێیان، ئەگەر ئێمە پرسی غەنیمە وەربگرین لە بابەتەکەی ڕەفیق سابیر پاشان بەراوردی بکەین بەکتێبی (العقل السیاسي العربي ـ محدداته وتجلیاته) د.محمد عابدالجابری هەمان نوسینە، بەڵام لەکاتێکدا ڕەفیق سابر هاتوە گشتگیری کردووە، کردویەتی بە تەنها پاڵنەری سەرەتاو کۆتا لەهەموو مێژووی ئیسلامی، لەپێناو دەرچون لەو نەزعە مارکسیە تەقلیدیەی کە ئابوری کردبوو بە تەنها پێوەر بۆ تەفسیرکردنی مێژوو، کە جابری بە مارکسی قۆناغی ستالینی ناوی دەبات، دوای ئەوەی بو بە خاڵێکی ڕەش لەمێژووی لەلایەکی ترەوە تائێستاش شوعیەکانی کورد بەهەمو شێوەیەکی تیۆری وپراکتیکی لە واقعی ئەدەبی وسیاسی

---

188 ـ بروانە: رقم الحدیث ١٥٦٩ مختصر صحیح البخاري دارالسلام.

دووبارەی دەکەنەوە، لەم ڕووانگە مەزهەبیە تەقلیدیە ستالینیە مارکسیە، بەلای ڕەفیق سابیرەوە مێژوو شارستانیەتی ئیسلامی جگە لە خوێنرشتن شتێکی تری تێدانیە، جەیشی ئیسلامی جەیشێکی خێڵەکی بوو، عەقڵەیەتی دەشتەکی وهۆزگەرایەی بەسەری دا زاڵ بوو، تاکە پاڵنەرێك بۆ جەنگەکان غەنیمە بوو، ڕەفیق سابر دەڵێت: دەشتەکیەکان لەسەر خوێن پەروەدەو گەورەببون بە درێژایی مێژوو زۆربەی ژیانیان لەجەنگ بەسەربردبوو، تا ببون بەهێزێکی کاریگەری لەجەیشی عەرەبی، ڕویان لەهەر شوێنێك کردبێت داب ونەریتی بەدەویانەیان لەگەڵ خۆیان بردووە، بەناوی جیهادەوە هێرشیان کردۆتەسەر وڵاتانی تر، ئینجا دەڵێت: هۆز، غەنیمە عەقیدە، ئەو سێ کلیلەن دەتوانین بەهۆی ئەوانەوە مێژووی سیاسی عەرەبی بخوێنینەوە، کەواتە ئەوانە عەقڵی باتنی ئەو مێژووەن، کەواتە کاتێك قسەمان لەو تەرتیبەی باسمان کرد، ئەمە مانای ئەوە نیە، کە لەگرنگیش بەهەمان شێوەبن، چونکە گرنگیەکە لەکاتێك بۆ کاتێك دەگۆڕێت،

لەســەردەمێك بــۆ ســەردەمێك دەگۆڕێــت، بــەکورتی عەقڵیــەتی سیاســی عــەرەبی لەســەردەمی جــاهیلی بنــەمای ســەرەکی هــۆزو غەنیمــە بــوو، لەســەردەمی پێغەمبەرایــەتی بــوو، پێگومــان سەردەمی خەلیفەی راشدین درێژکراوەی شەفافیەتی سەردەمی پێغەمبەرایەتی وبەهاکانی، کەچی جابری جەخت لەسەر هەمان شت دەکاتەوە.

لە کاتی قسەکردنی رەفیق سابیر لەسەر کۆمەڵگای عەرەبی لەپێش ئیسلام وباش ئیسلام دانیشتوانی جزیرەی هەرەبی لە تێروانی ئەو سەرجەمیان دەشتەکی بوون، جگە لە تالان و کوشتن رێگری کاری تریان نەبوو، نەخاوەنی شارستانی وتیجارەت بوو، ئەمەی ئێمە باسی دەکەیت پارێزگاری کردن نیە لە عەرەب، بەڵکو پارێزگاریکردنە لە مێژووی ئیسلامی، چونکە تێکەڵەیەکی بەهێز هەیە لە سەرەتای مێژووی ئیسلامی لەگەڵ عەرەب لە قۆناغی یەکەم، پێویستە ئەم تێروانینە هەڵەیە راست بکەینەوە، کە بەهەستێکی ئایدۆلۆژی نێگەتیڤ نوسراوە، نەك

ڕەگەزپەرستی قەومی، چونکە ڕەفیق سابر قسەو حکومەکانی لە هەستێکی ئایدۆلۆژیە نەك قەومی، ئەگەرچی هەندێك جار دەیەوێت وای دەربخات، لەگەڵ ئەوەشدا جەزیرەی عەرەبی تەنها شوێنی دەشتەکیان نەبووە، بەڵکو شوێنی خەڵکی تریش بووە، هەروەها ناوەندێکی گرنگ بووە بۆ بازرگانی بەهۆی ئەوەی کەوتبوە نێوا وڵات وئیمپراتۆریەکانی ئەو ڕۆژگار، لە باشور چەند شارستانیەتێکی لێبوو، کەهێڵی سەرەکی بازرگانی بوو، ئاشکرایە ڕەفیف سابیر کێبەکەی بەدیدێکی ڕۆژهەلاتناسە نوسیوە، لەسەرەتاو تاکۆتایی لەگەڵ ڕقی خۆی تێکەڵی کردووە، هەمان تێروانینی مارکس وئەنگلزی دووبارەکردۆتەوە لەبەرامبەر ڕۆژهەلات وئیسلام، خۆی پێی زانبێت یاخود نەیزانی بێت.[١٨٩]

---

١٨٩ـ بروانە: غەمە جڤاتیەکان فاروق ڕەفیق، ب١ بابەتی خۆرئاواو ئەوەکانی تر.

# ناوەڕۆك

## ئەم پەرتوكە لە نوسینی ئەم بەرێزانە پێك هاتووە:

- عەلمانیەتی ڕۆژهەڵات و حیزبی کوردی
  پ.ی. سەلام ناوخۆش
- ئەزمونی عەلمانیەت لە کوردستان م . فاتیح سەنگاوی
- عەلمانیەت ئەوەی من لێی تێگەیشتووم
  م.کامەران بابا ن زادە
- نەوەی یەکەمی عەلمانی کورد . م.مسعود عبدالخالق
- چۆنیەتی خوێندنەوەی خوێنەرێکی سیکۆلار بۆ دەقی ئایینی
  م.عبدالله نصرالله
- بۆشاییەکانی نێوان عەلمانیەت و کۆمەڵگای کوردەواریی
  د. عومەر عەلی
- جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت جیاکردنەوەی بەهایە لە مرۆڤ
  م.زانا طاهیر
- عەلمانیەت چەمک و سەرهەڵدان و گەشەسەندنی و هاتنی بۆ ڕۆژهەڵات
  م. نهاد جلال حبیب الله
- عەلمانیەت بۆ چونو هەڵوێستی بەرامبەر بە ئیسلامو موسوڵمانان
  م. محمد ملا محمود
- نووسەرانی عەلمانی چی دەخوێننەوە ؟
  م. إسماعیل طەها